


📖 ناوی کتێب: سەربردەی جوامێرێکی نەترس ﴿حەمەی پاژنە بڕاو﴾.

📖 نوسینی: طاهر طیب جاف

📖 تیراژ: ١٠٠٠ دانە

📖 ژمارەی سپاردن: لەبەڕێوەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی ( ٧٠٦ )ی ساڵی ( ٢٠٢٢ز )ی پێدراوە.

📖 کۆمپیوتەرو دیزاین: ( سامان محمد أمین )

# ناوەڕۆك


| | |
|---|---|
| خاپەرۆك .................... | ٤ |
| میری ئامۆزام و پێشوازی لێکردنەکەی .................... | ١١ |
| برایم ئاغەی مەنتك .................... | ٢٦ |
| ئێزرای تەبیب .................... | ٥٢ |
| شوان و فەقێیان .................... | ٨١ |
| سەگەکانی ماڵی ئاغەی .................... | ٩٩ |
| هیشکە دەودەوانێ .................... | ١١٢ |
| هەرگیز متمانە بە فەقێیان مەکە .................... | ١٢٣ |
| دیمانەیێکی پێشبین نەکراو .................... | ١٤٧ |
| میری تیرەی تیلەکۆی ئێلی جافان .................... | ١٥٣ |
| گەڕان بەدوای ماڵ و ژن .................... | ١٦١ |
| بەس چاوەڕێیە .................... | ١٨٠ |
| فەرمانی شار وەدەری و دەستگیرانی .................... | ١٨٦ |
| دیداری میری .................... | ١٩٩ |
| بنەگەی شەیتانی .................... | ٢٠٧ |
| ئەو دەنگەی لە ڕێیەندەکان دەربازبوو .................... | ٢٢٢ |
| فتنەی کارەکەر .................... | ٢٣٦ |
| خواردنێکی تایبەت .................... | ٢٤٦ |
| قسە و ئەوپەڕ ئاوات .................... | ٢٥٤ |
| ناسنامەی نووسەر .................... | ٢٦٨ |

## خاپەرۆك

ڕاستە باوكم بۆ هەموو منداڵەكانی خۆیو برازایەكانی، ئەو سەربردەیەی باپیری دەگێڕاوە، تا بنچینەی خۆمان بناسینو نەبینە كاسانێكی بابردەڵەی گردەنشینو دەیفەرموو: (پێویستە مرۆڤ بنچینەی ڕێچكۆڵەی خۆی بناسێتو ڕێز لەخزمو كەسانی خۆیو نەژاد زادەكانی بگرێتو خۆشیانی بوێتو بیانپارێزێتو نەهێڵێت ناویان لەكەدار بكات)، بەڵام لەبارانبەری ئەمەشدا، زۆر ڕژد بوو و نەیدەویست، كەسێكمان، ئەم سەربردەیە، بۆ كەسانی بیانی، بگێڕێتەوە، چجا بینووسێتەوە؛ ئەویش چەندین هۆی ژیرانەو جوانی لەدانانی ئەو بەربەستانەدا هەبوو، كە دابنابوون؛ لەهەمووشیان ژیرانەتر ئەوەبوو كە نەیدەویست ئەو ژیانە ئاسوودەو ئەو شێنەییو ڕێزەی خۆیانو براو برازاو كوڕەكەی هەیانبوو، لێیان بتۆرێو نەیار بۆ خۆیو بۆ منداڵەكانی پەیدابكات.

بەڵام دەشێ، وەك هەموو كەسێك لەم جیهانەدا، منیش داوای لێبووردن لەباوكم بكەمو لەدوای ئەویش سەری ڕێزو نەوازشم بۆ ئەو بنەماڵە سەروەرەی جافان دانەوێنم كەچەندین سەدەی ساڵ بەر

لەئـەمڕۆ، لەبـەر خـراپ تەقـدیرکردن‌و لێکدانـەوەی پەیوەنـدی نـاو بنەماڵەکـەو بـۆ پاراسـتنی موڵـك‌و سـامان‌و دەسـەڵاتی کەسـێك، جوامێرێکیان لەدەست داوە.

ئـەم سـەربردەیەش بـۆ ئـەوە ناگێڕمـەوە تـا سینگی خـۆمی پـێ دەربێنم‌و فیزی پـێ لێبـدەم، بـەڵکوو نیـازم ئەوەیـە، بابـەتێکی مێـژووی کوردەواری بنووسمـەوەو نـەهێڵم لەنـەوەکانی ئاینـدەی کوردسـتان بـزر بێت‌و بفەوتێت. بەڵکوو بۆ ئەوەمە کە بیخوێننەوەو وەك پەنـدێك لێـی فێر بن‌و ژیانیان لەپێناوی چاوچنۆکی کەسێك نەشێوێنن.

بۆ ئەوەش داوای لێبوردن لە باوکم دەکەم چونکە لێـرە بەقسـەیم نەکردووەو ئەم سەربردەیەم پێشـتر بـەزمانی ئینگلیسـی نووسـیوەتەوەو چـاپ‌و بـڵاوم کردووەتـەوەو ئێسـتاش وا بەشـەکرە زمـانی کـوردی، نووسـیومەتەوەو دەینێرمـە بەردەسـتی خوێنـەری کوردی کـورد زمـان، کاشکاوەك پەندێك لێی فێـر دەبن‌و دەبێتـە هـۆی ئـەوەی چیـتر خـوێنی کوردان بەدەستی کوردان نەڕژێت.

ئومێدیشمە هـەم بـۆ خانـەوادەی حەمـەی پاژنـە بـڕاوو هـەم بـۆ نەوەکانی محمـد پاشـای جـاف ببێتـە شـانازی‌و سەرچـاوەیێکی بـەهاداری مێژووی ئەم خێڵە پڕ جوامێرەو بەسـەربڵندی‌و ژیرانـە نیشانی هـەموو گەلی کوردی بدات.

## چۆن بوو وا بەخەیاڵمدا هات تا ئەم سەربردەیەی باپیرەگەورەمان بنووسمەوە؟

من فرە کەڕەت لە باوکمو کەمتریش لەمامم گوێم لێدەبوو، بەداخێکی، زۆرەوە ئەم سەربردەیەیان دەگێڕاوەو خۆزگەیان دەخواست بەم شێوەیە نەبوایەو ژنو ژنداریەکە سەری بگرتایەو خزمایەتییەکە فرە خاستر بوایەو مامو برازا لەیەکتر نەترازابان. بەڵام موقەدەروابووەو ئیتر کەس ناتوانێ خۆی لەتەقدیری خودا بدزێتەوە؛ ﴿وَإِذَا قَضَى أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ – البقرة/١١٧﴾ واتە: ئەگەر فەرمانێکی ویست ڕووبدات، ئەوەتا پێژێت ببە و دەبێت. خۆشم وەك باوکمو مامم نامەوێت ئەم سەربردەیە لە ڕێچکۆڵەیێکی خراپەوە، سەرهەڵداتەوە، بەڵکوو ئومێدی نوێبوونەوەی خزمایەتییەتی لەجاران باشتری لێ دەکەم. بەڵام ئەمە سەربردەیە بۆ پاش پتر لەدوو سەدە لەم ڕووداوە، ئاوا ژیایەوە؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەمەش سەربردەیێکی خۆمم هەیە دەبێ بیگێڕمەوە.

لەساڵی (٢٠١٤) بوو، لەزانکۆی یۆرك لە تۆرۆنتۆ، لەکەنەدا، بۆ خوێندنی ماجستێر وەرگیرام. لەساڵی یێکەم تەنیا لەپۆل بووینو بەشێوەیێکی ئاسایی، وەك هەموو قوتابییانی خوێندنی باڵا، وانەکانمان دەخوێندو ڕاپۆرتە زانستییەکانمان لەدەربارەی ئەو بابەتانە

دەنووسییەوە کە خەریك بووین دەمانخوێندن. لەسەرەتای ساڵی دووەمەوە، پێیان وتم، بچۆ لەنهۆمی دووەم، لە نووسینگە تایبەتەکەی خۆی، سەردانی پرۆفێسەر (ئین مارتن) بکە. منیش بەنازو فیزی پیرە قوتابییێکەوە، چوومە خزمەت مامۆستاکەو سەلامم لێی کرد. ئەویش وەڵامی دامەوە، بەڵام سەیر لەلام ئەوەبوو، نەچاوی هەڵبڕی تا سەیرم بکاو بمبینێو نەپێی نەوتم دانیشە؛ منیش هەر بەپێوە ناوی خۆمم پێی گوت. ئەویش وتی: دەزانم تۆ ناوت فڵانەو قوتابی ماستەری؛ بەڵام پێم بێژە چ کەسی؟

وتم — پرۆفێسەر من کوردم. یێکسەر کەگوێی لە وشەی پرۆفێسەر بوو، سەری هەڵبڕیو هەڕەشەی ئەوەی لێکردم ئەگەر جارێکی تر بێژم پرۆفێسەر، لێم قەبوڵ ناکاتو سەرپەرشتی تێزی ماستەرەکەم ناکاتو ناشهێڵێت سەر لەژوورەکەی بدەم.

ئیتر پاش چەندین کەینو بەین، تێیگەیشتم کە (ئین) نایەوێت، وەك مامۆستایانی زانکۆکانی کوردستانو وەڵاتانی عارەبیو دراوسێکانی ترمان، پلە زانستییەکەیان بکرێنە سەرناوەکانیان لەناوی خۆیان پڕ بەهاتربن.

نەمزانی ئەمە بۆ ئاوایە، ئایا پلە زانستییەکە لەخۆیان گەورەترو بەهادارترە یان شتی دیکەی لەدوواوەیە، هێشتا بۆم شی نەکراوەتەوە،

بەڵام دەزانم کە لەو هەموو زانکۆو لەناو دەرجەداره باڵاکانی کەنەدی‌و ئەمێرکیدا، لەخۆدی پزیشك بترازێت، گوێم لێ نەبووە بەکەسێك بڵێن دکتۆر!

پاش مشتومڕێکی زۆر لەگەڵ مامۆستایەکەم، چارەسەرێکی مامناوەندیمان دۆزییەوەو ناچاری کردم پێی بێژم (مستەر مارتن)؛ بەڵام پاش ئاشنابوون‌و یێکتر ناسینمان، ئەمیش نەماو منیش هەر وەك هاوپۆلە کەنەدی بیانییەکانم لێهات شەرمم شکاو بەناوی (ئین) بانگم کرد؛ ئیتر ناوی پرۆفێسەرێکی بەرپرس لەزیندووکردنەوەی زمانە مردووەکانی نەتەوە ڕەسەنەکانی کەنەدا، لەلای منیش تەنیا بە (ئین) ماوەو هەر بمێنێت.

ئین مارتن، مامۆستای زانکۆ بوو، بەرپرسی زیندووکردنەوەی زمانە مردووەکانی کەنەدا بوو و ئەگەر هەڵە نەبم پتر لە فەرهەنگێکی بۆ ئەو زمانە فەرامۆش کراوانە ڕێکخستبوو. لەپاشی ئەم هەموو بێنەو بگرەو بەردەیەی لەنێوانی خۆماندا کردمان، ئینجا مامۆستا پرسی – تۆ کێی؟

وتم: مستەر مارتن، من کوردم.

ئەویش تەماشایەکی کردمو فەرمووی - باشە، بەڵام تۆ لەناو ئەو کورد گەلەدا شوێنەکەت چییەو لەکوێوەیەو پێش هاتنە کەنەدا لەگەڵ کێ بووی‌و چ کارە بووی؟

منیش باسی ئەوەم بۆی کرد کە بەرلەوەی لەکوردستان دەربچم لە قوتابخانەکانی هەولێر، مامۆستای زمانی ئینگلیسی بوومە.

وتی: ئەمەیان ئاساییە. باسی دیرۆکی خانەوادەی خۆتم بۆ بکە.

منیش ئەم سەربردەیەم بۆی گێڕاوە کەوا لەپاش ئەم خاپەرۆکەدا، وەبەر دیدی خوێنەری هێژا دەکەوێت. کە لەبابەتەکە بوومەوە، (مستەر مارتن) سەری هەڵبڕی‌و پێی وتم – فەرموو، ئینجا دانیشە.

کە دانیشتم، وتی: من بڕیارمدا سەرپەرشتی ماستەر نامەکەت بکەم، بەڵام بۆ ئەمە مەرجێکم هەیەو دەبێ تۆ پەیمانم پێبدەی کە ئەم سەربردەیەی باپیرەت بنووسییەوەو چاپی بکەیت‌و بڵاوی بکەیتەوە؛ منیش بۆیێ کتێبە ئینگلیسییەکەم پێشکێشی ئەو مامۆستایە بەرزە کردووەو ئەوا لێرەش بەکوردی نووسیومەتەوە تا ئەو پەیمانەم ڕاپەڕێنم کە بە مامۆستام دا.

ئەم نووسینە کوردییە، نا وەك وەرگێڕانێکی کتێبە ئینگلیسییەکەیە؛ بەڵکوو بەتام‌و بۆیێکی کوردەواری ئامادەم کردووەو

ئومێدمە خوێنەری کورد کە دەیخوێنێتەوە چێژی لێ ببینێت بۆ هەمووان ببێتە هەوێنی نووسینەوەی سەربردەی جوانی دیکەی باوک‌و باپیرانمان‌و ئەدەب‌و مێژووی کوردەواری زەنگینترو ڕەنگینتر بکات‌و نەهێلێ زۆر لاپەڕەی جوانی مێژووی کوردەواری بزر ببێت‌و لەناو نەمێنێت؛ کاشکا نەوەکانی ئایندە سوودیان لێ ببینن.

**طاهر طیب جاف**

**مەلاکوا، کەنەدا**

**(٢٠٢٢/٦/٢٠)**

## میری ئامۆزامو پێشوازی لێکردنەکەی

خەریکبوو باوەڕ نەکەم کەمنم وا سواری پشتی ئەسپە شێیەکەی خۆمەو بەرەو ماڵ دەبمەوە، تا پێشکێشی میری تیرەی تیلەکۆی ئێلی جافانی بکەم. لەگەڵ ئەمەشدا، لە ناخرا شاناز بووم کە ڕاست بوو، منم وا لەسەر زینی ئەسپەکەی خۆمم؛ وەك ئەوە هەستم کرد کە لەبان عەرشێکی بزۆزەو دەچم مارەیی کچە میری خۆمو پادشای سەر تەختی دڵم پێشکێشی باوکی دەکەم؛ هەر لەو خەیاڵە خۆشەدا بووم تا گەیشتمە گوندی زڕگوێزو لەوێشەوە، بەرلەوەی بچم دایکم ببێنم، بەرەو دیوەخانی میری، بۆی شۆڕ بوومەوە.

پێشتر، هیچ شتێك لەم ئەندێشانە خۆشترو بەپێزتر، بەناو مێشکمدا، ڕەت نەببوون؛ هەموو جەستەم، لەگەڵیاندا، جمابوو! پێم نەدەکرا باوەڕ بکەم ئەوە منم وا، وەك با، بەرەو قوڵتی کۆچکی جافایەتی دەبمەوە، تا ئەو دەمەی چاوم بە جەنابی میر کەوتو گەشامەوە. بەڵام هەر کەمیر محمدی جاف لە دوورڕا دیتمی، تاسا! وەك کورد یێژێت، 'چاوی چووە پشتی سەری' و دەم لەقوچ وەستاو باوەڕی بەدیدی خۆی نەکرد کەوا منی نیشان دەدات! من بووم لەبەرچاویدا هاتبوومەوەو ئەسپەکەشم هێنابووەوە! ئەمەش وەك بروسك نەمیری کەوت؛ جا بەشێوەیێك ڕەفتاری کرد کە لەخودی ئەوەی

ناوی میربێت، نەدەواشاوەو بە حەپەسانێکەوە گوتی – "ئەوە تۆی؟ نەفرەتی! نەکوژرای؟"

"بەڵێ، منم!" لەوەڵامیدا گوتم. "برا گەورە، بۆچ دەبوو بکوژرێم؟" بەسەرسوڕمانەوە پرسیارم کرد.

میر ڕابوو، لە ئەسپەکەم هاتە پێش. خەریکبوو دابەزم، کە هاواری لە دەستوپێیەکانی کردو قیژاندی – "ئەم ئەسپە لەم بەڵایە بستێنن!" هەڵوەستەیێکی کرد، ئینجا قسەکانی خۆی تەواو کردو وتی – "من بۆ ئەوەم نەناردی بچی و بە سواری ئەسپ و بە ناز و فیزەوە، بۆ ناومان، بێیتەوە!" و لەسەر قسەکانی خۆی ڕۆیشت و نەوەستا و وتی – "من بۆ ئەوە تۆم نارد، تا ئەو ئەعرابە خێلەکییانەی ئەو بیابانانە، بتکوژن‌و کەس بە قەبرەکەشت نەزانێ! نا، نا، نابێت ئەمە تۆ بیت! من تۆم بۆ ئەوە نەنارد تا بە سواری ئەم ئەسپە ڕەسەنە بگەڕێیەوە نێو خەڵکی و 'تیلاکت لێ خوار بکەیت' و فیز لێبدەیت و ناچارم بکەیت سارا خانت بدەمێ و پێشکێشتی بکەم!"

میر، لەبن زەبری نەشتەرە کولەکەی تووڕەییدا، نیازە شاردراوەکەی خۆی لە ناردنم بۆ هێنانەوەی ئەم ئەسپەی ژێرم، بۆ ئاشکرا کردم. ئیتر کە منیش لە ئامانجەکەی گەیشتم و دۆخەکەشم بۆ ڕوون بووەوە و زانیم ئەگەر فریای خۆم نەکەوم، ئەو فریام دەکەوێت و ئەسپەکەم لە ژێر دەردێنێت و شاروەدەرم دەکات‌و بە گاڵتەجاڕی نەدی و بدییانیشم دەکات؛ جا خۆم لەسەر زینەکە ڕێکخستەوە و کۆششم کردوەبەر دەستی میر و بۆرە زەلامەکانی نەکەوم و بە وریاییەوە ڕابکەم‌و خۆم قورتار دەم؛ چونکە تێگەیشتم و زانیم و دڵنیاش بووم‌وا ئەو جافە ڕەشکانەی بەردەستی میر محمدی جاف خەریکبوون‌و تەمادار بوون، گەلەکۆیان لێدەکردم‌و هەر ئەوەندەی مابوو لە ئەسپەکەم دامبەزێنن.

بووە هەراو هۆریا. منیش، بەپەلە، ئەسپەکەم تاودا. ئەویش بە گورجی بازێکی هەڵداو سووڕی خواردەوەو دەگەڵ سووڕانەوەکەشیدا، میر راستو دروست وەبەر پاشی ئەسپەکەم کەوت؛ چونکە ئەسپەکەش تەنگاو کرابوو، لەو تەنگاتاوییەدا جووتەیێکی هاوێشت؛ میر نەیتوانی خۆی لێ لادات. ئەسپەکە ڕاستەوخۆ لووشکەکەی لەسەرو گێلاکو لە نیوچەوانی میری گیرکرد؛ کەللەی میر، وەك گەواڵە، تەقییەوە! هاوار لەبەر دەستو یاساوڵو خوڵامەکانیەوە، هەستا. هەر یێکەو لەڕاستە خۆیەوە قیژاندی – "کورە بیگرن! میر لووشکەی پێکەوت! نێلن حەمە ڕابکات. بیگرن! بیگرن!" ئیتر بووە هەراو هۆریایێك تا وایلێهات، لەو مەیدانەدا، ڕەشو سپی تێکەڵی یێکتری بوون! گوێم لێبوو یەکێکیان هاواری کردو گوتی: "لالۆ، میر کوژرا! میر مرد! سەری تەقیوە!"

ئیتر، بووە شڵپو شۆپو غارە غارو بگرەو بەردەیێك، کە لەوێدا 'سەگ خاوەنی خۆی نەدەناسییەوە'. زانیم لەدۆزەخێدا کەوتمو دەبێت دەستوبرد بم، ئەگینا لەناوێدا دەچم. ئاوڕێکی خێرام داوە. بینیم، میر بێ هەستو خوست لەپشتێدا کەوتبوو و خڵتانی خوێن کرابوو و لوتی وا بۆ ناوەوە قۆپا بوو، چووبووە ناو کەللەی سەری، ئیتر دیار نەمابوو! نێوچەوانی میری تەقی بوو، شەقی بردبوو! مێشکی بۆ دەرەوە هەڵیدابووەو میر تەنیا هەردووك قاچەکانی خۆی دەکوتان. دۆخەکە فرە شڕ و شلۆق بوو، هی ئەوەی نەبوو تەنانەت نە بیر لە ئاشتکردنەوەی میر و نە هەڵوەستەشی لێبکەم. زانیم میر خۆی بە کوشت دا. ئەو هەموو فیزەی بەرانبەری من هەیبوو، بەرگەی یێك جووتەی ئەسپەکەی بن منی نەگرت.

منیش بۆ ئەوەی خۆم ڕزگار بکەم، تا هێز و شەکەتم لەبەردا بوو، قاچی ڕاستەم لە تەنگەی ئەسپەکەم کوتا. نەمتووانی بەهەردووك قاچەکانم

لە تەنیشتەکانی بدەم، ئەگینا وامدەکرد. بەڵام چونکی پێی چۆپەم زامدار بوو و ژانی دەکرد، کەلکی ئەوەی نەبوو بیبزوێنم. ئەسپە شلەژاوەکە تێیقوچاند و تا لە توانایدا هەبوو غاریدا. بۆ کوێ؟ نە من زانیم بەرەو کوێیە دەڕوا و ڕادەکات‌و نە ئەویش ڕێی سەفەری پێ نیشاندام. لەو دەم و دەستەدا، گرینگ ئەوە بوو لە دەست ئەو کوڕگەلەی جافان دەرچم، ئەگینا، دڵنیا بووم، ئەگەر بیانگرتبام، بە قوربانی میرەکەیانیان دەکردم‌و دەبڕامەوەو من جوانەمەرگ و دایکیشم، لە دووای من، کۆستکەوتە دەماوە!

من پیاوانی جاف باش دەناسم، دەزانم چەند نەترسن؛ چەندە ڕاستن، هەندەش ڕەها و جوامێرن. زۆر دوور نەکەوتبوومەوە کە گوێم لێبوو، کەسێك هاواری کرد – "لالۆ بیگەنێ! بیگرن! کوڕینە میری کوشت؛ بیگرن؛ نەهێلن دەرچێ. گیانی لەبەر میر بڕی." پاشان هەندە دووربوومەوە، ئیتر لە قسەکانیان نەدەگەیشتم، هەر غەڵبەغەڵب دەهات و هەر هەی هاوا بوو دەنگی دەداوە!

بۆ من 'کار لە کار ترازا!' نابێت بهێلم وەبەر نێزەی جافان بکەوم، ئەگینا مەحاڵە لە دەستی ئەم هەموو کوڕگەلەی جافان، قورتار ببم! پاشی ئەو هەموو دووری‌و دەردەسەرییەی دایکم بۆ منی دیتبوو، بواری ئەوەم نەما بچم جارێکی دیکە بیبینم و دەستەکانی ماچ بکەم؛ پاش دووا دیداری بن ڕەشماڵی خێلە عارەبییەکە، نە جارێکی دی دایکمم بە چاوی خۆم دیتەوەو نە گوێشم لە قسەیێکی بووەوە؛ هەر لایێکمان بۆ لایەنەکەی تری، وە بنی بیرێ کەوت‌و سەربردەی نەما. بەڵام وەك کورد یێژن، 'پیاو دەبێ لە دوو چوان نەچێت!'

هەر بەغار، هەڵاتم، بەڵام نەبەزیم! چونکە ئەگەر ببەزیبام، خۆم ڕادەستی خۆیان دەکردەوە، بەڵام نەمکرد! بۆرە پیاوەکانی میری هەر لەم

کاتەدا کە لەو گوندە دەرکەوتم، تا ئێوارەو بەدرێژایی شەوی تاریکیش هەر بەدواوەمەوە بوون؛ ئەو چیرە درێژانە، نە خۆیان حەسانەوەو نە هێشتیان منیش چاوێکم تێکبنێم‌و سەرخەوێك بشکێنم؛ جا منیش نەمهێشت ئەسپەکەم چۆرە ئاوێکیش بخواتەو؛ کاتەکە تەنگ بوو، بەڵام خۆ نەیانتوانی بمگرن! ئاخر من بۆ خۆم و لەپێناوی ڕزگارکردنی خۆمدا ڕامدەکرد، کەچی ئەوان لەبری میرەکەیان هێنکەهێنکیان، لێ وەدەهات‌و چاوەڕێ بوون من دەستبەسەر بکەن و لە بارانبەریشدا، ئافەرینێکیان لەبنەماڵەی خۆمەوە بۆ بێت. ئاخر میر محمد ئامۆزای هەقی خۆم بوو، باوکم مامی ئەو بوو؛ بۆیێ کە باوکم مردو من لەوێ نەبووم‌و لە حوجرە دوورەکانی فەقێیانی کوردستاندا، دەمخوێند، ئەو دەسەڵاتی برا گەورایەتی باوکمی بۆ خۆی گرداو منی لە 'هرەو لە مرەی کرد؛' ژیانم ئاوەژوو بوو!

لەلایێکی دیکەڕا، من لەوان پتر ئاشنای ئەو هەردو بەردو تەلانانە بووم؛ ئاخر پێشتر گەلێك جاران پێیدا هاتبووم‌و چوو بووم؛ ئێرە ڕێی ئەو حوجرانە بوو کە بە فەقێیاتی دەچووم لێیاندا دەمخوێند. بەو ڕێیانەدا دەچوومە کۆیێ‌و هەولێرێ‌و موسڵێ‌و تا حەلەبێش ئەم ڕێیانەم قەتیاندووە، تا بە حوجرەی فەقێیەکانی بگەم‌و لەخزمەتی مەلایە گەورەکانی ئەو شارو دێیانەدا بخوێنم. بەڵام ئەم جارەیان بابەتەکە جودایە؛ لەجارانی پێشان ناچێت. پێشان ئومێدی وەدەستهێنانی زانست‌و وەرگرتنی ئیجازەی مەلایەتی‌و گەڕانەوە بۆ گوندەکەم پشتیوانم بوون.

جاران مکوڕ بووم بچم بەشوێن زانین‌و عەقڵدا بگەڕێم‌و لەکن مەلایە ناودارەکانی ئەو ناوچانە بخوێنم. کەچی لەم ئێوارەیەدا، بەپێچەوانەی هەموو ئێوارەکانی پێشتر، ترسی لەدەستدانی ئازادی‌و لێڵی ئایندە ناچاریان کردم، ڕشتتر لەجاران، ئەسپەکەم لینگدەم‌و مکوڕ بم، خۆم ڕادەستی ئەو بۆرە

پیاوانە نەکەم کە بەپەنجەی میریان تێنەدەبوو. ترس، هۆشی مرۆ ناهێڵێ، تاریکی دەکات؛ عەقڵ دەسوتێنێت!

گومان لەوەدا نییە کە ویستی قورتاربوون، ناچاری کردم ڕێشمە بۆ ئەسپەکەم شل بکەم. ئاخر، لەهەر سووڕانەوەییەك و لەهەر لێژیو هەر هەورازێکدا، خزمەتکارەکانی میری داویان بۆ دادەنامەوەو گەرەکیان بوو ئەسپەکەم لێ بستێننو منیش بگرن، تەنانەت ئەگەر پێویستیش بکات، هزرم وابوو، بمکوژن؛ چونکی کوشتنی من بۆ ئەو کەسەی کەمنی دەکوشت دەبووە ناوو دەنگو پاشتر بەم کارەی دەناسراوەو خەڵکی خۆیان لێی بەدوور دەگرتو خۆیشی، لەو گۆڕەو لەم ناوەدا، دەبووە هرس. ڕاوەدونانەکەم بەدرێژایی شەوێ نەبڕاوە، تا وایلێهات، ئەسپی بەستەزمان، لەمن قەیمتر، هێنکە هێنکی لێ وەدەهاتو بواری ئەوەی نەمابوو بحیلێنێت؛ تەنیا کۆششی ئەوەی دەکرد من دەرباز بکات. بەڵام ئەوان نەیانتوانی لە ڕاوەکەیان نەپسێنەوە تا دەمانگرن؛ چونکە دۆخی ئەوان لەهی منو ئەسپەکەم جودا بوو! منو ئەسپەکەم بەپێچەوانەی ئەوان بووین؛ وەبوو کە ئێمە یێکەم گزنگی بەیانمان دیت، هەستمان بەسەرکەوتن کرد، بەڵام هەر کە سەرەداوی ڕووناکی هەڵهات، ئەوان تفتیی بەزینیان چێژت؛ ڕووناهی سەری دەرکرد، ئیتر لەوێڕا هەموو دنیا لای منو هەموو کورد گەلیش لەدژی ئەوان بوون.

هەرکە سەرەتای کازیوە هەڵیکرد، هەستی ئارامیو شێنەییو ڕزگاربوون لەباوەشیان گرتم؛ جا وەك ئەوە بووم، بەم گەرمایە، ئاوێکی فێنکم پێداکرابێت، واملێهات. تاریکی چۆن هی ئەوان بوو، ڕووناهی بەهەمان شێوەو پتریش، پشتیوانی من بوو. من ئەو کات لەچەند دەمێکی پێشووتر بەهێزتر بووم؛ توانیم فریویان بدەم، خۆم قورتار بکەمو بەسەر سێکوچکەی تۆقینو ژانو داهێزراندا، کە خەریکبوون دەیانسرپیمەوە، زاڵ ببمو من هیچم

لەوان نەهێشتەوە تا لەمە پتر بمانترسێنن. ئەگەر هیوام ژیانێکی ئازاد نەباو پشتم بەخۆم نەبەستابا، نەمدەتوانی ئەم هەموو ناسۆری‌و ترس‌و دڵەڕاوکێیە هەڵتەکێنم‌و ئاسوودەیی وەدەست بێنم‌و وەدووا قۆناغ بگەم.

هەرچەندە لەو گوندەی کە لەدووررا لێم وەدەرکەوت‌و لەپێشمدا هەناسەی دەدا، نزیکتر دەبوومەوە؛ هەندە لە زڕگوێز دوورتر دەکەوتمەوەو پتر غەریبیم بۆی هەڵدەستا. ئاخ، گوندەکەم! دەبێ جارێکی تر بتبینمەوە؟ ئەم هەوارە نوێیەی سەر ڕێم، دەڤەرێکی نامۆ نەبوو؛ چونکە یان پێیدا تێپەڕیبووم، یانیش بەدەشتاییەکانی نزیکیدا هامووشۆم کردبوو. دەمزانی نزیکی پیرە شارەکەی هەولێر بوو، بەڵام نەمدەزانی دانیشتووانەکەی چ کەس بوون! هەرگیز بە ئەندێشەمدا نەگوزەریبوو ڕۆژێك دێت هاوار بۆ ئێرە دێنم، کاشکا خۆم چەپارە بدەم‌و ئەوانیش حەشارم بدەن‌و ژیانم بپارێزن!

ئای نێوچەوان! چۆن لەگەڕەکێکی لێواری دێیەکەی نزیك کردمەوە؛ نزیك بوومەوە. لەخۆڕا وشت بووم! دڵنیا بووم‌و زانیم کە دەبێ دەست لەخۆم بەردەم! دەبوو لێگەڕێم تا بزانم موقەددەر بۆ کوێ ڕامدەداو تاکوێ دەمبا! شەتەك ببووم؛ شەنگم لێ بڕابوو؛ داهێزرابووم؛ باری ئەسپەکەشم لەخۆم باشتر نەبوو؛ هەردووکمان شلوکول ببووین، داڕزا بووین، من زوبانم هەبوو، لێ بەڵێ ئەسپە نازدارەکەم لەپڕمین پتر هیچی بۆ نەدەگوترا. سەرباری ئەو هەموو ماندوو بوونەشمان، ژانی قومپانی چۆپەم ئۆقرەی لێ هەڵگرتبووم؛ برینی پاژنەکەم لەگەڵ هەر شەقاوێکدا گڕی دەستاندو تا دەهات ئاگری تێبەردەدام؛ خراپتر لەپێشتر دەیترپواندو دەیهاڕیم. کورژی کردبوومەوە، ئەگەر ناچار نەبووما، ترس قۆڵی لێ هەڵنەماڵیبایا، پێم نەدەکرا هەر بڕۆم. لێرەوەش چارم ناچارە، دەبێ بووەستم. نابێ لەم گوندە دوورتر بڕۆم. بەدرێژایی شەوی پێشتر، من‌و ئەسپە ترس بەزێنەکەم، هەر

غارمان داوە، تادەستگیر نەکرێین. لەبێچارەیی بوو، تا گەیشتمە ئەو شوێنە سەلامەتە، خۆم لەبەر ئازارەکە گرتبوو. بڕیارمدا، چیتر نەڕۆم؛ لەو گوندە دوور نەکەومەوە. ڕاست بوو بەدرێژایی شەو، منو ئەسپە ماندوو بەزێنەکەم، ڕێگامان بڕی بوو، شەتەك ببووین، داهێزرا بووین، بۆیێ چارەمان نەمابوو؛ ناچار بووینو دەبوو لەم دێیەی کە تازە چاوی لەبەر تیشکی خۆر هەڵهێنابوو؛ تازە ئاونگی سەر دارو درەختەکەی زەردەخەنەی ڕۆژێکی تازەیان بە هەموو لایێکدا دەبەخشییەوە؛ سەرباری ئەمەش، ئێرە، بۆ لادێیەکەی دایکم، زڕگوێز، نزیکترین شوێن بوو، تا بێترس لێیدا بحەسێمەوەو ڕەنگە هەر لێرەشدا بحەوێمەوە.

تەنانەت لەم نزیکییەش، هێشتا هەر غەریبی زڕگوێزو جافگەلەکەیم دەکرد. دووری زڕگوێز و دایکم و سارای ئەویندارەکەم، گریان تێبەردام! ئای سارا! نەرمی دەستو پەنجەو قژی زەردو زەردەخەنەی لەیادم ناچنەوە! دەڵێی مێشکم بووەتە بەردێکی ڕەق و یادەوەرییەکانیشم وەك نووسینەکانی پێش مێژوو لێی کوتراون و ڕەش نابنەوە! کە سارا دەگرژییەوە، لێوەکانی دەبوونە خونچەو خەریك بوون دەپشکووتن و دوو ڕیزە مرواری سپی لەنێوانیاندا دەترووسکانەوە؛ ئەستێرەی تاریکە شەو بوون. ماڵیان نەرمێ، مەیدانی ئەندێشەیان بۆ چۆڵ نەدەکردم! لێوەکانی بەپەلکە گوێزی کاڵ خەنەڕەنگ کردبوون، وەك ئەوەی لە ڕۆژێکی بەهاریدا، خۆر لەسەر زەردی بێت، سوورو قاوەیی تێکەڵی یەکتری ببوون. لەبەرە خۆمەوە گوتم: "دەبێ ئێستا چۆن بێ؟ دەبێ ئێستاش هەمان زەردەخەنە منکوژەکەی هەر مابێ؟ دەبێ بەری ئەو هەموو بەخت ڕەشییە بگرێت کە باوکە ماڵ کاولەکەی بۆی نەقش کردو تێوەی گلاند؟ زۆر ئەستەمە؛ پەپوولەبەرگەی ئاگر ناگرێت! ئەرێ، دەبێ ئێستا ئەویش غەریبی من بکات؟ ئەمەشیان ئەستەمە؛ چونکە

ئەسپەکەی من بوو کە جووتەی لە باوکی گرت و کوشتی. خودا! داد خودا! ئومێدەوارم ئەو هەموو قوڕبەسەرییە لە بیر بکاتو دیسان ئەگریجە خاوەکەی شانە بکاتەوە و لە خەنەی بگرێت. هەرچەندە خەنە ناتوانێت لەمە جوانتری بکات کە سرووشت پێی بەخشیوە.

ئای خودێ! زیندە خەونەکانم منیان گەیاندە ئەو دنیایەی کە لەهیچ دنیایێك ناکاتو ڕاستییەکەم لەزەین چوو؛ ئاخر وا خەریکە دەگەمە ناوەندی ئاواییەکە، ئێستا ئیتر کاتی تەکانە، "دەی تەکانێکی بدێ! ئەندێشە بازی بەسە!" ئەمەم بە خۆم گوتو تەماشای خانووەکانی گوندەکەم کرد. چەند خانووێکی دوو نهۆمی تێدا هەبوو. بەڵام خانووێکی یێك نهۆمییان، لەناوەڕاستی گوندیدا هەبوو کە لەهەموو خانووەکانی دێیەکە، بڵندتر بوو. بەپێی نەرێتی کوردەواری، دەبوو ئەویان دیوەخانی ئاغەی بێت. دیوەخان جێی ئەو میوانو ئەو کەسە غەوارانەیەی وەك من ئاسا وایە کە لە حەوانەوەو نانو پشتیوانی دەگەڕێن. بەگوێرەی دابی کوردەواری، بڕا گەورە ئەرکی پاراستنی ئەو کەسانەی لەمل بوو، کە هاواریان بۆی دەبرد. ئەوان لە سەلامەتی بابردەڵەو ئاوارەکان بەرپرس بوون. پاشڕەندی خێڵەکی بەرپرسیارەتی پاراستنی ئەو هەڵاتووانەی دەخستە ئەستۆی براگەورەو دەبوو جوامێرانیش پشتیوانو هاودەستی بنو پەناهەندەکان بپارێزن؛ ئاخر جاران ڕەفتارو ڕەوشتی بەرزی کوردەواری، ئاوابوون. بەپێچەوانەشییەوە، ئەگەر ئاغەی گوندێك پشتی لەو کەسانە بکردایە کە هاواریان بۆی دەهێنا، نەیپاراستبان، گوێی لێیان نەگرتبا، ئەوە ناوی بە ناپیاو دەردەکردو دەبووە 'بنێشتە خۆشکەی سەر زاران' و ئیتر نەك هەر لەناو خزمو خۆیشەکانی خۆیدا، بەڵکوو لەناو خێڵەکانی دیکەش ئابڕووی دەچوو و کەس پشتی پێی نەدەبەستاو بەقای کەسی پێنەدەما. هەر لەو کەینو بەینی ئەوەدا بووم

چونکە شڕو لە دۆخێکی ناهەمواردا بووم‌و پەڕپووت ببووم، پێویستیم بەوە بوو کەسێك بمپارێزێ‌و ئومێدم کرد سەرخێلی ئەم هۆزە 'وەبن باڵی خۆیم بگرێت.' ئاخر لەم کاتە تەنگانانەدا، مرۆڤ تەنیا بەئومێدەوە دەژی.

کە ئاوارەییێکیش دەکەوێتە بن سایەی ئاغەی گوندی‌و ئاغە سێبەری لێدەکات، ئەوا دەپارێزرێ؛ چونکە سامی ئاغەی گوندی ئەو کەسانە دەتەوسێنێتەوە کە ڕەنگە چاو لە کەسێکی ئاوارەی بابردەڵەی وەك خۆم ئاسا، بکەن. چجا ئەگەر ئەو بێ پشتیوانە ئەسپێکی ڕەسەنی لەژێردا بێت‌و گۆچانێکیشی پێ نەبێت تا بۆرە بەرگرییێکی پێ لەخۆی بکات؟ هەرچەندە، من خۆم، نە دەسەڵاتم هەبوو و نە هێز، بەڵام هیوایێك لەناخمڕا گەشەی کردو 'جێی بە ترسەکەم لەق کرد.' ڕووی خۆمم دا ئەو بەرزترین تەلارەی کە پێشتر لەناو گوندی لێم وەدیار کەوتبوو. هەرکە لێی نزیك بوومەوە، بینیم خەڵکێکی زۆر لەبەر سێبەری سبەینەی تەلارەکە هەبوون. دڵنیا بووم. "ئێرە دەبێتە قۆناغی کۆتایی ئەم سەفەرەم." لەبەر خۆمەوە گوتم. جا یێکسەر ڕووم لە دیوەخانەکە کردو چوومە ئەوێ! چەند شەقاوێکم مابوو بگەمە خەڵکەکە، بۆ ڕێز لێگرتنیان، خەریك بوو لەسواری ئەسپەکەم دابەزم، بەڵام پێشتر تێیان ڕامام. زۆربەیان پیرو پەك کەوتەو کەنەفتە بوون؛ کەچی هەندێکیان تێدابوو، توانای کارکردنیان لێ دیار بوو، بەڵام لەئێندەرێ دانیشتبوون. هیتریش هەبوون، دیاربوو بارەکانیان لەسەر شانی خزم‌و منداڵانیان بوو. هەموو ئەو حەشاماتە لەناو خۆڵەپۆك‌و لە سایەی دیوەخانەکە، پاڵیان دابووەوە.

چەند کەسانێك لەناو ئاپۆڕەکە تەسبیحیان بەدەستەوە بوو؛ قل، قل مۆرووەکانیان ئاودیو دەکردو لێوانیان لەگەڵیدا دەجووڵاندەوەو تەسبیحاتیان دەکرد. تەسبیحەکان سەیر بوون، لەشوێنێك دەستییان پێدەکردو دانە - دانە

دەرۆیشــتن‌و پاشــان دەگەڕانــەوە ئــەو شــوێنەی لێیــەوە هــەڵیان کردبــوو. بازنــەیێکی گەمــژە بــوو، جێـی سەرسـڕمان بـوو؛ نـازانم چـۆن ئـەو مۆرییانـە مانــدوو نــەدەبوون ئەوەنــدە بسـووڕێنەوەو بگەڕێنــەوە جێـی خۆیــان‌و هــیچ گەشەو پێشکەوتن‌و گۆڕانێك لە بزووتنەوەکەیاندا نەکەن! باش زەمینی خول خواردنــەوەی مۆرووەکــانم دا، تێگەیشــتم نــەك هــەر تــەنیا ژەمێــك خــواردن پەیدا ناکەن، بەڵکوو خواردن لەزاری منداڵەکان دەگرنەوەو بــەدەمی ئەوانــەی وەدەکەن کە بەڕاستی شایستە نەبوون. مۆرووەکـان بەشـێنەیی دەسووڕانەوەو کـاتی خاوەنــەکانیان بــەفیڕۆ دەبــرد! تێنەگەیشــتم، تەســبیح چ پەیوەنــدی بــە خواپەرستییەوە هەیە! گرینگ ئەوەیە کە مرۆ خودای لەبیر بێت‌و لە هزریدا دەرینەچــوێنێت. وەبــیر هاتنــەوەی خــودا تــەنیا پەیوەنــدی بــە هزرپــاکی مرۆڤەوەیــە. هــزری پــاك خــودا لــەبیر ناکـات؛ ئەمــەش پێویسـتی بــە تەسـبیح نەبووەو نییە؛ بۆیێ وا دەبینم کە ئەو تەسـبیحانە بـۆ ئـەوە دروسـتکراون تـا مــرۆڤ لــە کـارکردن دوور بخەنــەوەو وای لێبکــەن ببێتــە لامــش‌و بــێ بەرهــەم بێــت؛ لــەبری ئــەوەی نــان بــۆ کەسـوکارەکەی پەیــدا بکـات، نــانی منداڵــەکانی بخوات.

هەر لەناو ئـەو جڤاکـەدا، کەسـانێکم دیـت، لەسـەر لاتەنیشـتێك لێیـان پاڵــدابووەوە و ئەندێشــەبەند بــوون‌و چــاویان زەق ببــووەوە و پێڵووەکانیــان نەدەنوقان؛ دیاربوو زینـدە خەونیان دەبـینی‌و لـەدنیای ڕاسـتی دەرچووبوون. چەند زەلامێکی دیکە هەبوون، بەر سێبەرو خۆڵەپۆکەکەیان هەنـدە پێخـۆش بوو، چاوەکانیان لێـی داخسـتبوو، مێشـکی خۆیـان دەحەسـاندەوە؛ هەرچـەندە خۆ ئەو مێشکانە ڕێیان پێ نەدەدرا چارەسەری خەمێکی گوندی بکـەن، بـەڵام هەر ماندوو دیار بوون. تاڵی ژیان ڕۆژەکانیانی پڕ ژان‌و کەسەر کردبوو!

کەسـانی دیکەشـی لێبـوو، قـومی گـەورەیان لـە جگارەکانیـان دەداو دووکەڵیان بەبا دەکرد. ئەمانە زۆر کۆڵەمەرگ بـوون؛ لـەجیاتی شـتێك پەیـدا بکـەن، زۆر شـتیان دەسـووتاند! هـەر هێنـدە نـەبوو، بـەڵکوو هـیتریش لەوێـدا هەبوون، خەویان لێکەوتبوو و 'پرخەیان ڕۆژە ڕێیەك دەڕۆیی'، هەر کتومـت شەوێ بووری دەگەڵ مندا لەبەر پیاوە دۆڕاوەکانی مـیری جافـان هـەڵاتبوون؛ تـەنیا ئـەو هێنـدە لـەمن جیـاواز بـوون، مـن بـۆ ئامانجێـك هەڵدەهاتم‌و خـۆم مانـدوو دەکـرد کاشـکا ئـازاد بمێنمـەوە؛ کەچـی ئـەوان بـێ ئومێـدو بـێ هـیچ ئامانجێك ماندوو کەوتبوون‌و ئازادییان لەبیر نەبوو!

لەلا چەپێکی سیبەری دیوەخانەکەدا، دەسـتەیێك جـوامێرو هـەرزەکار گەمارۆی دوو کەسیان دابـوو کـە بـەم بەیانـە فێنـك‌و خـۆشـە، خـۆیـان بـەیاری دامە خەریك کردبوو! ئامادەبووان دەنگیـان لێهەڵدەسـتا، قیـژەیان ئـەو نـاوەی شێواندبوو؛ هەندێك پێشنیازیان دەکرد دامەچی بەردێك بـۆ چوارگۆشـەیێکی دیـار بگوازێتـەوە. لەبەرانبەریانـدا، هیـدی هـەبوون دەیانویسـت یاریزانـەکـە بەردێکی جیاواز لەو بەردەی چینی یێکـەم پێشـنیازی کردبـوو، بـۆ شـوێنێکی دیکە بگۆزێتـەوە، جگـە لـەو شـوێنەی ئـەوان هـەوەس حـاڵی بـوون. نموونـەی ڕاستی کوردەواری بوون! ئاخر حاڵی کورد هـەر وابـووە، دوو دەسـتە پیاوەکـان ڕێـك نەکـەوتن. ڕێبازەکـان جـودا بـوون؛ پلانـەکان جـودا بـوون؛ ئامانجـەکان جودا بوون؛ هەر یێکێك دەیویست هەموو بەقسەی ئـەو بکـەن؛ کەسـیان تێـدا نەبوو بەرانبەرەکـەی بـەپیاو بزانێت. مـەحاڵبوو لەخاڵێکدا کۆببنـەوە. ڕێـك نەکەوتن‌و قیـژە قیـژ پەیـدابوو. کـە دامەبازەکە داشـێکی جوولانـد، هەنـدێك توورە بـوون‌و دوور کەوتنـەوەو ئـیتر، دوور بـە دووری، ڕەخنـەی تونـدیان لـە گەمەکـە گـرت؛ بـەڵام بەردەکـە جێـی خـۆی گرتبـوو و لـە یاسـای دامەشـدا، پەشـیمان بوونـەوە خەوشـە. یـەکێك لـە ناقایلـەکان لـە دوورەوە قیڕانـدی —

"هەی نەزان! تۆ گوێ لەکەس ناگری، ئاخر ئەگەر بەقسەی منت بکردایە ئەو بەردەت نەدەخورا. هەی دۆڕاو!" دامەچییەکە وەڵامی نەداوە؛ تەنیا تەماشایێکی کردو گرژییەوەو ڕووی خۆی داوە دامەکەو بەردێکی دیکەی بزواند! ڕەنگە قسەنەکردنی دامەچییەکە نیشانەی ئەوە بووبێت کە متمانەی بەقسەی ڕەخنەچییەکە نەبووبێت؛ یان هەر بایەخ بە خودی کابرا، نەدات! بارەکەیان خوارو دۆخەکەشیان فرە ئاڵۆز کرد، وەختبوو پەشیمان ببمەوەو لەناو ئەو خەڵکە دانەبەزمەو گوندەکەش بەجێ بهێڵم! بەڵام کە بیرم کردەوە، زانیم لەم ژیانەدا، تەنیا دوو بژاردە لەبەر دەستماندا هەبوون، هەر یێکێکیان لەویتریان تاڵتر بوو – ببمە بەشێك لەو گەڕەلاوژەیە، کە ئەمەش لەناو کوردەواریدا، ئاساییە؛ یانیش بڕۆم تا برینەکەم پیس دەبێتو تەشەنە دەکاتو دەمکوژێت؛ ئەمەشیان کەسانی هەڵەپاسو کەمزان دەیکەن؛ نابێ من بیکەم! ناچار ئەوەم وەبیر خۆم هێناوە کە دەبیوەك دامەچیو شەترەنج زانان سەرچیغ بڕۆم، تا قورتار بم.

دەمێك سەیری ئەو هەراو هۆریایەی ئەوێم کرد؛ لە خەیاڵم وا بوو کە ئەم جڤاکە پارێزبەندە، لە کنیان ئەستەم بوو غەوارەیێکی نەناسراوی شەلی وەك خۆم ئاسا، وەربگرنەوە. ڕەنگە هەر ئەسپەکەشم لێ بستێنن و پاشان شاروەدەرم بکەن و بە فیکە لە گوندی ڕاوم بنێن و بە پاش و پێش سواری گوێدرێژێکم بکەن و سەرم بتاشن، ئینجا ماستم بەسەریدا بکەن و منداڵم وەدوو بخەن و هێندە هێلکەی پیسم پێدابدەنو بە پەلکە شوتییان وەدووام بکەون تا لە گوندەکەیان وەدەر دەندرێم. لەگەڵ هەموو ئەو خەیاڵە تفت و تاڵانەدا، دڵنیا بووم کە سڵاوەکەم جواو وەدەنۆ. ئاخر کورد یێژن – 'سەلام سەلامی خوڵایە' و ئامازە بۆ ئاشتیو سڵامەتیو یارمەتیو هەڤاڵبەندی دەکات؛ جا هەرچەندە دڵنیا نەبووم کەچۆن وەڵام دەدرێمەوە

بەڵام هەر بڕیارم دا ڕۆژباشەکەیان لێبکەمو وا بە باشم زانی وەك نەخوێندەوارێك سەلامەکە بکەمو گوتم: "سەلام حەلێکم."

نەمزانی دوای وەرامدانەوەی سەلام، خەڵکەکە دووکەڵی جگارەکانیان هەر هەڵدەمژنو مۆرووی تەسبیحەکانیان ئاودیو دەکەنو لە دامەبازییان ناپسێنەوە، یان سووك و ئاسان، ئەسپەکەم لێ زەوت دەکەنو بە شاپان لە لادێیەکەیان، گوندوەدەرم دەکەن، یانیش بەخێرم دەهێنن! کە خەڵکەکە گوێیان لە سەلامەکەم بوو، هەموویان وەك ئەوەی سەریان لەسەری یێکتری گرێ درابێتو دروا بێت، بە یێك جارو لە یێك چرکەدا، سەریان بۆ لای دەنگەکە سووڕاندەوە. تێمڕامان! دەیانویست بزانن کێمە! ئەو دەنگە نامۆیە هی کێ بوو؟ هەندێکیان خۆیان ڕاست کردەوە، هەندێك دانیشتنەکانیان گۆڕی و ئەوانەی کە نووستبوون چاویان زەق کردەوە و ئایەخ بوونەوە. پاشان، کە لە دیدەنی من دڵنیا بوونو زانیان منیش وەك ئەوانمو مرۆڤێکمو جنۆکە نیمە، جا هەموو بە یێك دەنگو زۆر جوامێرانە، وەڵامی سەلامەکەیان دامەوەو گوتیان: "وەحەلێکە سلامو رعمەتوڵڵا بە بەراکاتوهو. ماندی نەبی، براله."

'لەخۆم خەنی!' ئەمانە کەسانی دژوار نینەو وەك کۆمەڵگەکەی خۆمان خێڵەکی ئاسوودەو جوامێر دیارن.

"خزمینە! فرە ماندووگم، دەکرێ لەلاتان نەختێك وەعەسێمەوە؟" بە دەنگێکی فرە کزەوە گوتم.

"بەخێر هاتی، مێوان." پیاوێکی پیری کەنەفتە، لەناویاندا بوو، زۆر بە گەرمی وەرامی دامەوە – "فەرموو، لە ئەسپەکەت دابەزەو وەرە لێرە دانیشە." پیرەمێردەکە گوتی.

کە گوێم لە وشەی 'مێوان' بوو، هەناسەم لێ وەبەر هاتەوە، چونکە زانیم میوان لێرە دەبێتە میوانو هەردووکیش هەر کوردینە! جا لەزینی ئەسپەکەم دابەزیمو چەند هەنگاوێك بە شەلە شەل بۆ لایان چووم. پیرەمێردەکە بانگی کردو گوتی – "دەی کوڕینە! خێرابنو ئەسپەکەی لێ وەرگرن، بیبەستنەوەو ئاوو ئالیکی دەن." گەنجێك بۆی دەرچوو، لغاوەکەی لێ وەرگرتم، ئەسپەکەی برد لەسێبەری بنەدارێکی نزیك، بەستایەوەو کەمو زۆرێك بزر بوو، کە هاتەوە، مەنجەڵێك ئاوی پێبوو، لەپێش ئەسپەکەی دانا. ئەسپی تێنوو دەمی پێوەناو منیش خۆزگەم بە ئەسپەکەم خواستو زۆر نەمابوو داوای لێبکەم چۆڕە ئاوێکم بۆ بێلێتەوە! ماڵی ئەم ئەسپە نەرمی؛ هەموو ئاوەکەی خواردەوە! گەنجەکە دیسان بە ڕاکردن بۆی دەرچوو، پاش ماوەیێکی کورت هاتەوە، تلیانێکی پڕ کاو جۆی لەباوەش گرتبوو. هێنایو لەپێش ئەسپە شێی، دانا. زۆر برسیم بوو. خەریکبوو بە کوڕەکە بڵێم تا بچێ نانو ماستێکم بۆ بێنێ. بەڵام دانم بەخۆمدا گرت. چونکە ئەگەر پیاو ڕێشمەی بۆ ئارەزووەکانی خۆی شۆڕ بکات، گومان لەوەدا نییە کە ئەو ئارەزووانەی سەرشۆڕی دەکەن. لەم کاتەدا، لەهەموو شتێك گرینگتر ئەوە بوو کە لە سەلامەتی خۆمو ئەسپەکەم دڵنیا بووم؛ چیتر دڵەڕاوکێم نەما. ئیتر بەنەرمی وەڵامم دانەوە.

"خودا لێتان ڕازی بیت." گوتم، "بە یارمەتی خۆتان، دەبا تاوێك لەلاتان دانیشم." و ئیتر داهاتمەوە تا دانیشمو بحەسێمەوە.

هەموو بەیێك زارو بە ڕوویێکی خۆشەوە، گوتیان – "دە فەرموو سەرچاوان هاتی. ئێرە بە ماری خۆت دابنێ؛ غەریب، ماندی دیاری؟"

## برایم ئاغەی مەنتك

هێشتا سمتم وە زەوی نەکەفتبوو، کە لەبەر دەنگی ئەو خەڵکەو بەخێرهێنانەکەیانەوە، پیاوێکی کەڵەگەتی باریکەڵەی مووسیسی چاو بچووك، لە دیوەخانێ لێمان وەدەرکەوت؛ کڵاوێکی دەستکردی تا بڵێی جوانو بەسیمی ڕەنگاو ڕەنگ ڕازاوەی لەسەر نابوو، جەمانەی نەبەستابوو، پێدەچوو لە دیوەخانێ خەریکی خوێندنەوە بوو بێت، یان هەر بەتەنیا لەوێدا، خۆی تەنیا کردبێتو پاڵی دابێتەوە تا بحەسێتەوە، پێش ئەوەی کاری خەڵکی فەراهەم بکات؛ وەك کەسێکی خانەدانی فرە سامزەدە، هاتە بەرچاوم. هەرچەندە جەمانەی لەسەر نەکردبوو، بەڵام گەوراتیو دەسەڵاتی پێوە دیاربوو؛ چونکە هەرکە لە دیوەخانێ دەرکەوت، گەورەو بچووك، لە سامی ئەو، خۆیان ڕێکخستو ئەوەی پاڵی دابووەوە دانیشت، ئەوانەی دانیشتبوون، خۆیان ڕێکخستو ئامادە بوون بۆ هەر فەرمانێك ئەو کابرایە بیدا. چاوی گێڕا تا منی دیت. بەجۆرە سەرسامییێکەوە گوتی –

"گەنجۆ! تۆ غەوارەی؟" پرسیاری لێکردم، "موسافیری لە دووررا هاتی؟ چەند دوور؟ بەخێر هاتی. وەرە ژۆرێ، با بتناسم." لێی خواستم. گوتم – "بەڵێ."

"ئەدی ئەو ئەسپە، هی کێیە؟" لێی پرسیم.

"هی منە. کاکە." لە وەڵامیدا گوتم:

وا خۆی هەڵخست کە بایەخ بە وەڵامەکەم نەداو چۆوە ژووریَ. کابرایە پیرەکەی پێشتر بەخێرهاتنی کردبووم، بەهەر پێنج پەنجەکانی دەستی ڕاستەی ئاماژەی بۆ کردم – "دامەنیشە کوڕم!" فەرمووی، "ئەوە ئاغەی گوندییە، برایم ئاغەی مەنتك، گەورەی ئەو حەشیرەتەیە. هەرووەکنی، جوامێرە." کابرا بۆی ڕوون کردمەوە.

منیش ناچار بووم لەکن ئەم هەموو ڕێزدارانە دانەنیشمو بەقسەی مامە پیرەکە بکەمو لە دووای برایم ئاغە بچم. لەبەر خۆمەوە گوتم – "ئەم خەڵکە لەڕادە بەدەر پیاوی چاکن، دەبێ برایم ئاغەش لەوان بێت؟

عارەب دەڵێن – "كَيْفَما تكونوا يُوَلَّ عَلَيْكُمْ – ئێوە چۆن بن، سەردارەکەشتان هەروا دەبێت." کەواتە دەبێ برایم ئاغە لەوان باشتر بێت، ئەگەر واش بێت، ئەوا 'پارووم کەوتە ڕۆنی.' من لەبەرئەوە ئەم هەموو خەیاڵە پڵاوانەم بۆ هات، چونکی برایم ئاغە، کاتێك کە قسەی دەگەڵدا کردم لێی خواستم بەدوایدا بچم، زۆر توندبوو؛ ئاسایی نەبوو، خۆی وا هەڵخست کە کابرایێکی زۆر گرژو تووڕە بوو. دەستم لەخۆم شووشتو چارم ناچار، 'خۆم خستە کۆشی خودای' و غلۆری ناو دیوەخانێ بوومەوە.

ئاغە زۆر بە هووردی لەسەر تا بن تەماشای کردم. دەبێ تێبینی پۆشاکەکەی کردبێم؟ فرە پلتۆخ بوو و بۆنی 'ڕۆژە ڕێیێك دەڕۆیشت.' دوو مانگ دەبوو خۆم نەشووشتبوو، لەو ڕۆژییەوە عەرەبە خێڵەکییەکان منیان بەستەوە تا ئەمڕۆ ئاو بە هیچ شوێنێکی پێستم نەکەوتووە. ئاخر پیاوانی خێلە عارەبییەکە ئاویان نەدەدامێ تا دەستنوێژیشی پێ بشۆم و نوێژەکانم، بە ئاسایی، بکەم؛ جا ناچار بووم، بۆ هەموو نوێژێك، تەیەمومم دەکرد، ئینجا فەرمانی خودام جێبەجێ دەکرد. ئەرێ دەبێ لەم چاودانەی، برایم ئاغە زەینی لە شەلینەکەم دابێ؟ دیار بوو، ئەو پیاوە، بایەخی بە ڕووالەت

نەدەدا، بەڵکوو لە قووڵایی نهێنی من دەگەڕا. دەیویست بمناسێ، بزانێ کێم، چم، لە کوێڕا هاتووم؛ سەربردەم چییە، عەودالی زانیاری من بوو!

لەم ناوچانەدا، شەلین ئاسایی بوو! زۆر کەس هەبوون دەشەلین، چونکە لەمنداڵییەوە تووشی شکست هاتبوون و بە چاکی چارەسەر نەکرابوون؛ ڕاست بوو، هەر گوندێك و بەیتارێك دووانی هەبوو ئێسقانی شکاویان دەگرتنەوە و لەهەندێ گوندیش تەبیب واتا پزیشك هەبوون، ئەو تەبیبانە شارەزاییان لە گژ و گیا هەبوو و بۆ دەرمان بەکاریان دەهێناو، بەپێی زانیارییە سەرەتاکانیان، نەساغیان پێ چارە دەکردن؛ چونکە، لەسەردەمی فەرمانداریەکان تەنیا یێك نەخۆشخانە لەم کوردستانە پانو بەرینەدا دروست نەکرابوو تا خەڵك هانای بۆ ببات! ئەو داگیرکارانە سەدان ساڵ فەرمانداریان کردو حوکمی ئیسلامییان گێڕا، بەڵام تەنیا یێك پزیشکداریشیان لەم ناوچە کوردنشینانەدا قیت نەکردەوە. بەو خەیاڵانە دڵی خۆمم دەداوە و خۆزگەم دەخواست مێژوو وەرچەرخابایەوە و ڕاستییەکان ئاوها تاڵ نەبانا، بەڵکوو بەپێچەوانە بوونایە و ئەوانەی کە فەرمانداری کوردستانیان دەکرد، چۆن لە شەڕ و داگیرکاری، دەستی سەرەوەیان هەبوو، لە ئاوەدانیو عەدالەتیشدا ئاوها بانا. ئەو کات مێژوو خۆی شانازی بە نەوەی ئەو حوکمدارانە دەکردو ئێمەیش هەر ڕەحمەتمان بۆ گۆڕەکەیان دەنارد!

خزیمە ناو دیوەخانێ، ژوورێکی لاکێشەی ئاسایی بوو. بیست هەنگاوێك درێژو حەوت شەقاوێکیش بەرین دەبوو. ئەم پێوانە تەنیا بەبۆچوونی خۆم بوو، ئەگینا لادێییەکان هەندێك پێوەری ڕەمەکییان بەکاردەهێنا کە خۆیان پەرەیان پێدابوون تا ئیشو کارەکانیان پێ ڕەها بکەن؛ چونکە ئەندازیاری لەلای ئەوان هێشتا نەترووکا بوو. ئەو پێوانانەش بریتی بوون لە – 'گرێ، ئەنگوست، قولانج، بست، پێ، لابال، بال، شەقاو،

گەزو پەت'؛ ئەوەی دووایی لەهەموویان درێژتر بوو؛ لەم ناوەدا پێی یێژن 'گوریس' چونکە 'پەت' یان 'پەتك' لەم دەوروبەرەدا، گوریسی بێ کەلکەو هەموو ئیشێکی پێئەنجام نادرێت. ئەو پەتەی کە بە کەلك هیچ نەدەهات؛ نە شەغرەی پێدەکراو نە ئاوی پێدەهاتو نە ئاژەڵی پێدەبەستراوە، لە کن مەلای یان لەلای ئاغەی دەپارێزرا. لە کاتی پێویستیش، زەوی‌و زار بەو گوریسە دەپێودرا. هەر گوندو پێوەری درێژی تایبەتی خۆی هەبوو. ئەو پێوەرانە هەموویان بۆ دیارکردنی دووری دوو شوێن لە یێکتریان، یان بۆ پێوانەی درێژی بەکاردەهاتن. پێویستیشی دەکرد مەلاو ئاغە ئەو پەتەیان بە پێوەری ڕاست دابنایە تا خەڵکی بەکاریان بهێنابان؛ لادێیی وا هەبوو بەو پێوەرە قایل نەدەبوو کە زەوییێکی دەفرۆشت‌و پەتی خۆی نیشان دەدا تا بەکاربێت؛ بەڵام کە دەیکڕی بەهەمان گوریسەکەی لای ئاغەی قایل دەبوو؛ چونکە ئەو پەتەی لای مەلا یان لای ئاغەی گوندەکەیان هەڵدەگیرا، لەوە درێژتر بوو کە فرۆشیار دەیویست. لەم لایەنەش داگیرکارەکان لە گوێی گادا نووستبوون‌و پێوەرێکی فەرمییان بۆ ئەو گەلە نیشان نەکرد تا بەکاری بێنن؛ تەنیا گەز هەبوو، ئەویش (یاردە) بوو و درێژییەکەی (٩٠) سانتیمیتر بوو و بۆ کووتاڵ فرۆشتن دوکاندارو کووتاڵفرۆشەکان بەکاریان دەهێناو (دێوەرە) لەلایان هەبوو، لەناو گوندەکان گەز نەبوو! لەم کوردستانەدا، فەرماندارەکان تەنیا لە دوو شت زۆر باڵا بوون، سەرانەو باجیان، بێ پسانەوە، لەخەڵك دەستاندو هیچ کاتێکیش لەبیریان نەدەچوو گەنجەکانیان بۆ شەڕەکانی خۆیان ڕاپێچ نەدەن.

هەر لەو کەین‌و بەینەدا بووم کە تەماشای بانی دیوەخانەکەم کرد، دیتم کاریتەڕێژە؛ پتر لە بیست کاریتەی لەبندابوو. تەنیا هەر کاریتەکان وەك یێکتر نەبوون، بەڵکوو نێوانەکانیشیان لە یێکتر نەترازابوون؛ بەڵێ!

جوان ڕێکخرابوون. چیغ لەسەر کاریتەکان ڕایەڵ کرابوو و ئەو بەنانەی قەمیشەکانیان بە یێکەوە دەنووساند، دیمەنێکی قەشەنگییان بەو بانە دابوو. ملم ماندوو بوو هەندەی سەیری بانەکەم کرد، جا سەری خۆمم دانواند. ناو دیوەخانەکە ئاگردانێکی خڕی لەناوەندێدا هەبوو. لەناو قونئاگرکە، پەنگر دەترووسکانەوە، هەڵمیان لە جەزوەی قاوەو کیتڵییەکی زەبەلاحەوە هەڵدەستاند. بۆنی قاوەکە لوتی جۆشدام.

جوامێرە گرانەکە بە دەنگێکی گڕو زمانێکی نەرمو بە کوردییێکی ڕەوانو پڕ لە ڕێز، داوای لێکردم تا دابنیشم. ئیتر منیش بە گوێیم کردو ملکەچی بووم. لەو دەمی دادەنیشم تەماشام کرد دەلاقەکانی ناو دیوەخانەکە تژیان کتێبو تاکە لاپەڕی دەستنووس بوون. هەندێکیان تەنیا یێك لاپەڕە کاغەز بوون، نووسرابوونەوەو لەوێدا هەلگیرابوون. شێوەی نووسینەکان گەلەك لەهی هۆزان دەچوو؛ هەموو شیعر بوون. ڕەنگە هی هۆزانڤانی گەورە بن! بەڵام لەڕاستیدا من لەو دۆخەدا نەبووم داوایان بکەم یان لە برایم ئاغەی مەنتك بپرسم، تا بزانم چ چەشنە هۆزانێك بوون، یان هی کێ بوون! پێویست بوو خۆم لەم پرسیارانە لابدەمو بیر لەبەرژەوەندی خۆم بکەمەوە نەك لە بەدووادا چوونی چەند شیعرێك، با شیعری باشیش بن؛ چونکە ڕۆژێك هەردێت چاوم پێیان دەکەوێت. لەو دەمانەدا برایم ئاغەی مەنتك هەر سەیری دەکردم، تێمڕادەما؛ وەك ئەوە بوو هەڵمبسەنگێنێ و تێمبگات! بەڵام لە هیکەوە گوتی — "ئەوانە شیعرن، دەستنووسن. شیعرنو بە دەسخەتی شاعیرەکان نووسراینەوەو کەس نییە ئەو هەربەستانەی هەبێ؛ هەر لەکنە من هەنە." برایم ئاغە بە شانازییەوە بۆی ڕوون کردمەوەو پاشان لە هیکڕا لێی پرسیم — "ئەرێ، ئەتوو چ خیندەواریت هەیە؟ سەوادت

چییە؟" پرسیاری کردو سەیری ناو چاوانی کردم تا بزانی چ دەڵێم‌و چۆن وەڵامی دەدەمەوە.

"ئەوەندە بەختەوەر نەبوویمە، ئاغە،" وەڵامم داوە. "خوا پێی نەدایمە بخوێنم. سەوادم نییە!" لەوەڵامیدا گوتم.

"دەرێم!" ئەمەی گوت‌و یێکسەر بابەتی قسەکانی گۆڕی‌و لێی داوا کردم تا چایە بۆ هەردووکمان تێبکەم.

"دە، بێ زەحمەت،" فەرمووی، "دوو پیارە چایە لۆ خۆم و لۆ خۆت تێبکە." ئاغە فەرمانی داو فەرمانەکەی وەك ئەوە بوو بیەوێ تاقیم بکاتەوەو ئاوام لێبکات هەست بەجۆرە ئاسوودەییێك بکەم.

"مەمنوونم، ئاغە!" گوتم، "لەم دەمەدا، چایەم بۆ ناخورێتەوە، بەڵام بۆ جەنابت چایەیێك تێدەکەم." زۆر بەرێزەوە پێشنیازم کرد.

"تۆ پیاوەکی ڕەند دیاری!" ئاغا گوتی، "کابرا، نانی سبەینێت خواردییە؟ پێناچی خواردبێت!" ئاغە لێی پرسیم. هێشتا وەرامیم نەدابووەوە، تێگەیشت کە برسی بووم؛ هەر بۆیێش چایەکەم نەخواردەوە چونکە نەخواردنەوەی چایە لەماڵی خانە خوێ، هێمای ئەوەبوو یان دەبێ برسی بووبم، یانیش دەبێت خواستێکم لێی هەبوو بێت.

"نەخێر، ئاغە." وەڵامیم داوە.

"دەی – دەی، کوڕینە!" ئاغە بانگی کرد. "کێ لەوێیە؟ کێ لەدەرێیە؟" ئاغە دەنگی خۆی هەڵبڕی‌و دیاربوو خۆی نیشان دام. کابرایێك هاتە ژووری‌و لەبەر دەستی برایم ئاغەی مەنتك ڕاوەستاو هیچی نەگوت.

"هەڕوو خواردنی لۆ بینە." ئاغە فەرمانی پێکرد.

"خودا پاداشتت بداتەوە و پایەت بەرزتر بکات!" سوپاسی ئاغەم کرد، چونکە ئەوها ڕیزی لێنام و بایەخی پێدام ناچار بووموەڵامێکی بدەمەوە، لە چەشنی ئەرکەکەی بێت.

زۆری نەبرد، خواردنەکە هات. ماستێکی سەر بەسەر توێژو کولێرەیێکی گەرمی ئاوا کە بۆنەکەی ئەم ناوەی پڕ کرد. کابرایەکەی چووبوو خواردنەکە بێنێت، تلیانەکەی بە خواردنەوە لەپێشە من دانا.

"فەرموو." پێی گوتم:

"خوا پاداشتت بداتەوە." پێش ئەوەی کابرایەکە خێرا لە دیوەخانێ دەر بچێت، نزام بۆی کرد.

پێنەدەچوو کابرا لەمن تێگەیشتبێت، بۆیێ سەیرێکی کردمو سەری خۆی لێبادامو هیچی نەگوت. جا پێش لەوەی دەربچێتە دەرەوە داوای جامێك ئاوم لێی کردو وتم:

"بەخێری خۆت؛ دەتوانی جامێك ئاوم بۆ بێنیێ؟" ئەمجارە تێگەیشتو بەڕێزەوە تەماشای کردمو پاشان بزر بوو و زۆری نەبرد کۆتکێکی پڕ ئاوی بۆ هێنام.

"فەرموو، ئەوە ئاوەکە، لە گیانت خۆش بی." کابرا گوتی.

"دەستت خۆش بێت." وەڵامی کابرام داوە؛ هێندە برسی نەبووم تا لەبیرم بمێنێت فەرموو لە برایم ئاغەی مەنتك بکەم.

دەستم بە خواردنو خواردنەوە کرد، بێ ئەوەی هیچ بڵێم؛ دەتگوت تازە لە گرانی قورتار بوویم. خواردن چ خواردنێك بوو! تا تێر نەبووم سەری خۆمم لەسەر قاپە ماستەکە هەڵنەبڕی؛ پاشان کە هاتمەوە سەرەخۆ، ئینجا بە خۆمم گوت – "هەی ماڵت نەڕمێ! زمانت لە زاریدا نەمابوو تا فەرمووی پێ لە ئاغەی بکەی؟" ناچار کە تێر بوومو لێبوومەوە، بە شەرمەوە سوپاسی

خودام کرد، ئینجا نزام بۆ برایم ئاغای مەنتك کردو وتم – "لە ماڵ و موڵکتان بە زیاد بێت، ئاغە! خودا خێرتان بنووسێت و لەهەموو مردووەکانیشتان خۆش بێت." پاشان دەستم بە ڕیشمدا هێنا و چاوەڕێی قسەی ئاغەم کرد دەمویست بزانم چم پێدەڵێت.

"تێر بووی؟" ئاغە پرسیاری لێ کردم‌و پاشان بە چاکی زەینی خۆی دامێ.

"بەڵێ، جەنابی ئاغەی، گەلەك مەمنوونم." لە وەڵامیدا گوتم:

"شەرمێ مەکە!" فەرمووی – "ئێرە بە دیوەخانی خۆت بزانە." ئاغە بە توندی قسەکەی کرد.

"نا، شەرمی ناوێ، ئاغە! خواردنەکە بۆ ئەوە نەهاتبوو هەر سەیری بکەم، بەڵکوو بۆ ئەوەبوو تا بخورێ و ئیتر پێویستی بە شەرم نەدەکرد." ئەمەم ووت و بۆ ئاغەم ڕوون کردەوە کە لە حاڵەتی ئاوادا، شوورەیی ئەوە دەبێت ئەگەر پێمگوتبا برسیم نییە و "خۆیشم هێندەی نەمابوو لە برسانا ئاوزینگ بدەم." بە ئاغەم گوت:

"پیاوی برسی عەیبی لێناگیرێ ئەگەر داوای خواردن بکات." برایم ئاغە فەرمووی، "کورد دەڵێ – زگی برسی لەهیچ ناپرسی – بەڵام خەرەتە ئەگەر برسی بی‌و داوای خواردن نەکەی." لێرە هەڵوەستەیێکی کردو پاشان دیار بوو شتێکی لە دڵیدا هەبوو و دەیویست بۆم ڕاڤە بکات.

"ئەوە چەند جارەکە گێم لێتە ناوم دینی!" ئاغە گوتی – " دیارە لە دەرێ ناوی منیان پێگۆتی. بەڵام باشتر ئەوە ئەمن بە خۆم باسەکی خۆمت لۆ بکەم‌و وە بکەم لە زمانی خۆمڕا بمناسی، نەك لە خەرکی گێت لەناوبانگم ببی." هەرکە هەڵوەستەیێکی کرد، گوتم:

"بەڵێ!"

"ئـەمن بـرایم ئاغـەم،" فـەرمووی، "خزمـەتکاتری خزمـانی هـۆزی مەنتکم؛ نە مەلامـە و نـە واعیـزم، کەسـەکی راسـتو دروسـتم." بـرایم ئاغـە قسـەی وەك شـیعر بـۆ دەکـردمو فـەرمووی – "ڕاسـت بیـنم و بـەو ڕاسـتییە کوڕگەلی مەنتك باوەڕیان پێکردیمە، هـەموو زەوی‌و زاری ئـەو دەوروبـەرەیان لۆ بە جێهێشتیمە. ئەمنیش هەر دەمەکی ئەوان بیانەوێ هاریکارییانم، ئەمـە هەمووومان هی یێکدینە و لۆ یێکدینە. ئەوان دەستی ڕاستەی منن و ئـەمنیش ڕێ نیشاندەرو پشتو پەنایانم."

لـەلام سـەیر بـوو؛ ئەمـە یێکـەمین جـارە گـوێم لەسـەرۆك خێلـەکی کوردەواری بێت بە خۆی بلێت من خزمەتکاری کوڕگەلی هۆزەکەمم و نـەلێت من براگەورە یانیش سەرۆکی ئەم هۆزەم! هەی ئافەرین، جوامێر!

ئاغە هەناسەیێکی هەلکێشا، پاشان فەرمووی:

"دە باشە! هەنووکە واز لەوانە هەموویان بینە. دەی ئەوجا چایەکەی تێکـە، میـوان، بـا بیخۆینـەوە و هـووردە – هـووردە قسـەی خۆشمـان بکـەین. ئەوەی پێم بکرێ لۆت دەکەم؛ وە دانێ پێویستییەکانت هـەموویان قەتیانـە."

ئـەم قسـانەی بـرایم ئاغـە هـەمووی بـۆ مـن متمانەبـەخش بـوون؛ منیـان بووژاندەوە؛ لە ناخڕا ئاسوودە بووم. لەهەمووشیان خۆشتر ئـەوەبوو کـە پێـی گـوتم – میـوان، و پاشـان پەیمانێـدا ئـەوەی بمـەوێ بـۆم بقـەتێنێ. لـەو نـاوە میوان پایـەی تایبـەتی هەیـەو پـەیمانیش تـەرازووی ناسـین و هەلسـەنگاندنی پیاوە؛ پشتگوێ ناخرێت.

بەدەستی لەرزۆکمەوە، چایەکانم تێکـرد. دەسـتم لەبەرئـەوە دەلـەرزی چونکە پێشتر هـیچ ئیشـم نـەکردبوو! چجا ئەگـەر بـۆ جـوامێرێکی گـەورەی میهرەبانی وەك برایم ئاغە، چایە تێبکەم! دەبـوو هـەموو جەسـتەم وەك دار بی ناو ئاو، بلەرزیبا نەك تـەنیا هـەر دەسـتم. ئـەو دەسـتو پـێ سپیاتییەشم

لەوەوە هاتبوو کە هەموو ژیانم شەیدای خوێندن بووم‌و بە دووای ئەو مەلایانەدا دەگەڕام کە زانستیان پێبوو و ناوبانگی گەورەو فەقێی زۆریان هەبوو. هەموو کاتی خۆمم لەخوێندن بەسەر بردبوو. قورئان‌و زمانی عارەبی‌و تەفسیرو شەرع‌و ئەدەبی عارەبی نەقدو بەلاغەو عیلمی حەدەیسم خوێندبوو. ئاواتم ئەوەبوو ئیجازەی مەلایەتی‌وەربگرم؛ بۆیێ باش خوێندم‌و ئیجازەکەم وەرگرت! تەما بووم لە مزگەوتی گوندێك ببمە مەلاو خوتبە بخوێنمەوەو پێشنوێژی بۆ کرمانجە بەزۆر بە ئیسلام کراوەکان، بکەم. ئەو زانستەی فێری دەبووم چۆن بە وردی گەشەی دەکرد، کەسایەتییە ئاغەکەی منیش وەك زانستەکەم بە شێنەیی لەناو دۆست‌و ناسیاراندا پایەم هەڵدەکشا و بڵندتر و گەورەتر دەبووم‌و ئیتر بە ئارەزووی خۆیان خزمەتیان دەکردم نەیاندەهێشت هیچ کارێك بکەم. لەناو ئەم جڤاکە کۆلاوارەی کوردەواریدا، کەسێك کە خوێندەوار با، ڕیزی لێ دەگیرا. منیش خوێندەوارو بەگزادەییێکی جافان بووم؛ بۆیێ پێشتر کارم نەکردبوو. بەڵام هەرکە ویستم کارێك بکەم، تووشی ئەم هەموو دەردەسەری و زۆنگاوە هاتم کە کوڕ مامە پاشایەکەی جافان بۆی هەڵکۆڵیم و ناچاری کردم پەنا بۆ ئەم دێیە بێنم. پیاو کە زۆڵمی لێکرا، یان دەبێت بەرهەڵستی ستەمکار بکات یان دەبێت مەیدانی بۆ بەجێبێلێت، منیش، لەناو جافان، سێ جار زوڵمم لێکرا؛ جارێکیان میری ئامۆزام کچەکەی خۆی پێنەدام؛ جاری دووەم ڕەوانی ناو عارەبانی کردم بەو مرازەی تا بمکوژن، بەڵام ئەوان جوامێر بوون‌و ڕێزی نەترسی و کۆڵنەدانەکەیان گرتم؛ سێیەم جاریش، تەمای هەبوو ئەسپەکەم لێ زەوت بکات‌و وەك کورد یێژن – 'شاپترێنم بکات.' باسی ئەوەش هەر ناکەم کە دەستی بەسەر تەخت و موڵك و ماڵی باکمدا گرت و منی ئاوارەکرد! هەر لەم خەیاڵانەدا بووم کە دوو پیاڵە چایەم تێکرد. یەکێکیانم لەپێش ئاغەی داناو

ئەوی دیکەشیانم بۆ خۆم هێشتەوە. چاوەڕێ بووم براگەورە فڕێکی لێبدات تا منیش قومی خۆمی لێبدەم. ئامۆژگارییێکی دایکمم وەبیر هاتەوە کە پێی گوتم:

'ڕۆڵە! دیوەخان ڕەسمبەندە! چاك‌و خراپی تێدا، وێکڕا، کۆ دەبنەوە. ئەو گردبوونەوانەش ڕێسای تایبەتی خۆیانیان هەیەو دەبێ پەیڕەو بکرێن؛ کە کەسێکی لە تۆ بە تەمەنتر لەوێ بوو، گوێی بۆ ڕایەڵ کە، بزانە چ دەڵێ، تێبیگە و لێی فێر بە.' ئەو کەڵە ئافرەتە هەر لەو قسانەیدا فێری کردم کە قسە بە هیچ کەسێك نەبڕم، تۆبزی لە کەسی لەخۆم گەورەتر نەکەم تا گوێی لێم بگرێت و فەرمووی – 'ڕۆڵە! هەرگیز بە پێش کەسێك مەکەوە کە لە تۆ بە تەمەنتر یان زاناتر یان پلە و پایەی کۆمەڵایەتیی گەورەتر بێت. هەرگیز پێشی ئەوان دەست بۆ خواردن یان خواردنەوە مەبە. چاوەڕێیان بکە تا ئەوان دەست پێدەکەن، ئینجا تۆش ناوی خودای لێبێنەو دەست بە خواردن‌و خواردنەوە بکە. پاشان تۆش ئازادی، چ دەکەی بکە، بەڵام تخووبی کۆڕو کۆبوونەوەکان مەبەزێنە. کەسانی لە خۆت گەورەتر بێزار مەکە. هەستی کەس بریندار نەکەی. کەسیش بە کەم نەزانی – خودا هەموومانی وەك یێك دروست کردووە، خۆت لە کەس گەورەتر مەگرە؛ کوڕم، بزانە کە ژیان هەڵوێستە و هەڵوەستەی دەوێت!' بەڵام ئێستا ئەو قسانەی دایکم بۆ ئەم کاتەی من ناگونجێت؛ چونکە خودا، لە بەشێکی ئایەتی ٩، لە سورەتی (الزمـــر) دەفـــەرمێت: ﴿... قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ...﴾" ئێستا من لەناو ئەم خەڵکەدا زانایێکم خودا وەپێش نەزانانی خستوومە، جا با هەر ئەوانە نەزانن کەمن نەك هەر خوێندەوارم، بەڵکوو مەلاشم، لەم ناوەدا، مەلای دووانزدە عیلم تەنیا خۆمم.

لەو یادگارە خۆش و بەپێزانەدا دەژیام کە دیتم ئاغەی جوامێر بە شێنەیی پیاڵەکەی بۆ لێوی خۆی بردو چاویشی هەر لەمن بوو. ویستم منیش دەستم بۆ چایەکەم ببەم، بەڵام هێشتا پیاڵەکەم بڵند نەکردبوو و ئەویش لێوی لە پیاڵەکە نەدابوو کە زەینێکی دیکەی دامێ‌و چاوەکانی زەق کردنەوە و لە هیکڕا پرسی – "ئەرێ ئەمن لەناوی تووم پرسی؟ ناوت چییە؟" ئاغە قسەی دەکردو سەیری ئاکارو ڕەنگ‌و ڕووی دەکردم؛ ئەرێ ئەم پیاوە گەرەکییەتی من بکڕێت یان دەمفرۆشێت!

"ناوم حەمەیە!" لە وەڵامیدا وتم - "من لە بنەڕەتدا ناوم محمد بووە، بەڵام هەر لەمنداڵییەوە و لەبەر خۆشەویستی، دایکم بانگی کردوومە - حەمە!" بۆ ئاغە ڕوونم کردەوە.

"ئەتوو چی؟ لە چ دەگەڕێی؟ لۆ ڕێت کەتە ئەو گوندە لاچەپەی مە؟ کێ ئەتووی لۆ ئەو ناوە هینا؟ لە کێڕا هاتی؟ چەندە بە ڕێوە بووی هەتا گەیشتییە ئەو ناوە؟ کێ باسی ئێرەی لۆ کردی؟" کە ئاغە ئەو هەموو پرسیارانەی لێکردم هەستم کرد کە پرسیار لە پرسیاری پاش خۆی گیر دەبوو. بەڵام زانیم ڕاوەستاو پرسیاری نەما، یان هیچی دیکەی بۆ نەهات تا لێم بپرسێت، ئیتر منیش، زۆر بەڕێزەوە، بەکورتی وەڵامیم داوەو وتم –

"لە ئیش دەگەڕێم، براگەورە."

"چ دەزانی؟" پرسیاری کرد، "لە چ پسپۆری؟ لە چ شارەزای؟ پێشتر چ کارە بووی؟ هەنووکە! تەمای چت هەیە؟ ڕێبواری‌و بێرەدا ڕەت دەبی یان پێتخۆشە لێرە گیربی؟" دیسان قەتارەیێك پرسیاری لێکردم. منیش هەڵوەستەیێکم کردو ویستم کاتێك بەخۆم بدەم‌و بیر لە وەڵامێکدا بکەمەوە کە ئەم پیاوە قایل بکات. ڕاستییەکەی پێبڵێم؟ ئەگەر وا بکەم ڕەنگە کاریگەری لەئایندەم بکات‌و بۆ زرگوێز بمنێرێتەوە؛ پێمخۆشە بچمەوەو

خاکی زرگوێز ماچ بکەم؛ لێ بەڵێ نازانم چارەنووسم چی دەبێتو خۆشم چیم لێدێت! ڕەنگە لە دارم بدەن، هەڵمواسن، پارچە پارچەم بکەن. ئەگەر ئاواشم لێبکەن ڕەنگە دڵیان ئاو نەخواتەوە؛ ئاخر ئەو خزمانە، ڕاستە خزمی نزیكو ئامۆزام بوون، لێ ئەوانیش، وەك خۆم، هێشتا برینەکەیان گەرمەو منیش، لەناویاندا، بێ پشتو پەناو بێ دەسەڵات ماومەتەوە. بەڵام ڕۆژێك هەردێت، جا با لەسەردەمانی منیشدا نەبێت، منداڵو نەوەکانم دەچنەوە خاکی خۆیانو هی باپیرانیانو بە مامو ئامۆزاکانیان شاد دەبنەوە.

"بیر لە چ دەکەیەوە؟" ئاغە لێی پرسیم، "چ دەزانی؟" لە قسەکردنەکەی دیاربوو کە خەریك بوو ئارامی نەدەما، "کورە، ئەتوو! خیندەواریت هەیە؟" ئاغە بە توندی لێی پرسیم.

"نەخێر." وەڵامی برایم ئاغەم داوە، "من شوانم، بەڵام خۆ شوانییەکەش بە باشی نازانم، هەر بۆیێ بۆم نەکرا مل لەبەر ملی شوانەکانی دێیەکەی خۆمان بنێمو ڕانە مەڕێك بە شوانیو بۆ بە خودانکردن گرەدەمو شوانییان بۆ بکەم." هەناسەیێکی قووڵم هەڵکێشاو پاشان گوتم – "بەڵێ، ئاغە! نەمتوانی وەپێش ئەوان شوانان بکەوم، جا بە ناچاری دێیەکەمانم جێهێشتو هاتوومە دا نان پەیدابکەمو لەشەرتی شوانی دەگەرێم. دەمەوێ شەرتێکم وەدەست بکەوێو ژیانم پێی بگوزەرێنم."

نەمتوانی چیتر دان بەخۆمدا بگرم، چونکە دەمزانی وا درۆ لەگەڵ ئەم جوامێرەدا دەکەم. دڵنیا بووم ئەم دانیشتنە دوو قوڵییە جێی درۆ و فریودان نەبوو، بەڵام چارم بێچارە بوو! دیار بوو، برایم ئاغە لەسەرەتاوە لە وەڵامەکانم بە گومان بوو! بەڵێ گومانی لێیان هەبوو، ئاخر گومانەکەی لە چاوەکانیدا دەتروووسکانەوە و منیش لەو سەرپۆشە شارەزا نەبووم تا زوو قسە ناڕاستەکانمی پێ پەردەپۆش کەم!

"ئەتوو بەڕاستیتە لە شەرتە شوانی دەگەڕێی؟" ئاغە لێی پرسیم.

"بەڵێ!"

"دەشرێی بێ سەوادم! خیندەواریت نییە؟ ئەدی کوو قسەکانت هەندە رێکن و وەکی هی کەسەکی نییە کە شوان بیو شوانی کردبی! پێم ئەنتیکەیە! باوەڕ ناکەم ئەتوو شوان بی! ئەتوو نابی شوانیت کردبی، مێوان، باوەڕم نایێ!" پرسیارەکانی ئاغەی نەدەبڕانەوە! بەسەر سڕمانێکەوە توانجی لە قسەکانم دەداو لێی دەپرسیم؛ گومانی لەسەر بەدەری قسەکانم پەیدا کردبوو - "ئەگەر شوان بی، کوو دەبی ئەو ئەسپە ڕەسەنەی دەرێی لە بندا بی؟ لە کێی بوو هەتا سواری بی؟ خۆ بەوەش ناچی کە دز بی! پێشتر گۆتت ئەو ئەسپەی دەرێ هی خۆتە، وە نییە؟" برایم ئاغە سەری خۆی بادەداو پرسیاری دەکرد، هەر چی دەکرد بۆی نەدەگونجا، ئاخر رێك نەدەکەوت؛ قسەکانی منی پێ قووت نەدەدرا؛ ئەو هەموو نارێکییەی باری من ناچنە بن سەوەشێرێك و داناپۆشرێن و ناشرێنەوە! ئاخر کەسێك فێری شتی نامۆ نەبێت، کە خۆی لە نامۆیی دەدات، وەك درۆزن نییە، نارێك دەردەکەوێتو دەشێوێت! "دەبێ من ئێستاکە پەشۆکا بم؟ دەبێ ئاغە شلەژانەکەی لە چاوەکانمدا ببینێت؟ ئای لەم ئابڕوو چوونە!" لە دڵی خۆمدا بە خۆمم ووت. برایم ئاغە، خوا لێی ڕازی بێت، ئارامی نەمابوو، بۆیێ ڕانەوەستا تا وەڵامی بدەمەوەو گومانی بڕەوێنمەوە؛ جا هەر خۆی بابەتەکەی گۆڕیو بە ناقایلییەوە بابەتێکی جودای بۆ ڕاڤەکردمو ڕێیەکی دیکەی نیشاندام. ئەمەشیان هێمای بلیمەتی ئەو پیاوە بوو؛ چونکە ئەگەر ئەو بۆت نەهات، دەبێ تۆ بۆ لای ئەو بچیت؛ ژیان بەم چەشنە بەڕێوە دەچێتو لەگەڵ مندا، ئاغە ئەم بۆچوونەی پەسند کردو وتی:

"دەباشە دەی! ئەوە گەلەك باشە كە كەسانی وەكی توو ڕاستی بڕێن‌و باسی كەم‌و كوڕی خۆیان بكەن‌و نەترسێن." برایم ئاغە بێنی بە قسەكانم كرابووەوەو سەودای هەستابوو، "بەڕاستی ئەو قسەیەی تووم پێخۆشە؛ شوانە، خەركی ئێرە وەها تێدەگەن كە لەهەموو شتەكی پسپۆڕن‌و كەس لەخۆیان شارەزاترو ئاقرتر نییە. ئەوە ئەو نەهامەتییەیە كە ئەو كوردە ڕەش و ڕووتەی ئێمەمانی تێكەتییە." ئاغە بە ناسۆرەوە ئەوەی لە ناخیدا بوو گوتی‌و بۆی هەڵڕێشتم.

برایم ئاغە كابرایێكی ڕاست دیار بوو، بۆیێ ڕای لەو ڕاستییەی هەبوو كە من سەبارەت بە ناپسپۆڕی خۆم بۆیم باسكرد؛ شادمانی كرد، بەڵام هێشتا دڵی دانەكەوتبوو؛ چونكە گومانی ئەو لەوەدا بوو ئایا من خوێندەوارم یان نا؟ بەڕاستی من خۆشم هەندەم گوتبوو كە نەخوێندەوارم، تا ئاوای لێهاتبوو زۆری نەمابوو ببێتە یەقینی خۆم كە ڕاستە؛ من نە خوێندەوارم‌و هەر چم دەزانی لەبیرم بچێتەوە!

"شارەزاییت لەو گوندەی مەدا هەیە؟" ئاغەی مەنتك لێی پرسیم.

"نەخێر!" گوتم، "ئەوەی ڕاستی بێت ئەوەیە كە من هێشتا ناوەكەشی نازانم چییە!" بۆم ڕوون كردەوە.

"قەت گێت لەناوی 'دووشیوان' بووە؟" پرسی.

"نەخێر، ئاغە." لە وەڵامیدا گوتم:

ئیتر ئاغەی مەنتك گرژییەوە، سەری خۆی لەقاند، زەینێكی ئاوای دامێ زۆر شتی تێگەیاندم‌و فەرمووی – "گەنجۆ، ئەو گوندە ناوی دووشیوانە." پاشتر پرسی – "ئەدی ئەتوو لە چ گوندەكیڕا هاتی؟ لۆیێ لێت دەپرسم چونكە ئەو قسانەی ئەتوو دەیانكەی خۆمانە نینە! لەو نێزیكانەی

ئـەو نـاوە، گـێم لەکـەس نـەبووەوەکی تـوو ئاخـاوتبی. شـێوەی زمانەکـەت کوردانەیە." ڕوونی کردەوە.

"من خەڵکی جافایەتیم، من جافم، تیلەکۆمە." وەڵامم داوە.

"شوان!" ئاغە بەسەرسـڕمانێکەوە پرسـی، "لـە گوندەکـەینگۆ مێگەلـە مەڕەك یان گاڕانەك ڕەشە وراغ یان کۆزەك کارو بەرخ نەبوو بیلەوەڕێنی‌و بـە خۆو بەو ئەسپەوە نێیە ئێرەو خزم‌و کەسی خۆت بـە جێنێلی؟ نەتبیسـتییە دەگۆترێ 'بەرد لەجێی خۆی گرانە؟'" بـرایم ئاغـە ئـەو دوو قسانەی دووایـی بەتوندی کردو پاشان بەشێنەییەکەی جارانی فـەرمووی — "دەتتـوانی لـەناو قەوم‌و قیلەی خۆتدا بمینێیەوەو پشتی خـۆت چۆل نەکـەی؛ نـەکا نامـەردەك دەستی بەسەرتدا بشکێت‌و زەفەرت پێ بباو گورزەکت لـێ بوەشێنی." بـرایم ئاغا بـە دڵـی پـڕو بـە گـەرمی ئـەو ئامۆژگارییانـەی کـردم — "ئـەوەی ئـەتوو کردیتە، گەلۆ، کارەکی باش نییـەو پـڕ ترسـە؛ بزانـە پیـاوی بـێ خـاك دەسـتی نارِوا، زمانی ناگەڕێ، بە زگی خۆی تێـر نـان نـابی، بـە دری خـۆی نـانوی؛ نـە لەزەت لـەجوانی دەبـینی‌و نـە تـام لەخۆشـی دەکا؛ کاکـە، کورد دەرێ — 'شام شەکرە، بەرام شارەکەم شیرنترە!'" ئاغە ئامۆژگاری دەکردم‌و هێندەی نەمابوو داوام لێبکا بچمەوە ناو کەس‌و کاری خۆم و وتی — "ئـەتوو هێشتا جاحێری، قەدت نەرمە، شارەزای دنیایێ نی، نازانی زۆر ئارۆزە. ئەدی ئەو ئەسپە چییە پێتە؟ گۆتت — هی خۆمە؟ درنیام بکەوە." داوای لێکردم.

ئاغە کابرایێکی بیرمەند بوو، لەدوو لای دژ بـە یێکـەوە بـۆم دەهات و بنکۆڵی دەکردم تـا لـە بـن زمـانم تێبگـا و لـە هەقیقـەتی مـن دڵنیـا بێت. کـە ڕاسـتییەکانیش دەرکـەوتن ئـیتر قەواڵـە بـەتاڵ دەبێـت! منـیش، بـۆ پەردەپۆشـکردنی بابەتەکـەم ناچـار بـووم وەڵـامی بـرایم ئاغـەی مـەنتك بدەمەوەو پێی بڵێم:

"ئاغە! سوێند خواردن پەسند نییە، بەڵام بۆ ئەوەی تێمبگەی ئەو سوێندەت بۆ دەخۆم – بەو خوایەی بەڕاستی دەناسی، ئەو ئەسپە هی خۆمە. ئەسپی باوکی‌و ماینەکەی دایکیشی هەر هی ئێمە بووینەو کەس ماف بەسەریانەوە نەبووەو نییە." ئەمانەم گوت‌و ڕاوەستام. لە ناکاوڕا، هەزار بیرم بۆ هات، بەڵام گوێم پێیان نەدا و قسەکانی خۆمم تەواو کرد، ئاخر ئاغە گوێی بۆ شل کردبووم؛ جا وتم – "من خۆم شوانەوێڵەم،" دووپاتم کردەوە، "شوانانیش لە گوندەکەی ئێمە فرە زۆر بوون‌و من بۆم نەکرا مل لەبەر ملیان بنێم. بۆ ئەوەی شوانێك شەرتێکی بەدەست بکەوێ، دەبوو، ئەو شوانە بێت‌و ملەبڕکێ بکات‌و ژیانیش پێویستی بە کارکردنە؛ ئەگەر کار نەکەی سەربەرز ناژی." ویستم سەرنجی ئاغا لە بابەتی ئەسپەکەم دوور بخەمەوە و بە ئاراستەی ژیان و ئازارەکانی ڕاپێچی بدەم؛ بەرام ئاغە باش لە قسەکانم تێگەیشت، بۆیێ بێ هەڵوەستە کردن لێی پرسیم:

"لەو قسانەی دەیانکەی، مێوان، مەرامت چییە؟"

"شوانی شارەزا و پسپۆر هەندە زۆر بوون هیچ کەلەنێکیان بۆ نەهێشتبوومەوە تا خۆی تێدا گیر بکەم‌و شەرتانەیێکم وەدەست بکەوێ. هەموو لەمن باشتر ڕانەکانیان دەلەوەڕاند و ئاژەڵەکانیان پەروەردە دەکردن؛ من لە چاو ئەوان، هیچم لە باخەڵێدا نەبوو. ساوای بەر مەمکان بووم!" بە هەناسەیێکی ساردەوە دەردی دڵی خۆمم بۆی هەڵڕشت و گەرەکم بوو هێشتا قسەی بۆ بکەم، بەڵام ئاغە نەیهێشت و گوتی –

"ڕوارەت و قسەکانت گەلەك لێکدی دوورن!" ئینجا برایم ئاغە قومێکی لە قەلنەکەی هەڵمژی و داما، پاشان فەرمووی – "وا تێگەیشتم ئامانجی دیکەت لە قسەکانتدا هەبوو. شوانە، ئەتوو، لە تەتەرە کردنی قسە تەماوییەکانتدا، گەلەك شارەزای، دەبی ئەوە بڕێم کە ئەتوو قەت پێناچی

شوان بی!" ئاغە بۆی ڕوون کردمەوە و بە قسەکانی خۆیدا چوو و گوتی، "بەرام هەرچی هەبی، گێت لێم بی، ئەمن، لە ژیانی خۆمدا، زۆر دۆغریمە، ڕاستم، خودا باش دەناسم؛ ئەو لا ئەو لا لە کنە من نییە. قەت نەکەی، لە کن دۆستو دوژمنان، تیر و توانج لە خێزان و خزمانی خۆت بدەی." ئاغە بە هەستکردن بە داخ و بە ژانەوە ئەوەی درکاند؛ بەڵام من دەسەڵاتی ئەوەم نەبوو لێی بپرسم دەردی دڵی چ بوو، چونکە ئەویش دەردی گرانی هەبوو، بەڵام خستبوونییە پەنای دیواری بەرینی ژیان و وەك هەموو کەسێکی جوامێر و گرانبەهاو داناو لێزان دەردی دڵی خۆی ئاشکرا نەدەکردن. ڕەنگە کەسانێك هەبووبن پێیان خۆش بێت خەونیش بە ئازاردانی خەڵکییەوە ببینن، جا با ئەو خەڵکە، هەر کەسی خۆیان بێت!

"ئەمر دەکەی، کاکە." ئەمەم وەڵام داوە و لە ناخڕاش ئارەقەی ڕەش و شینم کردبوو لیکاوی خۆم قووت دەداوە و منگاندم.

"ئەی لەو شەرمەزارییەی! ئەو پیاوە فرە هوشیار و ژیرە و لە بنی قسەکان دەگات و دەبێ لێرەوە لە قسەکانم وریا بم و لەسەرەندیان بدەم ئینجا بیانبێژم. برایم ئاغە چەند زیرەکە، هێشتا داناتر و بەڕێزتریشە." پاش ئەو هەموو مشتومڕەی لەگەڵ خۆممدا کرد، ئیتر بڕیارم دا خۆم لە بابەتەکە بدزمەوە؛ بۆیێ ڕوونم کردەوە.

"من بە باشە باسم کردوون،" ئەمەم گوتو پێدا چووم، "هەموویانم لەخۆم بە باڵاتر ناساندن، بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێم، من لەناویان بێ پشت و پەنا بووم؛ بۆیێ لەوێ دەرچووم تا لە پیشەیێك بگەڕێم..." ویستم هێشتا پاکانە بۆ خۆم بکەم، بەس ئاغە تێیگەیاندم تا چیتر بابەتەکە کاوێژ نەکەمو پێیدا نەچمەوە. پاشان ئاغە شەپێکی لەسەرینەکەی بن ڕانی خۆی دا، ئاماژەی بۆ بەردەستەکانی کرد، کە وەك تیر ڕاوەستا بوونو ئامادەی

ڕاپەڕاندنی هەر فەرمانێك بوون تا لە زاری برایم مەنتك بێتە دەرەوە و ئەوان جێبەجێی بکەن.

"هەندەك ئاوی لۆ بینن، ماندییە." ئاغە بە دەنگە گڕەکەیەوە گوتی. ئینجا تەماشایەکی منی کردو پێکەنیو فەرمووی – "مێوان، کەمەك خۆت بحەسێنەوە، بالیفەکە لەخۆت نێزیك بکەوەو پاڕدەوە؛ شەرمێ مەکە!" ئاغە لێی خواستم تا نەختێك ئاشنا ببمەوەو منیش سەرینێکم ڕاکێشاو بە دیوارەکەم هەڵپەساردو پشتی خۆمم پێیدا. ژانی پاژنەکەم منی تاساندو زیرەی لەناخم بڵند کرد، بەڵام نەمهێشت گەلەك لە ئاغەی ئاشکرا بێت؛ چونکە دڵنیا بووم ئەگەر مرۆڤ نهێنی نەماو هەموو شاردراوەکانی، بۆ خەڵکی، ئاشکرا بوون، بایەخی لەناو ئەو کەسانە نامێنێت کە ئەو نهێنییانەی دەزانن؛ من لەناخی تاریکییەوە لە تروسکەیێك دەگەڕام کاتێك کە گوێم لە ئاغەی بوو پرسی:

"ئەگەر خەرمت نەبم، کە هاتییە ناو دیوەخانێ، دیتم دەشەلی، وەنییە؟" ئاغە هاتەوە سەر زەین و دیسانەکە لێی پرسیم – "هەنووکەش پێدەچی نەتوانی بەچاکی لەسەر لای چەپەت دانیشی. چتە؟ چت لێیە؟ چت لێ هاتییە، شوانە؟" ئاغە پرسیاری لێ دەباری.

"بەڵێ، کاکە!" وەڵامی برایم ئاغەم داوە، "پێم ئازاری هەیە، بەڵام ئومێد دەکەم زوو چاك بێتەوە."

برایم ئاغە بە ئومێد خواستنەکەی من قایل نەبوو! لەلای برایم ئاغە قسەوەك ئیش و کار نەبوو؛ دوو شتی لە یێکتر دوور بوون؛ وەکوو یێکتر نەبوونو نەشدەبوونە یێك، هەر بۆیێ ئەوانەی ئیش دەکەن لەناو کۆمەڵ سەنگینترن لەوانەی نەزانن و قسانیش دەکەنو زمانەکانیان کاسبکاران بریندار دەکەن!

"هەموو ئومێدەك بۆ ئینسانی جێبەجێ نابی!" دانای مەنتکان گوتی، "هەندەك برین هەنە ئەگەر لێیان بگەڕێی تەشەنە دەکەنو بریندار دەکوژن. دەبی برینەکەت تیمار بکرێ، شوانە!" ئاغە ئەمەی گوتو جەختی کردەوە کە نابێ بهێلین برینەکان تەشەنە بکەن و لێمان پیس ببن – "ئەگەر نا برینەکەت لێ ئەستوور دەبیو کێم دەکا، ئەوجا دەبی یان لاقت ببڕیتەوە یانیش ئەوەتە دەتکوژی و ژیانت دەبڕیتەوە." برایم ئاغە فەرمووی، "ئەگەر ئەتوو چارەی وی نەکەی، ئەو چارەی توو دەکا. نابی بە تەمای خوای وازی لێبینی، خوا لە ئایەتی ٣٩، لە سورەتی (النجم)دا، دەفەرمی – {وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَىٰ}" برایم ئاغە گوتیو ئیتر لەلام گەلەك گەورەتر بوو. ئاغە هەڵوەستەیێکی دوور و درێژی لە قسەکانیدا کردو بە ئاشکرا، لێی دیار بوو پڕ بە دڵ گەرەکی بوو شتێکی تازە لێم وەدەست بێنێت، بەڵام من نە مرازم بوو، نە ئەو هێزەشم لەبەردا مابوو پتر قسان بکەم؛ جا بە ناچاری وەڵامیم داوە و وتم:

"بەڵێ." پاشتر، بێدەنگ دامام.

" شوان، مەعنای ئەو ئایەتە دەزانی کە لۆتم خیندەوە؟" ئاغە دەگرژییەوە کە ئەم پرسیارەی کردو پاشان گوتی، "ئەوە ئایەتی قورئانە و خوا پێمان دەرێ – ئەوەی مرۆڤ بە دوایدا نەبی بەدەستی ناکەوی." ئاغە ئایەتەکەی ڕاڤە کردو بەمە زانیم ئەم پیاوە هەر ئاغە نییەو بڕاوە! بەڵکوو برایم ئاغەی مەنتك مەلایەو قسەزان و سەرکردەو هاریکارە! پیاوێکە هاوشێوەی لەناو خەڵکیدا، ئەگەر هەشبێت، کەمە!

برایم ئاغە لە ئەوپەڕی سەرەوەی دیوەخانێ دانیشتبوو. هەڵسوکەوتی، بێ هیچ ئاخافتنێك، بە هەمووانی نیشان دەداو تێیدەگەیاندن کە خۆی براگەورەی ئەو گوندە بوو؛ لەو گوندە کەس لە هەورازی ئەودا

نــەبوو. ژووری دیوەخانەکــە بــە قــاڵییێکی ســەرەندازی ڕازاوەی کــوردی داپۆشــرابوو؛ هەنــدێك نیگــاری تێــدابوو هــەر تەونچــی کــورد دەیزانــی ئــەو نەخشە بنەخشێنێ. مافوورەکە نیشانی میوانانی ئەم دیوەخانەی دەدا کە ئەم پیاوە چەندە نەریتی کوردەواری خۆی گەرەك بوو و کورد چ جۆرە شارستانییێکی هەبوو. ئاغە، ئەمجارەیان، لە ڕێبازێکی تازە پەیداوە بۆم هات، بۆ ئەوەی خۆی بە چاکی بە من بناسێنێت، گەرەکی بوو هەندەك قسان بکات؛ جا ناچار بوو زنجیرەی خەیاڵە پڵاوەکەم بپسێنێت.

"شوانە!" ئاغە فەرمووی، "ئەمن، برایم ئاغەی مەنتکم. سەرۆکی عەشیرەتەکەم." ئەمەی گوتو هەڵوەستەییێکی کردو تەماشای ئەم لا و ئەو لای جڤاتەکەی کرد، دەیویست بزانێت کەس هەیە بە برِیای ئەو قایل نەبێت. بەڵام برایم ئاغە کەسی نەدیتەوە، بۆیێ هەناسەییێکی پڕ لە حەسانەوەی هەڵکێشا.

"شانازو شەرەفمەندم کە بەخزمەت بەڕێزتان گەیشتم، ئاغە." لە وەڵامیدا زۆر بە نزمییەوە گوتم، ئاخر لەبەر زەبری نەشتەری ماندوێتی و ژانی پاژنە براوەکەم و لەبەر چۆڕانەوەی خوێن لەبرینەکەم، خەریکبوو لە هۆشی خۆم دەچووم و دەبوورامەوە!

"شەرتەکی شوانیت لەگەر دەکەم،" ئاغە بەم قسانەی بۆم هاتە پێشو دەیویست سەرنجم لە ئێش و ئازار و ماندوێتییەکەم دوور بخاتەوە و لە بیریانم بباتەوە و فەرمووی – "هەتا شەرتەکەشت هەردێ، بە خۆم تەماشای ئیشەکەت دەکەم. دەبی بزانم شوانییەکەت کوو دەکەی. بزانم کوو ئاگات لە مەڕەکانم دەبی. کوو مێگەلەکە ڕادەدەی. کوو ئالیکیان دەدەی. کوو ئاویان دەدەی. کوو بێرێ دەکەی. دەبی بزانم کوو ئیشەکەت ڕادەپەڕینی. کوو خۆت شارەزاتر دەکەی. دەبی لۆم بسەلمێنی کەینێ شوانەکی پسپۆرت لێ

دەردەچی. پێشت دەڵێم، بەپێی قسەکانیشت، دیارە جاحێرەکی وریای و زۆر و زوو لە شوانکارییەکەت سەردەکەوی و ترست لێ نییە." ئاغە قسەکانی بە دڵنیاییەوە دەکردو هەرگیز زەردەخەنەکەشی لە لێوانی بزر نەدەبوو؛ هەر لەسەر لێوانی مابوو؛ ئەوەی بە زمان نەیدەگوت، زەردەخەنەکەی بە دەری دەخست و لە ئاغەی ڕوون و ئاشکار بوو کە من هەرگیز شوانەتیم نەکردووەو بێگومان بوو من شوان نەبووم بەڵکوو شتێکی تر بووم؛ لەلای برایم ئاغە، من لە شوان زۆرزانتر بووم، بەڵام، بێ بەڵگە، سەلماندن ئەستەمە! بۆیێ برایم ئاغەی مەنتك، وەك زانا لە بەڵگەیێك دەگەڕا و تا ئەم ساتەش بەڵگەی درەوشاوەم بۆ هەڵنەداوەتەوە و باش تێگەیشتم، ئاغە گەرەکییەتی هانم بدا تا زوو چاك ببمەوە و پاشان ڕەنگە نهێنی دیکەشم پێ ئاشکرا بکات، بەڵام دەبوو تا برینەکەم تیمار دەبێت ئاغە چاوەڕوان بێت، خەمبار و بێ سەلیقە ناکرێ بڕیار بدا!

دانیشتن لەگەڵ ئەم جوامێرە تامێکی تایبەتی مەلایانەی ئاغایانەی هەبوو؛ بۆیێ بووم بۆم نەدەکرا لەگەڵ ئەم پیاوە بڕ بکەمو بەپێی بڕیارەکانی ئەو بڕشتم هەبێت؛ لێ لە ناچاریدا دەگەڵی مامەوە و پێیم ووت:

"ئەمە ڕاستە، ئاغە،" ئەمەم گوتو هەڵوەستەیێکم کرد، پاشان هاتمەوە قسەو بەدەنگێکی نزمەوە وتم – "منیش تا ئەوپەڕ هەوڵ دەدەم بە باشی ئیشەکە فێر ببم. لەبری ئەو هەموو یارمەتییەی کە بۆم ساز دەکەی فرە سوپاسگوزارتانم؛ ئەو هەموو ئامۆژگارییانەی کە دەمکەن، وایان دەخوێنمەوە کە بۆ ئەوەیە تا ڕێگەکەم بەچاکی شارەزا ببم، خودا پاداشتت بداتەوە." قسەکانم کردو چاوی خۆمم لەبەر نا؛ چونکە نەمزانی وەك زۆرینە قسەکانم بکەمو دەمزانیش برایم ئاغەی مەنتك لە قافێك دەگەڕا تا لە فاقم دا!

هێشتا باڵندە هەر لە ئاسمانێ بوو کە ئەو پیاوە دەیزانی ئەو باڵندەیەی بەو ناوەدا دەفڕێت لەکوێ دەنیشێتەوەو لەسەر کام لقەدار، هێلانە بۆ خۆی دروست دەکات، هاتمە سەر ئەو گومانەش کە تەنانەت بشزانێ، باڵندەکە نێرەیە یان مێیە! برایم ئاغە زۆر بە شێنەیی‌و بە وریایی، وشە بە وشەی گۆتەکانی منی شی دەکردنەوەو لێیان ورد دەبووەوە. ناوە ناوەش، لەپاش هەر قسەیێك کە دەمکرد، زەردەخەنەیێك بەسەر لێوەکانیدا ڕەت دەبوو. ئەو خەندانەی ئاغە دەیکردن، زۆریان تێدا هەبوو، زۆریان پێدەگوتم. کە ئاغە دەگرژییەوە، دەمزانی دیسان لەئەندازەی خۆمدا نەمابووم‌و خەریکبووم زیخی بن ئاوێم بۆ ئەو پیاوە دەردەخست. ئاخر، هەرچی دەمکردو دووبارە دەمکردنەوە نەمدەتوانی بە چرو پرو بەباشی، بچمە ناو پێستی شوانێکی نەخوێندەوارو وەك کەسێکی بێ پەروەردەو ئامۆژش نەکراوی، سەر لەبەر هەتاوێ سپیکردە، بدوێم. نەمدەزانی چۆن زاراوەی مەڕدارێکی نەخوێندەوار لەجێی خۆیدا بڵێم.

کاکە، خودا لەئایەتی ١٦، لە سورەتی (الرعد)، لە قورئانی پیرۆزدا، دەفەرمی – ﴿ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الْأَعْمَىٰ وَالْبَصِيرُ أَمْ هَلْ تَسْتَوِي الظُّلُمَاتُ وَالنُّورُ؟﴾ – 'ئایا بیناو نابینا یێکسان دەبن یان ئایا تاریکی‌و ڕووناهی وەکوو یێکتر دەبن؟' خوێندەوارو نەخوێندەوار وەك گوڵستان و بیابانن. خوێندەوار مەحاڵە دابەزێتە پلەی نەخوێندەوارێك، مەگەر بە مێچکە مێچکیش بێت. شوانەکان نەخوێندەوارو کۆڵەوار بوون‌و شێوەی قسەکردن و ڕەفتاریان دیار بوو، کەچی زمانی من پوخت بوو، زوو دەردەکەوت کە زمانی نەخوێندەوار نەبوو. لەگەڵ ئەمەشدا برایم ئاغە لەمە پتری دەربارەی زمانەکەم نەگوت کە پێشتر باسی کردبوو، بەڵکوو بۆ دووەمین و سێیەمین جار وەخێری هێنام.

منیش ویستم هەستمەوە سەر پێیان، تا ڕیزی پێویست لەخۆی‌و لە قسەکانی ئەو جوامێرە گەورەیە بگرم.

"هەرمەستەوە، نەکەی!" برایم ئاغە گوتی، "پێویست نییە هەستییەوە، دەزانم ئێش و ئازارەکی زۆرت هەیە." پاشان هەڵوەستەیێکی کرد، ئینجا گوتی، "دەتوانی لێرە، لە دووشیوانێدا، بمینێیەوە تا برینەکەت تیمار دەبی، کە برینەکەشت ژانی شکاو قەتماغەکەی لەسەر هەستا، ئەوجا بە مام پیرۆت، شوانە پیرەکەی خۆمان، دەرێم، هەتا چەند ڕۆژەکی، بتباتە ئەو دەشت‌و دەرە و شارەزای جێیەکانت بکا، ئاخر دەبی هەموو کەند و لەند و جۆم و خەرەند و برند و نەوییاتییەکانی ئەو ناوە، بناسی؛ ئەتوو ڕێچکە و پێچکە و پەنایەکانی ئەو دەشت‌و دەرو برندو نەوییانە شارەزا نی‌و ناوی کونج‌و کەلەکانی نازانی؛ دەبی هەموو ناوەکانیان وەکی ناوی خۆت فێر بی‌و بزانی جێیەکانیان لە کێنە، کێوو چیاو شاخەکانی کوونە؛ ئەوجا پێت دەرێن پسپۆر." برایم ئاغە گرژییەوەو بابەتەکەی بەم ڕستەیە بڕیەوەو گوتی — "ئەتووش لۆ ئەوەی جێت لەو ناوەدا ببیتەوە، دەبی بزانین کە پسپۆری‌و دەبی پسپۆرییەکەشت بسەلێنی!"

پاش ئەو توانجانەی، ئاغە بێنێکی خۆش ڕاوەستاو دیاربوو بیری دەکردەوە! پاشان بە پەنجەیێکی ئاماژەی داو بانگی کوڕێژگەیێکی لەڕو شڕو پێخاوسی کرد کەشانی خۆی بەدەرگای دیوەخانێ دابوو و کلاوە قوتەیێکی کۆنی خوری وەك ڕحەتی لەسەری خۆی نابوو و تەماشای ئەو هەراو هۆریایەی ناو دیوەخانەکەی دەکرد. کوڕەکە لە ئاغەی هاتە پێش‌و وەستا، پاشان زۆر بە نەرمی وتی: "بەرێ، ئاغە! لە خزمەتم!" ڕاوەستاو چاوەڕێی فەرمانی برایم ئاغەی بوو. برایم ئاغە لەسەر تا بن سەیری کوڕەکەی کردو پا شان وتی:

"ئەتوو کێی، کورە؟" ئاغە پرسی.

"بۆرە." کوڕیژگەکە وەڵامی داوە.

"دە تەماشایەکی بەر سێبەری دیوەخانێ بکە؛ بزانە ئێزرای تەبیب لەوێیە یان نییە؟" ئاغە فەرمانی بە بۆرەی دا.

"ئاغە، وا بزانم لەوێ نییە." بۆرە وەڵامی داوە و وتی – "بچم، لۆتی گاسکەم؟" کە ئاغەش بە پێشنیازەکەی بۆرەی قایل بوو، بۆرە تێیقوچاند و بە غاردان ڕۆیشت.

"هێڕە! وەرە بزانە چت پێدەرێم!" ئاغە بە دەنگێکی بەرز بانگی بۆرەی کرد تا بگەڕێتەوە؛ بەڵام بۆرە گوێی لێ نەبوو.

"کورە، بۆرە، وەرەوە، بۆرە! بۆرە!" یێکێک لەناو ئەوانەی لە دەرێ دانیشتبوون، هاواری لێ کرد.

بۆرە گەڕاوەو چوو لەبەر دەستی ئاغەی ڕاوەستاو نووزەی لەبەردا نەهات، دەتگوت دارە ڕاگیراوە.

"هێڕە! دەزانی لۆ چی دەچییە کن ئێزرای؟" ئاغە پرسی، "ئەمن پێم گۆتی چی پێدەرێی؟" ئاغە بە تووڕەیی وتی!

"نا وەڵڵا، ئاغە!" بۆرە وەڵامی داوە – "ئاخر هەر دەچووم و پێم دەگۆت ئاغە ئەتووی دەوێ و ئەویش دەهات." بۆرە بیانووی بۆ چوونە بێ ئاگادارییەکەی هێناوە.

"ئیشەك مەکە ئەگەر نەتزانی دووایییەکەی کوو دەبی! باشە؟ تێگەیشتی؟" ئاغە ئامۆژگاری کرد.

"نا وەلا، کاکە! هیچی تێنەگەیشتم." بۆرە وتی:

"هەی مار کاول؛ دە بڕەك گەورە بە!" ئاغە بە بۆرەی ووت:

"ما گەورە نیمە، ئاغە؟" بۆرە لە ئاغەی پرسی و کە ئاغەش وەڵامی نەداوە، هەر بە خۆی قسەکەی خۆی تەواو کردو وتی — "ئەرێ، لەوەی گەورەتر بم دەبمە چ؟" ئیتر ئەوانەی لەوێ ئامادە بوون، هەموویان، دایانە قاقای پێکەنین و زۆر نەمابوو 'لەسەر گازەڵەی پشتێ بکەون!' منیش لە بیری خۆمەوە گوتم — "هەی گەورەتر نەبی! ئاخر ئەمە لەبەرئەوەیە کە ئەم ناوەیان لێی ناوە!" سوپاسی خودام کرد کە منیش وەك بۆرە نەبووم!

"وەیە، وەیە؛" برایم ئاغە بە ناچاری وەڵامی داوە، "ئەتوو ڕاستی؛ چونکە لەوەی گەورەتر بی دەبییە دەعبا. دە باشە دەی." ئینجا ئاغە تێیگەیاند و پێی ووت: "هەنووکە ئاگات لەو قسانەم هەبی، بزانە چت پێدەرێم؛ هەرووو بە ئێزرای برێ با دەمودەست بێتە ئێرە و کەلوپەلی تەبیبایەتی و تیمارکردنی خۆی بینی. خۆی گیر نەکا، ئەتووش پرێسکەی کەلوپەلەکانی لۆ هەرگرە، نێلی ئەو هیچی هەرگری، باشە؟ نێلی گێلمەگێلمان بەسەردا بکا؛ با بیو پێی ئەو شوانەم لۆ تیمار بکا. باش تێگەیشتی؟" ئاغە لە بۆرەی پرسی.

"ئەرێ وەڵڵا، ئاغە!" بۆرە گوتی و ڕوونی کردەوە چ دەکاتو هەموو قسەکانی ئاغەی دووبارە کردنەوە و پاشان هەر بەڕاکردن ڕۆیی. گوێڕایەڵ کردنی براگەورە لەناو جڤاکی کوردەواریدا، نەریتێکی هەمیشەیەو لەناو ئەو گەلەدا جێبەجێکردنی قسەی گەوران، گەلەك لە خودی قسەکان گەورەترە چونکە دەبنە ئەرکو دەبێ فەراهەم بن. ئەم ڕەفتارەش یێك لە بنەمایەکانی بەیێکەوە مانی خێزانی کوردەوارییە.

## ئێزرای تەبیب

برایم ئاغە ڕووی قسەی لەمن کردو وتی: "پاشی ئەوەی کە ئەو تەبیبە برینەکەت تیمار دەکاو چا دەبییەوە، ئەوجا دەتوانی، بەخۆت، بەتەنیا، مێگەلەکە ڕادەی." ئاغە بە زەردەخەنەوە قسەکەی کردو تەماشای ناو گلێنەی چاوەکانی دەکردمو بۆ جاری سێیەم پرسیاری لێکردم – "ئەرێ، گۆتت ناوت چ بوو؟"

"عەمە!" وەڵامیم داوە.

"ئەدی پێشتر نەتگۆت ناوم ـحەمەـیە؟" ئاغە بە تەوسەوە لێی پرسیمو پاشان پرسییەوە – "ئەتوو بەڕاستی پێم بڕێ؛ ناوت عەمەیە یان حەمەیە؟" ئاغە دەگرژییەوە کە ئەم پرسیارەی لێکردم.

"ناوم محمدە پێم یێژن حەمە." وەڵامی ئاغەم داوە.

"حەمە! گێت لێبی،" ئاغە ئایەغی کردمەوە و وتی – "ئێزرا، برینان چارە دەکات، هەموو خەرکی ئەو ناوە خۆشیان دەوێ. کە نییە لە خێری دەستی ئەو تەبیبە جوولەکەیەی بەشی خۆی وەرنەگرتبی، ئاخر گەلەك شارەزایە؛ لۆیێ دەنێرمە دووی هەتا بێتە ئێرانە و برینەکەت لۆ تیمار بکا." ئاغە دڵنیای کردمەوەو پاشان ڕووی خۆی بەرەو ئەوانە وەرگێرا کە لە دیوەخانێدا بوونو قسەی لەگەڵ ئەواندا کردو لەباسی چاندنو بەرهەمو ئاژەڵداریو گوزەرانی خێزانەکانیانی لێ پرسین، مەڕو ماڵاتیشی لەبیر نەچوو. ئاغە هەر خەریکی قسەکانی بوو کاتێك کە پیرەمێردێك لە هیکڕا بە

ژووریٚ کەوتو هێشتا هەر دانەنیشتبوو کە دەگەڵ برایم ئاغەی دایە گاڵتە! لەپاش پیرەمێردەکەوە، بۆرە هاتەوەو هەموو پشتێنەکەی پرێسکەو شتی دیکەی لێوە بەسترابوو؛ لەوییەوە زانیم ئەوەی وا لەگەڵ ئاغەی دەودەوانیٚ دەکا، دەبێت بێگومان ئەو ئێزرایە تەبیبە بێت کە ئاغە باسی بۆ کردم. ئاخر بۆرە هەندەی پێنەچوو بوو، کە هاتەوەو لە دووای ئەو پیرەمێردە دەڕۆیی. کە بۆرە هاتە ژووریٚ، لەپشت کابرایێکی پیری کەنەفتەدا دەڕۆیشت. مەزەندەم کرد ئێزرا بێت؛ چونکە کڵاوێکی بچووکی لەسەریدا نابوو؛ کڵاوەکە لەدوورەوە ئەو سەرەی دەناساند کە لە بنیدا بوو! ئەو کابرای لە نزیکە من بوو بە گووێیدا چرپاندم و تێیگەیاندم کە چارەسەرم بۆ هات و ئەو پیرەمێردەی لە دوای بۆرەدا دەڕۆیشت پیرە ئێزرای تەبیب بوو.

ئەو کۆمەڵە بێکارەی کە لە دەرەوەی دیوەخانیٚ دانیشتبوون، هەموویان وەدووای کەوتن؛ تامەزرۆ بوون بزانن کابرای تەبیب چ لە نەخۆشەکە دەکات. ئاپۆڕەکە هەموو لە دووای تەبیبەکە، هاتنە ناو دیوەخانیٚ و لەو ناوە بە نارێکی ڕاوەستان؛ گەرەلاوژەیێکی زۆریان پەیدا کرد. کات باشەیان لە ئاغە و ئەوانی ژوورێدا نەکردو ڕیزیان لەهیچی ئەو جوامێر و پیر و سەر سپییانە نەنا کە لە پێشی ئەوان لە دیوەخانیٚ، دانیشتبوون. برایم ئاغە چاوی چووە پشتی سەری و بە تووڕەییەوە پێی گوتن تا دانیشن و لە پێش خەڵکی ڕانەوەستن، ئەوانیش هەموو وەك ئەوەی یێك کەس بنوێکرا و بە یێك جووڵە، دانیشتن و دەنگیان برا!

"کوڕینە!" ئاغە دەنگی خۆی هەڵبڕی‌و گوتی – " کە جارەکی دی دەچنە جێیەکی خەرکی لێیە، سەلامەکیان لیٚ بکەن. لە بیرتان بی، ئەگەر جارەکی دیکە ئەوها بە ڕەمەکی بێنە ژۆریٚ و سەلامەکی نەکەن، لێناگەڕێم

یێکەکتان لێرە دانیشی، هەی مردیتان نەمری!" ئاغە گەیشتبووە ئێسقانی؛ لە پێستی خۆی دەرچوو و هەڕەشەی کرد.

ئێزرا کابرایێکی پیر بوو. ددانی لە دەمیدا نەمابوو. چەنەگەی زۆری نەمابوو لە نووکی لوتی گیر بێتو بازنەیێك پەیدا بکەن. لە دیداری یێکەمی ئاشکرا بوو کە ئەو کابرایە بە گەنجێتی فرە قۆز بووە، بەڵام زەمان ڕەحمی نییە و مۆرکی خۆی لە ڕوخساری داوە؛ پشتی چەماندووەتەوە؛ ئەژنۆکانی بە لای دەرەوەدا دەرپەڕاندوونە؛ چاوەکانیشی بە ڕادەیێك کز کردوونە کە ڕەنگی بردوونە، هەر سپی هێشتوونەتەوە. ئەم جوامێرە لەڕە، ڕیش سپییە، ڕوخسار نەرمە چەند داوێکی سپی لە بن یارموڵکەی جوولەکەکانی دەرکەوتوونە.

یارموڵکە کڵاوێکە کوردو جوولەکە لەسەریان دەنێن. ئەم کلافەی ئێزرا، لێرەشدا پەسند و بەخشندە دەرکەوتووە؛ ڕێی بە چەند تەلە مووێکی سپی سەری ئەم پیرە جوولەکەیە داوە، تا ملیان درێژ بکەنەوە و سەریان بێننە دەرەوە و بەسەر مل و سینەیدا ڕاکشێن و دەگەڵ جوولانەوەی سەریدا ئەوانیش شایی خۆیان بگێڕن. ئەو تەڵە مووانەی لە بن یارموڵکەکەیدا سپیو درێژ، دیار بوون، دەتگوت بەفرن بە هەڵدێری شاخی سینەیدا خۆیان شۆڕکردووەتەوە.

تەڵە مووەکانی ئەبرۆی پیرەمێردەکە هێندە درێژ ببوونەوە کە بەر چاویان گرتبوو؛ بەسەر ڕوخساریدا شۆڕ ببوونەوە و هاتبوونە خوارێ؛ خەریك بوون بیناییان لێیان دادەپۆشت و نەیاندەهێلا بە باشی دنیای دەورو بەری ببینێ. ژیان ڕوخساری تژی کەند و کەلێنی نارێك کردبوو و ژمارەی مووەکانی ڕیشی ئەو هەندە کەم کردبوونەوە تا وای لێکردبوون، بێنە خەیاڵم کە دەتوانم یێکە یێکەی تەلە داوەکانی ڕیشی بژمێرم لێی بپرسم

چۆن هەر ئەو هەندە داوە بە ڕیشتەوە ماوە؟ لەگەڵ ئەم هەموو بگرەو بەردەی زەمان دەگەڵ ئەم مرۆڤەی کردووە، هێشتا چاوەکانی ترووسکەی ژیانێکی ئەستەمیان نیشان دەداو نەیاندەهێشت بە ئاسانی تەماشای نووری چاوەکانی بکەیت! مێژووی جوولەکەکانی دنیا، هەر لەسەردەمی فیرعەونی میسر و مووسا پێغەمبەرەوە تا ئێستا، هەمووی تێدا دیار بوو؛ باش سەیریانت بکردایە، بۆت ڕوون دەبووەوە کە پەیڕەودارانی ئەم دینە چەندە نەهامەتی و ترسیان بەدەست نەیارانی دینەکەیانەوە چێشتووە؛ مەگەر قەومی کورد هەندەی ئەوان چەوسێندرابێتەوە، ئەگەر نا نییە!

سەبارەت بەناوی "یار – موڵکە" واتەیێکە بە تێکهەڵکێشەی کوردی و عارەبی لە دوو وشە پەیدایە؛ یان ڕەنگە لەم ناوەدا، کوردی و عیبری تێکەڵەی یێکتری بووبن و ئەم ناوە تازەیەیان لێ پەیدا بوو بێت؛ (یار) کوردییەکی ڕەسەنە و واتای خۆشەویست و دۆست دەبەخشێت و (موڵك)یش عیبری – عارەبییە و کردارە سووکەکەی (ە)، لەپاش (موڵك) دێت، کوردییەو کاتی ئێستایە؛ ڕەنگیشە من لەمە سەرچیغ چووبم و هەبن بۆم ڕاستی بکەنەوە! ئەگەر لە دیوەکەی دیکەی هەردووك وشە وێکڕا، ورد ببینەوە، دەزانین کوردیش هەمان زاراوەی هەیەو بە کوردی واتای (یار – سامانە) دەگەیێنێت؛ بەڵام لێرەدا ئەگەری هەیەو دەبێت ئەو یارە دڵسۆز بێت. کورد وەك جوولەکە، یارموڵکە لەسەر دەنێن، بەڵام کورد لە جولەکانیان ڕەتداوە و جەمانەش لەسەر کڵافدا، دەپێچنەوەو لەسەرمای زستان و گەرمای هاوین و تۆزی مەڕداری و جەنگ فرۆشی دراوسێییەکانی، خاوەنەکەی دەپارێزێت.

کە بەوردی تەماشای یارموڵکەکەی ئێزرای تەبیبم کرد، وا بە ئەندێشەمدا هات کە ئەو یارموڵکەیەی جوولەکەی تەبیب، ڕەنگە هی سەردەمی نەبوخەدنەسر بووبێت. لەودەمی بەدەست باپیرانی ئێزرا کەوتووە

کە پادشای بابل جوولەکەکانی، بە ناهەق، لەخاکی ئیسرائیل بە دیلی گرتن‌و هێنایانی‌و لە کوردستان بڵاوەی پێکردن. بەڵام کورد، لەو زەمانیش هەر جوامێر بووەو هەموو ئاوارەکانی جوولەکەی وەرگرتنەوەو جیّ‌و ڕێیانی بۆ پەیدا کردن؛ ئەوانیش، بەجوانی هاتنەوە سەر کارەکانی خۆیان‌و ئابووری ئەم ناوەیان بەرەو پێشەوە برد.

کڵاوەکەی مام ئێزرا، وەك شوێنەوارێکی دیرۆکی دەهاتە بەرچاو؛ ڕەنگی سپیواژ ببووەوە، بەڵام هێشتا دەستی لەسەری ئەم پیاوە هەڵنەگرتبوو و وازی لە لووتکە نەهێنابوو و هەر لەهەمووان بەرزتر بوو. دختۆر تەماشای ئەملاو ئەولای خۆی کرد تا بزانیّ لە کویّ سەنگی ساڵانی سەر شانی بگەیێنیتە سەر زەوی‌و دابنیشێت؛ هەر کەس‌و لەلای خۆیەوە، وەك هێمایێکی ڕێزلێنان، خۆی لادا و شوێنیان بۆی کردەوە تا دابنیشێت و هەناسەیێك بدات، ئینجا سەیرێکی زامەکەم بکات. پاش ئەو هەموو گاڵتەیەی لەگەڵ ئاغەی کرد، وتی -

"شالۆم!" ئێزرا بە هەمووانی گوت‌و هەموو خەڵکەکەش، وێکڕا، وەڵامی سەلامەکەیان داوە. برایم ئاغەی مەنتك لەهەموو ئامادەبووانی هەربارد و لەبەر ئێزرا هەستا پێوە و بە خێرهاتنی کردو ئینجا پاشان لە تەندروستی پرسی. کە برایم ئاغە ڕابوو، ئەوانی لەویّ دانیشتبوون هەموویان، وەك برایم مەنتك، بۆ ڕیزلێنان لە ئێزرا، هەستانەوە. ئەمەش بە خۆڕایی نەبوو؛ ئاخر ئێزرا دوو ماف بەسەر ئەو کوردگەلەوە هەبوو، یێکەم کابرایێکی پیری کەنەفتەی خەڵکی گوندی دووشیوان بوو و دووەم نەخۆشی ئەو خەڵکەی بە خۆڕایی چارەسەر دەکردو هەرکات بۆ چارەسەرییان ئامادە بوو و پشتی ملی خۆی لە تیمارکردندا نەدەخوراند.

"مام ئێزرا!" ئیبراهیم ئاغە بانگی کردو دەستی بۆ شوێنێکی چۆڵی نزیکی من درێژ کرد، "ئەوە حەمەیە، مێوانی منە!" بەم شێوە نائاساییە منی بە ئێزرا ناساند هێشتا هەر بە پێوە بوون؛ هەموو پیاوەکانی ناو دیوەخانەکە، وەك برایم ئاغە و ئێزرا، ڕاوەستابوون، "برینی ئەم مێوانەم لۆ تیمار کە." برایم ئاغە پێی گوتو تێیگەیاند کە گەرەکییەتی برینەکەم زوو چارەسەر بێت.

"ئێزرا!" برایم ئاغە دکتۆرەکەی هۆشیار کردەوە و پێی ووت — "ئەوەی لەسەرتە لۆی بکە و ئەوەش لەسەر منە کەمتەرخەمیت لۆ ناکەم." ئاغە پێی گوتو بۆی ڕوون کردەوە کە دەیویست من چاك ببمەوە و بکەومەوە سەر پێیان و "چاکبوونەوەکەشی نابی لە حەفتەیەك پتری پێبچی." برایم ئاغە فەرمانی دا. ئیتر دانیشتەوە و هەموو خەڵکەکە پاشی ئاغەی دانیشتنەوە، و ئەم ڕەفتارەی ئەم مەنتکانە سەرنجی ڕاکێشام چونکە ئەمە یێکەمجار بوو خێڵێك بەم ڕەنگو ڕەفتارە پڕ ڕێزەوە ببێنم! جوان بوون! هەموویان جوان بوون!

"ئاغە!" ئێزرا بانگی کرد — "با جارێ برینی ئەو گەنجە قۆزە ببینم، لۆ ئەوەندە بە پەلەی، مار کاول نەبی!" ئێزرا بە ئاغەی گوتو جەختی بۆی کردەوە کە درێغی لە تیمارکردنی برینەکەم ناکاتو ئینجا تەماشای کردم؛ چاوەکانی لە چاوی هەڵۆ دەچوون، دەبێ هەموو جوولەکەیێك ئەم چاوانەی هەبێت؟ گومانم هەیە، خۆ ئەوانیش مرۆڤن و وەك هەموو خەڵکی دیکەنە و نابێت چاوەکانیشیان لەهەمووومان جیاواز بێت؛ ئاخر ئەوانیش مەخلوقی خودان لە ئێمە جودا نینە! لەم بێنەو بەردەیەدا بووم، کاتێك کە ئایەتی ١٣ی سورەتی (الحجرات)ی قورئانم وەبیر هاتەوە، دەڵێ — ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا، إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ

أَتْقَاكُمْ، إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾. – ئێمە ئێوەمان لە نێرینەیێك و لە مێیینەیێك داهێناوە و ئێوەمان کردووەتە گەلان و هۆزەکان، تا یەکتر بناسن، ئەوەی لەلای خودا لەهەمووتان باشترە ئەوە کە لەهەمووتان پتر لە خوا دەترسێت، خودا خۆی زانا و پسپۆرە.

"حەمۆکە!" ئێزرا زنجیرەی بیرکردنەوەکەی لێ بڕیم! لە قسەکردنەکەی لەگەڵ مندا، وا پێدەچوو کە لە مێژ بێت بمناسێتو برادەر بین – "با زەینەکی لەبرینەکەت بدەم، مێوان،" ئێزرا گوتی. "با بزانم قاپت چی لێهاتییە." ئێزرا، بە بایەخەوەو بە کوردییەکی شێوەزاری دەشتی هەولێر قسەی دەکرد؛ لە قسەکردنەکەشیدا وا پێدەچوو تا ناو مێشکی ناو ئێسقانەکانیشی کورد بێت.

منیش ئەو جەمانەیەم لادا کە لەناو عەرەبەکان، لەبرینەکەم لوول دابوو تا خوێنەکە بوەستێنێو نەشهێڵێ لەمە پیستر ببێت. جەمەدانییەکە بە تێکەڵەی خوێن و خۆڵ ڕەق بووبووەوە و وەك خشتێکی لێهاتبوو. ئێزرا بە تۆبزی توانی تەنیشتێکی جەمانەی سەر برینەکە هەڵداتەوە؛ کە لەو کەلەنەوە زەینی لەبرینەکەم دا، دەمی بەش بووەوە و قیژاندی! لەبەرئەوە هاواری لێ هەستا چونکە کە جەمانەکەم لەسەر لایەکی برینەکەم هەستا، دیسانە خوێن فریشکەی کردەوە؛ دەبوو ڕابگیرێت.

"کورە، ئاغە! برینەکەی گەورەیە؛ زۆر گەورەیە!" ئێزرا هاواری کرد – "ئەو برینە هی وەی نییە بە حەفتەکی تیمار ببی. ئیلۆهیم!" قیژاندی و هاواری خودای کرد.

برایم ئاغە ئارامی لێ هەلگیرا - "هەنووکە پێم برێ، زوو چا دەبتەوە یان نا؟" ئاغە پرسیاری کردو لە تیمارچییەکەی دووپات کردەوە و پێی گوت

– "دەبی تیماری بکەی. ئێزرا باسکی خۆت لێی هەرمارە و تیماری بکە و تەماشای هیچ مەکە!" ئاغە جەختی کردەوە.

"هێور بەوە، ئاغە، هێور!" پیرە جوولەکەکە گوتی – "جۆرە مەرهەمێکی لۆ ساز دەکەم برینەکەی تیمار بکا و نەیهێلی!" ئێزرا جەختی کردەوە، پاشان سەری هەڵبڕیو تەماشایەکی هەموو ئامادەبووانی کردو سەری داگرتەوە و گوتی – "ئاغە، ئەو ئیشەی بە تەنێ لۆ توو دەکەم. پێنج چەشنی باشترین پیازەرەی لۆ تێکەری پێکدی دەکەم؛ ئەوجا دەبینی چ لەبرینەکەی دەکاتن." ئێزرا بە متمانەوە قسەکانی دەکردو نازی لەسەر ئاغەی دەکرد – "برایمۆك، دەرمانی چاکم پێیە لەو وراتەی ئێرە، کەس دەرمانی ئەوهای نییە و نایبی." ئێزرا سەری بادەداو قسەکانی دەکرد؛ منیش کە تا ئەم ساتەی تەمەنم، لە کەسم نەمدیتووە و لە کەسیشم نەبیستووە بەمجۆرە بدوێن!

پاشان داوای لە بۆرەی کرد تا پرێسکەکەی پێ بدات و ئینجا ڕووی خۆی لە ئاغەی کردو پێی ووت:

"ئاغە!" برادەرانی توو، دۆستی خۆمن. گومانم نییە، ئەو برینە تیمار دەکەم؛ بەرام ڕەنگە وەختی زۆری بوێ، گومانت نەبی بە حەفتەکی تیمار نابی." ئێزرا گوتی و منیش دڵنیا بووم کە ئەو بڕینە ئەمە نەبوو خاس بێتەوە.

"دە باشە، پیرەمێرد!" برایم ئاغە گوتی – "جارێ ئەتوو تیماری بکە. ئەوجا خوا کەریمە!" ئاغە پێدەچوو پشووی نەمابێ، قیسکەی تەنگ ببوو، بەڵام چاری ناچار بوو ئارامی گرت، تیمارەکە پێویستی بە بێدەنگی و بە جاغی دەرمانەکانی ئێزراوە، هەبوو و بۆرەش پشتێنی خۆی لە جاغەکە

وەرئاڵاند بوو؛ ماوەییێکی پێچوو تا هەڵیوەشاندەوە و هەندێکیانی جودا کردەوە.

"کورە، نەتدەزانی دەبێ ئەو جاغە تەسلیمی دەستی من بکەیەوە؟" ئێزرا بە توندی لە بۆرەی ڕاخوڕی – "ئەوە لۆ ئەوها توند لە خۆتت بەستایتەوە، عەمر درێژ؟ هەر دەبی بمدەیەوە؟" ئێزرا پرسیاری لەپاش پرسیار دەردەکردو ئاراستەی بۆرەی دەکردن. بۆرەش، بە خاوەخاو، ماوەییێکی پێچوو هەتا پشتێنەکەی کردەوە و توورەگەیێی ئازاد کرد؛ لەو ماوەیەدا دکتۆر چاوەڕێ نەبوو، بەڵکوو هەر خەریك بوو تا پارچەکەی بە تەواوەتی لەبرینەکەم کردەوە و پێیە بێ پاژنەکەم کەمێك هەڵاوسا بوو و سوور ببووەوە.

"ئەرێ کوڕینە،" ئێزرا بە دەنگێکی مەیلەو بەرز هاوارێکی کرد – "کەس هەیە ئەو پیاوەتییە بکاتو هەندەك ئاوم لۆ بینی؟ با شیرتێن بی." ئەمەی خواست و ئیتر ڕووی لەخەڵکی ناو دیوەخانەکە کردو پێی ووتن – "توخوا هەمووتان لەناو دیوەخانێدا بمینێنەوە، فەیدی ناکا، بەرام، تو پێغەمبەران، بڕەك ئەو ناوەم لۆ چۆلکەن. هەتا پێمبکرێ ئیشەکە بکەمو ئەزیەتی ئەم گەنجەش نەدەم." ئینجا پێی ووتن – "کاکە! ئەو نەخۆشە پێویستی بە هەناسەدانە! ڕێی بدەنێ با بایەکی پاگژ هەرمژی."

ئێزرا بۆیێ ئەو داوایەی لە ئاپۆڕەی ناو دیوەخانەکە کرد چونکە لەهەر چوار لامەوە تێمومرهاتبوون و ڕێیان نەدەمدا هەناسە بدەم. خەڵکەکەش هیچ هەڵوستەییێکیان نەکردو یێکسەر کشانەوە و لە دوورەوە مانەوە و تەماشای خۆم و برینەکەیان دەکردم؛ کاتێك کە دکتۆرەکە سەیرێکی پاژنە براوەکەی کردم، هەموو ئەوانەی لەوێ بوون چاویان زەق بووەوە و هەندێکیشیان ئاخیان بۆ هەڵکێشام و هیتر هەبوو پەکووپەکوویان

بـوو و کەسانێکیشـیان هـەبوون هێڵنجیـان دەهـاتێ و بـە ئۆعـەئۆع دوور دەکەوتنەوە و دەچوونە دەرەوە. برینەکەم هی ئەوەی نـەبوو کەسـی کـەمزات تەماشای بکات.

دکتۆر مەسینەیێکی پڕ ئاوی بۆ هات، بەڵام داوای پتری کردو فەرمانی دا – "کوڕینە، خۆ ئاو بە پارە نییە؟ هەی مردیتـان نـەمری!" ئێـزرا تـەکانی دا گەنجەکان و پێی گوتن: "کوڕینـە! زەغـەل مـەبن، یێـك دوو گۆسـکە ئـاوی دیکەم لۆ بینن. خێرا بن، قوربانتان بم!"

هەر گەنجێك بە لایێکدا هەڵات و هەندەی نەبرد ئـاوی پێویسـتیان بـۆ ئێزرای هێنا. منیش هەر تەماشـای دەسـتیم دەکـرد؛ دیـار بـوو زەمـان زەبـری خۆی لە پیرە تەبیبەکە وەشاندبوو؛ دەستی دەلـەرزی! پەنجـەکانی بـە یـێکتری دەکەوتن! بەڵام چاك دیـار بـوو کـە لـە ئیشـەکەی خـۆی گەلـەك شـارەزا بـوو. برینەکەی بە خاوێنی و بە نەرمیو لەسەرەخۆ بە ئـاوە شـلەتینەکە شووشـت تـا ئـەوەی کـە هـەموو پیسـاتیو قەتماخەکـەی لەبرینەکـەم کـردەوە و تـەواو خاوێن بووەوەو هیچ پیساتییەکی پێوە نـەما. گۆشـتێکی سـوور وەدەر کـەوت؛ ئێسقانە بڕاوەکەی باوەشی برینەکە نیـوە مـابوو؛ نیـوەی لای پشـتەوەی قـوت ببوو؛ مێشکی نـاو ئێسـقانەکە ڕەش دەچووەوە. دیـار بـوو گڵمتێکـی گـەورەی گۆشتی پاژنەکەم ڕۆیی بوو و کـەرتێکی بچووکی ئێسقانەکەم جێمـابوو؛ وەك ئەوە وابوو کە بە ئارە بڕابێتەوە. ژانەکە مەزەندە نـەدەکرا، وەختبـوو ڕۆحـم دەربکات. جەسـتەم، وەك بـی نـاو ئـاو، دەلـەرزی! ئەگـەر شـەرمم لـەو هـەموو ئاپۆڕەیەی چواردەوری خۆم نەکردبا، هۆڕەهۆڕ دەگریام!

کە ئێزرا بە چاکیو بە پاکی، برینەکـەی دیـتمو چاوی بـە برینەکـەم کـەوت، قێژانـدیو وتـی – "ئیلـۆهیم!" پاشـان کـە دیـتی ئـاوا لەبـەر ژانـی

برینەکەم دەلەرزم، ویستی بمخافلێنێ و دەستی پێکرد مەزاقم لەگەڵدا بکاتو وتی:

"دەرێی لەبەر ئەو جۆرە برینە دەلەرزی؟" ئێزرا پێکەنی و پرسیارەکەی لەمن کرد – "کوڕێژگە! ئەمن جەوانم دیت تیر لە تەختەی سینگی دەرباز ببوو، بەرام وەکی تۆ ئەوها نە دەلەقییەوە! مردن؛ بەرام نەلەرزین." بە گاڵتەکردنێکەوە قسەکەی کردو لە قاقای پێکەنینی دا. ئەوانەی لەناو دیوەخانەکە دانیشتبوون‌و گوێیان لە قسەکانی مام ئێزرا گرتبوو، هەموویان دەنگی پێکەنینیان هات، من‌و برایم ئاغە نەبین! من ئازارەکەم لە مەزاق و فشەی کابرای جوولەکە کاریگەرتر بوو و دیاربوو ئاغەش گاڵتەی کاتی تەنگانەی، پێ پەسند نەبوو، ئاخر ڕابواردن پێویستی بە ئاسوودەییە! ئاغەی مەنتك ئارامی لێ بڕا و بە توندی لە ئێزرای قیڕاند.

"ئەرێ کابرا! ئاگات لێ نییە؟ ئەو گەنجە ئازاری هەیەو لەبەر ئێشەکەی وا دەلەرزی، ئەتووش هەرەپاسی دەکەی؟" ئاغە لە جوولەکەی خوڕیەوە و داوای لێی کرد تا ئیشەکەی خۆی بکاتو "واز لەو قسە سووك‌و چرووکانە بینە" و فەرمووی: "بەسە پیرە بەیتار، چیتر قەوچە قەوچێ مەکە!" برایم ئاغە وەکوو ئەفسەرێکی لەشکردار فەرمانی کردو دیوەخانیش کشومات بوو. وەختبوو گوێم لە هەناسەدانی هەمووان بێت. منیش قسەکانی ئاغەم زۆر لە لا خۆش بوو؛ هەناسەیێکی قووڵم هەڵکێشا.

بەیتارەکە دەمی بەسترا و هیچ قسەی بۆ نەهات! منیش دڵنیابووم کە ئاغە ڕاستی گوت. دەبوو ئێزرا دڵنەوام بێتو ئومێدم بداتێ، نەك گاڵتەم پێبکات. داخەکەم! گاڵتە لە چرکەیێکی پڕ لە ئێش و ژاندا، خۆی ئێش‌و ئازارو ژانە! لێ بەڵێ خۆم ڕاگرت. لەلاییکڕا هیچ نەقەوماو لە سیبەری لایەکەی دیکەشدا مرازی کابرا گرینگبوو؛ چونکە دەیویست سەرنجم بۆ

گاڵتەکانی ڕاکێشێت و زەینم لەسەر ئازارەکەم نەبێت‌و لە بیری بکەم جا بۆ ماوەیێکی کەمیش بێت؛ هەر لە بیری بکەم. منیش لەلایێك قسەکانی برایم ئاغەم پێخۆش بوو و لەلایەکەی تریشەوە نەمدەویست ئاغە لەبەر خاتری من ئەو پیرەمێردە دەمکوت بکات‌و دڵی بڕەنجێنێ، بۆیێ وتم:

"ئاغە! قسەکانی ئەم دنیادیدەیە خەم لە بیر دەباتەوە." بەرگریم لە ئێزرا کرد.

ئێزرایش هەندێك خۆڵەمێشی سپی لە ژێر پشکۆی ناو ئاگردانەکەی دەرهێنا. بە گرژییەوە، چاوەڕێی کرد تا خۆڵەمێشەکە کەمێك سارد ببێتەوە. کە ساردەوە بوو، بە سێ پەنجە گەورەکانی دەستی ڕاستەی، هەندێك لە مشکییەکەی هەڵگرت و ئاکاری گۆڕا و وتی:

"لە خۆت بەخت گەورەیێ! مشکییەکە هی دار بەڕوویە. ئەو مشکییە لە مشکیی دارەکانی دیکە چڕتر و خاوێنتریشە. مشکی دار بەڕوو باشترین چارەسەری برینەو ناهێڵی برین پیس‌و ئەستوور بێ. نایێڵی برینەکەت تەشەنە بکات؛ کە ئەو مشکییە برینەکەی گرت ئیدی هیچ کونج و کەلەنەکی لێ ناهێڵیتەوە کە با پێیدا دزە بکات‌و پێیە برینداڕەکەت ئەستوور بی، ناشهێڵی پیسیش ببی، کە پیسیش نەبی تەشەنە ناکا." ئێزرا جەختی لە تەشەنە نەکردنی برینەکە کردەوە و بە قسەکانیشی دڵم خۆشبوو؛ دەڵێن قسەی خۆش لە بەهەشتەوە هاتووە.

ئینجا کەمێك تەنی وشکی لەناو هەگبەیێکی دیکەدا دەرهێنا و دەگەڵ مشکیی داربەڕوو تێکەڵی یێکتری کردن و تێکەڵەکەی بەسەر برینەکەدا کرد. نەیهێشت پەنجەکانی بە برینەکەم بکەوێت. هەر ئەو هەندە تا تۆزەکە لەسەر برینەکە نیشتەوە، ئیتر ئاگری تێبەردا. ژانێکی لێ وەهات، کە پێمنەکرا خۆی لەبەریدا بگرم. ئەو ژانە وەك ژانەکانی پێشتر نەبوو! تیژتر

بوو، ڕەنگە لەبەر ئەو کەرستە پاککەرەوانە بوو بێت کە لەسەر برینەکەم نیشتنەوە و برینەکەش قەتماغەی نەگرتبوو تا وەك پەردەیێك لە خۆڵەمێشەکەی دوور بگرن. ئینجا دختۆر تۆزێکی دیکەی لە جۆرە دەرمانێکی تر، هێنا و سەیرێکی برایم ئاغەی مەنتکی کردو وتی:

"ئاغە! بەڕاستی، برینەکەی گرانە! ئەو چەشنە برینە ناکرێ بە حەفتەیێك تیمار بێت، ئیلۆهیم!" ئینجا پاکانەی بۆ قسەکەی کردو لە برایم ئاغەی گەیاند کە پارچەیێك ئێسقانی پاژنەکەم قوت بووەو ناکرێ وەك خۆی بڕوێتەوە.

ئاغەی مەنتك لە دکتۆرەکەی خواست تا تێیبگەیەنێت – "تێمبگەینە! ئەو برینە تیمار دەبی یان هەر دەمینێتەوە؟ خۆ تەشەنە ناکا؟" ئاغە پرسیاری لێی کرد؛ دیار بوو ئاغە وەك کەسێکی نزیك بۆم پەرێشان بوو؛ دەیویست دڵنیا بێت؛ ئاخر سەرۆك دەبێت خەمی بندەستەکانی خۆی لەبەر بێتو نەخەوێ تا ئەوان بە ڕەهاییەوە دەنوون و خەون بە ژیانێکی خۆشترەوە دەبینن؛ هاوار بەماڵی ئەو سەرۆکەی ئاگای لە گەلەکەی خۆی نەبێت؛ چونکە ئەو ڕۆژەی ئەو سەرۆکە بە ژێر باری گرانی مێژوو دەکەوێت کەس بۆی ناگرییێت و دیرۆکیش بەزەیی ناکات.

"ئاغە، بێنی خۆت درێژ کە! سەبرت هەبی؛ ئێزرای پیرە جوو، جۆرە مەرحەمەکی ئەوها بۆ برینەکەی دەگرتەوە کە لە تێکەڕەی پێنج باشترین جۆری پیاز و گیا و گۆری دیکەی تیماری برینان سازیان دەدەم، کە لەناو ئەو توورەگە بۆرەدا هەرمگرتینە." ئێزرا دەگەڵ قسەکانیدا، توورەگەکەی هەڵتەکاند، بەو ئومێدەی بە برایم ئاغەی نیشان بدات. پاشان تەماشایێکی بۆرێی کردو پێی گوت:

"بۆرێ! ئەو توورەگەیەم بدێ." ئینجا ڕووی لە برایم ئاغەی کردەوە و پێی گوت:

"ئاغە، خەمت نەبێ! برادەرە نەساغەکانی توو، خۆشەویستەکانی منن!" دیار بوو پیرە دکتۆر خۆی لەلای ئاغە خۆشەویست دەکردو ماستاوی بۆ سارد دەکردەوە — "بێشک، ئەو برینە چاك دەبێتەوە! بەرام ڕەنگە تیمارکردنەکەی لە یێك حەفتە پتر درێژە بکێشێ." دیسان، ئێزرا بە نەرمی بارەکەی بۆ منو بۆ ئاغە ڕوون کردەوە و توورەگەکەی لە بۆرێ وەرگرت و دەرکبەستەکەی کردەوە و هەندێك تۆزی دەرێنا.

"خراپ نییە، ئەگەر بە یێك حەفتە ئەو برینە بڕەوێتەوە، دختۆر." برایم ئاغە پێی گوت:

تا پیرە دکتۆر جاغەکەی لە بۆرێ وەرگرت، زۆری پێچوو، زۆر کاتی برد؛ چونکە بۆرێ ئەو توورەگەیشی وەك ئەوی پێشتر، لە قەفێکی تری پشتێنی خۆی توند کردبوو و نەیکردبووەوە؛ تا کردیەوە کات ڕۆیشت؛ بۆرە ئارامی لە دکتۆر ئێزرا بڕی؛ بۆیێ پێی ووت — "هەی هێڕە! چما نەتدەزانی دەبێ ئەو توورەگەیەشم بدەیەوە؟ لۆ ئەوها لەپشتی خۆتت توند کردییە؟ هەی مردیت لێ نەمرێ! زەلام!

" ئێزرا بە بۆرێی گوتو ڕوی لە جاحێڵەکان کردو هانی دان تا پتر لێیان دوور بکەونەوە و وتی — "دەی، جوامێرینە! دەی کوڕینە! ئەنگۆش مەردی خوای بنو هێشتا پتر لێمان دوور کەونەوە. بن دەستم مەگرن و ئەو بریندارەش پێویستی بە هەناسەدان هەیە، دوورکەونەوە با هەناسەکی بدا." دکتۆر زۆر تووڕە و توند بوو، بەڵام ناهەق نەبوو، ئاخر ئەو هەموو خەڵکە لە دەورمان کەڵەکە ببوونو بۆ جاری دووەم، تانۆکەیێکیان بە دەورماندا کێشا بوو و تا دەهات پتر لێمان دەهاتنە پێشتر و چاویان لە پاژنە براوەکەی

من بڕیبوو! باش بوو، دەگەڵ خواستی مام ئێزرا، ئاپۆڕەکە دیسان لێمان دوور کەوتەوە، بەڵام هەرگیز چاویان لەسەر برینەکەم هەڵنەگرت و هەندێکیشان ئاخ و ئۆفیان هەر مابوو. دکتۆرەکە، پێشتر، داوای ئاوی گەرمی کردبوو؛ زۆر زوو هات و خەرج کرا! ئەمجارەش، گۆزەیێك پڕ ئاوێکی شلەتێن هات —

"مام ئێزرا! ئەوەش گۆسکە ئاوەکی شیرتێنە؛ باشە یان دەبی لۆت بیگۆڕم؟" ئەو کوڕەی بە درەنگی ئاوەکەی هێنا، پرسی.

"هەروون دیسان ئاوێ بینن؛ ئاوەکی زۆر بینن. کورە هەی مارتان نەرمێ، ئاو بەلاشە؛ خۆ بە پارە نییە! لۆ کێ پاشەکەفتی دەکەن؟" دکتۆر گوتی و خەڵکەکەش پێکەنین؛ بەڵام ئەمجارە، لە ترسی ئاغەی، نەوێران دەنگیان هەڵبڕن، بۆیێ تەنیا هەر گرژینەوە و فزەیان لێ وەنەهات. ئیتر بە گۆسکان ئاو بۆ دکتۆری هات و نەوجەوانەکان تەماشایان دەکرد تا بزانن چ لەو هەموو ئاوە دەکات.

منیش زەینی دەستە لەرزۆکەکەی ئێزرام دا؛ تا بزانم چ دەکاتو چۆن کار دەیجوولێنێتەوە. دیار بوو کابرا فرە شارەزا بوو! چونکە دووبارە برینەکەی بە نەرمی شووشتەوە تا هەموو ئەو مشکییەی لادا کە، پێشتر، بەسەریدا کردبوو، هەمووی خاوێن کردەوە. ئێزرا هەر بەمە نەوەستا، قەتماخەکانیشی لەسەر برینەکە لادا. دیسان گۆشتی سوور وەدەر کەوتەوە؛ دەوری ئێسقانە براوەکەی گرتبوو، ئەمجارە باش دەرکەوت کە پارچەیێکی گەورەی ئێسقانی پاژنەی چەپم، قوت ببوو؛ نەمابوو! برینەکە لە جاری پێشووتر پتر ژانی دەکرد، دەئێشا. هەموو جەستەم دەلەرییەوە! وەك پەڕە کاقەزەکی بەر ڕەشەبام لێهاتبوو!

دووبارە، دکتۆرەکە هەندێك مشکی سپی لە بن پەنگری ناو ئاگردانەکە هەڵگرتەوە و ساردی کردەوە و بە دوو پەنجەو بە شێنەیی

گرتی‌و بەبرینەکەی داکردەوە. پاشان هەندێك وردە شتی لەناو جاغەکەی دەرهێناو دووبارە دەگەڵ خەڵووزی دارەکە تێکەڵی یەکتری کردن و بە وریاییەوە بەسەر برینەکەیدا پەرتی کردو دیسانەکە نەیهێشت پەنجەکانی بەبرینەکەم بکەوێت. هەرکە، ئەم جارەش، ئاردەکە لەسەر برینەکە نیشتەوە، دیسان ژانێکی ئاوای لێ هەستاند کە نەدەکرا بەرهەڵستی بکەم‌و بەرگەی بگرم! ژانێکی تیژ، ئاگری لە پاژنەم بەردا! ئەم ژانە وەك ژانەکانی پێشتر نەبوو، تەنانەت کاتێك کە پاژنەکەشم قوت کرد هێندە نەئێشا. ڕەنگە ژانەکە بەهۆی ئەم دژەتەشەنەکردنە بێت کە جووەکە بە برینەکەی داکرد. ئینجا مامەی دکتۆر هەندێك ئاردی دیکەی لە جاغێکی دیکەدا، دەرهێنا و زەینێکی برایم ئاغەی دا و سەرنجی بۆ کارەکەی ڕاکێشا و پێی گوت –

"ئاغە! ئەوەیان ئاردی جۆی ڕەشە!" هەندێکی لەناو لەپی خۆی کردو بە ئاغەی نیشان دا، "ئەوەم لەبەر خاتری توو هینا، ئەگەر ئەتوو نەبووای هەر بە تۆزی سەر ئەو ڕێیە بریکەم لۆ دادەپۆشی؛ بەرام برینی ئەو جاحێرە وەکی ئەوەیە کە برینی برایمی بی، لۆیێ هینام و بە کاری دینم؛ برایم! هیچ نەرێی، ئێ؟" ئێزرا بە ئاغەی گوت، "ئاخر چ بکەم! ئەتوو هەر چ برێی دەبی ئەمن قبووری بکەم، ئاخر ئەتوو ئاغەی، ئەمیش دەسەراتی تووم نییە!" ئێزرا قسەکانی خۆی تەواو کردو مات بوو.

برایم ئاغە لە بن زمانی ئێزرای گەیشت و زەردەخەنەیێکی بەسەر لێواندا هات و گرژییەوە و پێی ووت:

"هەی دەرۆزەکەر! چەند حەزم لێیە نەمری هەتا دەبییە پیاو! ئێزرا! نەخۆشەکە چارەسەر بکەو ئەمن ماندی بوونت بە پری دەدەمەوە و جوارەکی پڕ جۆت لەبەر دەرکەی مارێتان لۆ ڕوو دەکەم، ئەتووش تێر بە!" ئاغە دختۆری دڵنیا کردەوە و سەیرێکی منی کردو بۆم پێکەنی و لێی

تێگەیشتم کە دەیویست پێم بڵێت لەم ناوە هیچ شتێك بێ هەقدەست نییە؛ تەنانەت مەلاش سەرقەڵەمانە لەو نەخۆشانە وەردەگرێت کە نووشتە و دوعایان لە بۆ دەکات یان دەنووسێتەوە.

"ئەوە هەر لە خۆت دەوەشێتەوە، برایم!" ئێزرا بە زەردەخەنەوە پێی ووت و سوپاسگوزاری خۆی بۆ ئاغەی نیشان دا و وتی – "مەمنوونم! کاکە مانگی چاردە پێویست بە ئەنگوست ناکا؛ دەزانم زۆر جوامێری و گەلەکیش چاوتێر و پتریش پیاوی. لەو ناوە کەس نییە بگاتە برایم ئاغەی مەنتك!" پاشتر گۆلێك پڕ ئاردی جۆی لە دەمی خۆی کردو بە پووکە بێ ددانەکانی جۆی تا بووە هەویر، ئینجا زەینی پاژنە قوتبووەکەی دام. هەویرەکەی لەناو دەمی خۆی دەرهێنا، هەویرێکی فرە نەرم بوو، دەتگوت بنێشتەکەی خۆمانە. بە ئاغەی مەنتکانی نیشان دا.

"ئاغە!" ئێزرا بانگی کرد – "ئەو ئاردەی پێشتر بە برینەکەم داکرد، هەنووکە بەو هەویرە دایدەپۆشم." ئێزرا بە شانازییەوە باسی کرد کە کەرستەکە چۆن کار دەکات – "ئەو هەویرە هیچ کون و کەلەنێك لە دەورەی برینەکە، ناهێلیتەوە؛ ناهێلی نە با نە پیساتی دەربازی سەر برینەکە بىن، چەند ڕۆژەکی دەوێ هەتا قەتماغەی دەگری، ئیدی هەویرەکە هیشك دەبیتەوە و هەردەوەرێ و هەر قەتماغەکە دەمینێ و برینەکەش پیس نابێ؛ کە پیسیش نەبی تەشە ناکاو پێیەکەی ئەستوور نابی.

" ئێزرا پتر لەوتار خوێن دەچوو نەك لە بەیتارێك و بە تەواوی سەرنجی ئامادەبووانی بۆ قسەکانی ڕاکێشا بوو و ئەوانەی لە دیوەخانەکە بوون، بە زرۆکە هەناسەیان دەخواردەوە! منیش مەزەندەی ئەوەم کرد ئەگەر ئێزرا بەو هەموو سۆز و سۆزدارییەوە باسی دینی عیبری بۆ ئەو کوردگەلە بکات، ڕەنگە بە چەند ڕۆژێك هەموویان لە ئیسلامەتی پاشگەز بکاتەوە و

وایان لێبکات کە بگەڕێنەوە سەر باوەڕی باو و باپیرانیان واز لەم ئایینەی ئێستایان بێنن. ماڵت نەڕمێ، جوولەکە!

هەموو ئەو پیاوانەی لەناو دیوەخانێدا بوون، دامابوون، ملیان کەچ کردبوو؛ بە پەرۆشەوە بوون لە بابەتەکە تێبگەن، چونکە قسەکانی ئێزرا، بۆ ئەوان، مەیل بوون! منیش بە ئاستی ئەو خەڵکە بووم؛ گەلەك بە چاکی لەو هەموو سەربردانەی ئەو هەموو دەرمان و چارەسەر و تاو و توێ کردنەی مام ئێزرا کردی، تێنەدەگەیشتم؛ لە داخان، ئاگام لە جەستەی خۆم نەمابوو تا ئێزرا بە توندی، بە پارچەیێك برینەکەی پێچامەوە و ژانەکەی لێ توند کردم. تەماشام کرد، پەڕۆیەکە زۆر خاوێنیش نەبوو، بەڵام لە جەمانەکەم پاکتر بوو؛ دەزاندرا چ ڕەنگە!

"ئومێد دەکەم زوو چاك ببیەوە؛" ئێزرا گوتی، "ئاگات لەبرینەکەت بی، مێلە تەڕ بی، مێلە پیس بی. نێلی شتی پێبکەوی. نێلی مەڕ و ماڵات قۆچی لێبدەن. چاك دەبییەوە، نەترسێی، باشە." ئێزرا ئاوا ئامۆژگاری کردم؛ هەڵوەستەیێکی کرد ئینجا وتی – "دەزنێژیش نەشۆی!"

"گەلەك مەمنوون، مامە!" وەڵامیم داوە.

کە ئێزرا برینەکەی تیمار کردم، برایم ئاغە، ماڵی ئاوا بێت، چاوی دا بڕینەکە تا لە ئیشەکەی ئێزرای، دڵنیا بێت؛ کە دڵنیاش بوو، ئینجا سوپاسی ئێزرای کردو گوتی:

"مام ئێزرا، دەستەکانت نێشن!" ئەمەی گوت و دەستێکی بە سمبێلەکەی خۆی داهێنا و ستایشی ئێزرای کردو گوتی – "پیرەمێرد! ئەتوو هەموو دەمەکی ساز و ئامادەی هەتا یارمەتی ئەو خەرکەی بدەی کە پێویستییان پێتە." ئینجا برایم ئاغە نزای بۆ پیرە دکتۆرەکە کردو گوتی – "إنشاو الله، خودا سحەتەکی باشت دەداتێ و هەموو مرازەکانت دێنە جێ؛

بەڕاستی ئەتوو مستەهەقی چونکە هەموو دەمەکی لە خزمەت و یارمەتی ئەو خەرکەی هیچ قسووریت لۆمان نەبووەو نەتکردییە." ئاغە قسەکانی خۆی تەواو کردو یێکسەر بانگی لە یێکێك لەبەردەستەکانی خۆی کردو کابراش بێ ئەوەی هەڵوەستە بکات، هات و لەبەردەستی ئاغەی ڕاوەستاو گوتی:

"ها!"

"تۆفە! برۆ ناو لەودە گەورەکەی ماریێ؛ گوشەکی داغسۆر لۆ دختۆری پڕ جۆ بکە و لۆی ببەوە ماریێ. تۆفە، خۆت تاخیر نەکەی." ئاغە فەرمانی دا.

"نا، نا، ئاغە وا دەچم." تۆفە ئەمەی گوت و تێی قوچاند.

"گەلەك مەمنوون، برایمۆك." ئێزرا سوپاسی برایم ئاغەی کرد بەڵام دیار بوو هێشتا دڵی دانەکەوتبوو، جا وتی – "ئەوە کەمترین شتە کە لە پیاوەکی وەکی توو ڕەچاو دەکرێ." هەرکە برایم ئاغە گوێی لە بچووك کراوەی ناوەکەی خۆی بوو، تا دەمەکی داما، پاشان گرژییەوە؛ زانی ناکرێ بەو تەمەنە ڕێبازی ئەو پیرە جووە بگۆڕێت.

"کورە، ئێزرا!" برایم ئاغە بانگی کرد.

"بەرێ، ئاغە!" ئێزرا وەرامی دایەوە.

"گۆتت کەمەك لە هێسکی قومپانی قوت بووە، وە نییە؟" ئاغە لە دختۆری پرسیار کرد.

"بەرێ، ئاغە." دختۆر جەختی لە قسەکانی خۆی کردەوە و گوتی – "ڕاستت دەوێ؟" ئێزرا پرسیاری کرد، بەڵام چاوەڕێی وەڵامی برایم ئاغەی نەکردو خۆی پێدا چوو و وەڵامەکەی داوە – "لە نیوە پتری هێسکی قومپانیو گۆشتەکەشی براینەوە، پێیوە نەماینە." ئێزرا گومانی ئاغەی

بڕیو سەیری منی کردو پرسی – "حەمە! ئەوە بە چ تیغەکی ئەوها بڕیتەوە؟!" وەڵامم نەداوە.

ژئاغە زەینی پاژنە براوەکەی دام، پاشان لەخۆم ورد بووەوە و هەناسەییکی قووڵی هەڵکێشا، گوتی:

"ئەگەر ئەوهایە، ئەمن لەمە و دووا ناوەکت لێ دەنێم، هەر بە خۆت ئەو ناومت هەبی! دەبی ئەو ناومت لەهەمموو خەرکی جووایێزت بکاتەوە."
برایم ئاغە هەر تەماشای دەکردم، پاشان فەرمووی – "ئەو ناوەی ئەتوو دەتبی کەسی دیکە لە دنیایێ نایبی!" ئاغە قسەکانی دەگەڵ من بوون. بەڵام هێشتا هەر ناوەکەی بۆم نەدرکاند!

"ئاغە!" بانگم کردو ویستم هوشیاری بکەمەوە نەکا خۆی تووشی گوناح بکات، بەڵام بەر لەوەی بەشێك لە دەقی ئایەتی (١١) لە سورەتی (الحُجُـرات) کە دەفەرموێ – {... وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ...} بۆ بخوێنمەوە، وەبیرم هاتەوە کەمن لەو دەمدا شوان و نەخوێندەوار بووم، جا گوتم، "تۆ بڕیار بدە و ئێمەیش پەیڕەوی دەکەین، با لە دڵیشم گران بێت!" ئەمە قسەی سەر زارم بوو، بەڵام کەم وا ڕێك دەکەوێت زمان و بن زمان بە یێك ئامانجەوە پەیوەست بن!

"حەمە!" ئاغە گوتی، "مێلە لە درت گران بی ئەگەر ناوەکەت لێبنێم؛ ئاخر ئەو ناوەی توو کەس نایبی!" ئاغە دەیویست بزانی چ دەڵێم، بەڵام نەوەستا تا گوێی لە وەڵامەکەم دەبێت، بەڵکوو بۆی ڕوون کردمەوە کە ئەو نازناوەی خۆی بە منی دەدات، "بەدرێژایی مێژوو، بۆ کەس بە کار نەهاتووە و کەس ئەو ناوەی نەبووەو کەسیش ئەو ناوەی نابی!" برایم ئاغەی مەنتك زەردەخەنەیێکی جوانی بەسەر سمێڵاندا هات و لێی دەرکەوت کە مەبەستێکی ڕاستی لەو ناوە دەبێتو بۆ گاڵتە پێکردن نابێت.

- "ئاغە! تۆ برا گەورەی و خۆت بڕیار بدە و ئێمەیش پشتت دەگرین."

ئاوها بە ڕشتی وەڵامم داوە، واملێیکرد دڵی ئاو بخواتەوە؛ چونکە لەم ماوە کورتیلەیەدا بە جۆرێك ڕاستی خۆی لەلای مندا سەپاند، کە وایکرد گومانی لێ نەکەم.

"لە هەنووکەدا، لە دووای هۆی برینداربیەکەت ناگەڕێم." ئەم قسانەی کردو تێیگەیاندم کە تیماربوونی برینەکەم، لەلای ئەو، زۆر لە ئەوانی دیکە گرینگتر بوو. "شوان، ئەوە ئەوها ناکا کە ئەمە واز لە هۆی هاتنە ئێرەت دینین، نەخێر! بەرام هەنووکە، تەنیا ئەوەم لێت دەوێ کە بحەسێیەوە، تا قومپانییەکەت چاك دەبیتەوە." ئاغە پشوویێکی خواردەوە، ئینجا گوتی – "هەنووکە و لەو دەمودەستەدا، ناوەکم لۆ توو دەوێ کە لە خەرکی دیکەت جوابێز بکاتەوە. دەبی لەهەموو ئەوانە جودا ببیەوە کە ناویان محمدە یان حەمەیە." ئەمەی گوتو ڕوونی کردەوە کە ناوی محمد فرە زۆرە و گەلەك کەس ناوی منداڵەکانیان لێدەنێن (محمد) "چونکە ناوەکی جوانو ڕێکەو لەناو موسورمانانیشدا پیرۆزەو پێغەمبەرت وەبیر دێنێتەوە." پاش ئەم قسانەی، برایم ئاغە بێ دەنگ بوو. پاشان ڕووی لە دکتۆر ئێزرای کردو وتی:

"مام ئێزرا،" کە برایم ئاغە بانگی کردو ئێزرا بە ئاگا هاتەوەو ئاغا وتی – "چونکە ئەتوو ئەو گەنجە لە ئێش و ئازارەکانی قورتار دەکەی و چونکە تا چاکیش دەبیتەوە هەر لەگەری دەبی، پێمخۆشە، بزانم ئەتوو چ دەرێی!" ئاغە قسەکانی تەواو نەبوونو پاشتر بۆ ئێزرای ڕوون کردەوە پێی ووت – "دەمەوێ نازناوەك لەو کوڕە بنێم!"

ژلە چاوی برایم ئاغەی دیار نەبوو کە بیر لە چ ناوێك دەکاتەوە؛ ئاخر هەموو ناوێك بۆ هەموو کەسێك ناگونجێت. ناو ملوانکەیە بە ملی هەموو

کەسێکەوەیە، بۆیێ پێویستە ناو و نازناوی شایستەو پەسند لەوکەسانە بنێین کە ڕیزیان لێدەنێین یان خۆشمان گەرەکن و دەبێ شەرمیان پێی نەبێتو شانازی بەناوەکانیانەوە بکەن، خوا خوام بوو ئایەتەکەی وەبیر بێنمەوە، نەکا ئەو کەڵەمرۆیە بەپێچەوانەی ئەو ئایەتە نازناوەکەم بۆ هەڵبژێرێت و تێیدا گوناحکار بێت! ئەستەم بوو، بەڵام ئاش لە خەیاڵێك و ئاشەوان لە خەیاڵێك بوو!

"بە خۆت براگەورەو خودان قسەی!" ئێزرا گوتی و جەختیشی کردەوە کە قسەی کۆتایی هەر هی برایم ئاغەیە، "کەس نییە بتوانی قسەی لە قسەت بکا. ئاغە." وەڵامەکەی ئێزرا بۆنی جۆرە کوزکێشییێکی لێ دەهات و نیشانی دام، کە ئەم پیرەمێردە یارمولکە لەسەرە هەست بە چەشنە پشتبەندییەکی خۆی دەکاتو خۆی بە یێکسان دەگەڵ هەمووان نازانی، هەرچەندە وا بۆم وەدەر نەکەوت، بەڵام ڕەنگە ئەو هەستەی پاشبەندی ژیانی منداڵی خۆی بێت، ئەگینا ئەوەی من بینیم برایم ئاغە لەهەمووان پتر قسەی لەگەڵ ئەودا کردو لەهەمووانیش پتر ڕێزی لێنا و قەدری زانی. ئێزرا نەدەبوو ئا وەها بۆ ئاغە پان بکاتەوە و پاکانەی بۆ بکات.

"چ دەرێی ئەگەر ناوی بکەینە محمدی قومپانی بڕای، یان پاژنە بڕای، سلێمانی گۆتەنی؟" ئاغە ئەمەی گوتو سەری هەڵبڕیو پرسی، "ئەرێ، ئەو ناوە، لۆ ئەو گەنجەی، پڕ بە پیستی خۆی نییە؟" ئاغە گوتی و لێی دیار بوو کە مەبەستی فشەپێکردن نەبوو، مرازی دیکەی هەبوو، بەڵام من نەمزانی مرازەکە چییە، ئاخر ئیش هەیە لە ئیشەکانی تر کاریگەرترە؛ بەڵام ناچار بووم، دەبوو وەڵامێکی برایم ئاغە هەر بدەمەوە.

"ئاغە! ئەمە ڕاستە." وەڵامیم داوە و جەختم کردەوە کە پاژنەم نەماوە، لێبووەتەوە، بڕاوەتەوە و بێ قومپانی ماوم. بۆ بەرژەوەندی خۆم و

لەبەر ناسکی هەڵوێستەکەم، قسەی ئاغەم سەلماند و سەپاندم، "ئینجا ئەمە چییە، ئاغە؟" پرسیم، "هەستی مرۆڤایەتیم هەر وەکوو خۆی دەمێنێتەوە، با نازناوێکیشم بۆ ڤیت بێتەوە، من هەر خۆم دەمێنمەوەو ناگۆڕێم!" ئەمانەم گوت، ئینجا هەڵوەستەیێکم کرد تا بزانم ئاغە چ کاردانەوەیێکی دەبێت! چونکە تەوژمی کاردانەوە هەندەی هێزی خودی کارەکە دەبێت، بەڵام بەپێچەوانەی ئەو تێدەپەڕێت. جا چاوەڕێ بووم؛ دەبوو بزانم چ شەکرێك دەشکێنێت.

"ڕاست دەکەی!" ئەو گوتی: "ڕاستە بناغە لە دیوار گرینگترە! بەڵام پێم بڕێ..."

"بەڵێ، فەرموو." گوتم:

"ئەرێ ئەتوو ئەو ئاقرییەت لە کێ هینایە؟" دیسان هاتەوە سەر پرسی خۆی! جا لەبری وەڵامدانەوەی، ویستم بابەتەکە بگۆڕم؛ چونکی پێویست بوو، بۆیێ سەرنجی ئاغە و بە گشتیش، هی مەجلیسەکەم ڕاکێشا و داوام لێیان کرد ئەگەر دەکرا ڕێیان پێبدابام نەختێك سەر لەسەر سەریندا بنێم؛ بەڕاستی شەتەك ببووم، داهێزرا بووم، پێویستم بوو پشووێك بدەمو نەختێك بحەسێمەوە و ئەگەر بکرێش گەلەك پێویستیم بە نووستن هەبوو. ئاخر نووستن بەر لەهەمووشتێك، مێشك دەحەسێنێتەوە؛ ئاوی دەداتەوە. مێشك ماندوو بێت قسەی ناڕەوا دەکاتو بڕیاری خراپ دەدات.

"ڕەمۆ!" برایم ئاغە بانگی کردو کابرایێك هات و لە پێش ئاغەی هەڵوەستەی کرد.

"بەرێ، ئاغە!" کابرای ناو ڕەمۆ بە جوانی وەڵامی ئاغەی داوە و وەك دارێکی ڕەق، بێ قسە، لەوێ ڕاوەستا!

"برۆ نوین لۆ پاژنەبڕای ڕێك بێخە." ئاغە فەرمانی دا، "زووبە، لێف و بالیف و دۆشەك و پەشمەی پاگژ، لۆ ئەو مێوانە ڕێك بێخن." ئاغە تێی گەیاند کە من ماندوومە و دەبێت ئەویش خێرا بکات. ئاغە قسەی دەکردو ڕەمۆ چاوی لە چاوم بڕیبوو؛ دەتگوت خەریکە دەمخوێنێتەوە، ڕەنگە لە دڵی خۆی ئیرەیی بە من بردبێت!

"بەرێ، ئاغە،" ڕەمۆ وەرامی داوە. "هەر بەغار وا دەچم." ئەمەی گوتو وەك تیر بزر بوو.

ئازارەکە چەتوون بوو، خەریکبوو ئارامی لێ هەڵدەگرتم. ئەگەر لە شەرمی ئەو جوامێرانەی ناو دیوەخانێ نەبایە، ڕەنگبوو زیرەم تا عەرشی خودا بڕۆیشتبا، بەڵام شەرم بارێکی گرانە و پیاوی دەوێ بەرگەی بگرێت و بیپارێزێت؛ چونکە ئەگەر شەرم نەما شوورە دەپسێت و پاك و پیس و گەرم و سارد تێکەڵ دەبن‌و دنیا وەك ئەوەی لێدێت کە نە هیچمان لەو دنیایەدا کردبێت‌و نە هیچی لێ فێر بووبین. ناچار تانم لەخۆم دا و بەرگەی ئازارەکەم گرت و فزەم لەخۆم بڕی تا، بە کەمتر لە تەنیا یێك کاژێر، ڕەمۆ هاتەوەو بە ئاغەی ووت:

"کاکە! ژۆرەکەم گێسك دا و نوینەکەم ڕێکخست؛ هەنووکە لۆ مێوانی، ساز و ئامادەیە، با بێ، هەتا لۆ وێی ببەم." ئەمەی گوتو وەك بەردی لێهاتەوەو مەیی.

"دەی کوڕینە!" ئاغە هانی گەنجە مەنتکەکانی دا – "دەی زوو بن، بە هەمووتان حەمە برند کەن، نێلن برینەکەی بکولێتەوە." ئاغە گەنجەکانی ناو دیوەخان و دەرەوەی هاندان. "ڕەمۆ." ئاغە بانگی کرد – "ئەتوو هەڕوو ئاگات لەحەمە قومپانی بڕای بی، بە جێی نێلی هەتا پێی دەکرێ و ئاگای لەخۆی دەبی، شەو و ڕۆژ بە تەنێی ناهێلی. حەمە ئەرکی تووە و پشتە ملی

خۆتی لێ نەخورێنی." ڕەمۆ ئاگای لێم دەبێ! جا خێرا منیان بردە ناو ژوورێکی بچووکی، خاوێنی بۆن خۆش! ژوورەکە دوو کولانکەی هەبوو، هەر کولانکە و بە لاتەنیشتەکی ژوورەکەدا کرابووەوە. بای ژوورەکە بە ئاسانی لە ڕێی ئەو دوو کونەوە دەگۆڕا. ناوەڕاستی بانی ژوورەکە لەهەردووك لایە بەرانبەرەکانی بەرزتر بوو، دیار بوو، خانووەکە جزیری بوو. بانەکە بۆ هەردوو لا تەنیشتەکانیدا شۆڕ دەبووەوە. لەناو ژوورەکەدا، دۆشەکەك لە قەسەڵ دروست کرابوو و تەنیشتەکانی بە کووتاڵی چاوپان داپۆشرابوون. مافوورێکی بەسەردا درابوو. جاجمێکی دەستکردی ڕەنگاوڕەنگ، بەسەر جێیەکەدا هەڵکێشرابوو. سەرینەکە هەر بە تەنیا پاگژ نەبوو، بەڵکوو نوێ بوو، دیار بوو، لە پێش من، کەس سەری خۆی پێنەکردبوو! ڕووناکی ژوورەکە ئاسایی بوو. زۆربەی ڕەنگی نوێنەکە بۆرێکی سرووشتی بوو. ڕەنگی خوری بوو. هەرکە لەسەر نوێنەکە ڕاکشام، سوپاسی ڕەمۆم کرد، چونکە ئەوەم وەبیر هاتەوە کە دایکم پێی دەگوتم:

کوڕم ئەوەی سوپاسی خەڵکی نەکات، سوپاسی خوداش ناکات. ئینجا لەسەر دۆشەکە قەسەڵەکە درێژ بووم؛ ڕاکشام؛ جا داوام لە ڕەمۆ کرد بچێتەوە و منیش دەخەوم!

"دەتەوێ کەینێ بێمەوە؟" ڕەمۆ پرسیاری لێکردمو ویستیشی دڵنیا بێت ئایا دەمەوێت لە نیوڕۆ یان لە کاتی خۆرئاوا لە خەو هەستم. "یانیش ئەگەر ماندی و دەتەوێ هەتا سبەینێ هەرتناستێنم، هەر بنوو!" ئەمەی گوتو تەماشای کردمو گرژییەوە. ئەم چەشنە زەردەخەنەیەش دوو مەبەست هەڵدەگرێت، یان لەلای ڕەمۆ باشەیە، یانیش بە تەوسەوە دەیخوێنێتەوە و واتا بەم ئەرك و ڕەفتارەی ئاغە پێی سپارد، قایل نەبووەو ناشبێت؛ بەڵام ناچارە ملکەچی دەبێتو ڕایدەپەڕێنێت.

"با بۆ کەمێکیش بێت، بخەوم." لێی پاڕامەوە، وەك ئەوەی زەینی زەردەخەکەیم نەدابێتو نەمدیتبێت.

"ئەدی برسیت نییە؟ خواردنت لۆ بینم؟" ڕەمۆ ویستی دڵنیا بێتو پاکانەیێکیش بۆ زەردەخەنەکەی بکات.

"ئێستا نا." گوتم، "پێش بانگی ئێواره، وەرە و ئاگادارم بکەوە، بە خێرەکی خولای." ئەمەم گوتو چاوم لەسەر یێکتر دانا، ئیتر وەك مردووێکم لێهات؛ نازانم چ کراو چ قەوما. هەموو نوێژەکانم چوون! بەڵام بە میهرەبانی خودا دڵی خۆم دایەوە و گوتم: دەبێ ئەم نوێژانەم بگێڕمەوە و قەدایان بکەمەوە.

هەموو ڕۆژێك ئێزرای دکتۆر سەری لە نەخۆشەکەی خۆی دەدا! وا هەستم دەکرد، ئێزرا زۆر دڵسۆزە و هەرگیز فەرامۆشی نەکردوومە. ماوەییێکی پێچوو، ڕۆژێك دیتم ئێزرا وا لە ژوورەکەم ڕاوەستاوە و تێکەڵەیێکی جیاوازی بەدەستەوەیە. پێکەنی و بەڵێنی پێدام کە لەم نزیکانە چاك دەبمەوە و دەچم شوانەتییەکەم تەواو دەکەم. بەڕاستی، من هەر لە ڕۆژی یێکەمەوە کە ئەم پیرەمێردەم بینی، ڕیزم لێی گرت. بەڵام ئێستاکە، سەرباری ڕیزەکەش، خۆشیشم دەوێ؛ ئاخر هاوشێوەی ئێزرا، لەم ناوەدا، فرە کەمە. ئەم پیاوە سامانێکە ئەگەر بچێت ناگەڕێتەوە. ئێزرا ڕوخسارێکی فریشتە-ئاسای هەبوو. کاری خۆی بە دڵسۆزی و بێ فرت و فێڵ دەکردو داوای یارمەتیشی لە ئاغەی دەکرد.

ئێزرا لێرا هاتبوو، ناوەناوە پرسیاری سەبارەت بە خێزانەکەم لێ دەکردم. دەیپرسی – "لە کێ هاتی؟ لۆ هاتی؟ لۆ وراتی خۆت بەجێهێشت؟" بەو پرسیارانەی ئارامی لێ هەڵگرتبووم. بەڵام دڵم نەدەهات خۆی لێ توورە بکەمو دڵی بشکێنم و نەشمدەویست ڕاستی بابەتی ژیانی خۆم و

خانەوادەکەشمی بۆ بکەم. تا جارێکیان، بە ناچاری، بڕیارم دا بە ساردی وەڵامی بدەمەوە و گوتم:

"ئاخ! مام ئێزرا! ئاگات لێیە کە ئەو پرسیارانەی لێم دەکەیت، هەموویان برینم دەکولێننەوە؟" ئیتر نەمتوانی پتری بۆ باس بکەم، چونکە گریان قورگی گرتم و فرمێسك بە چاوانمدا هاتنە خوارێ. ئێزرا تێبینی ئەسرینەکەی کردم و چەندجارێك داوای لێبوردنی لێکردم سەبارەت بەو هەموو پرسیارە زۆرانەی لێی دەکردم؛ جا دەستی لەملم کردو وتی – "وەیش! کوڕم، نەمزانی ئەوها لەناو هەناوترا دەسوتیی!" پاشان داما، هەناسەیێکی ساردی هەڵکێشا، پاشان لە باوەشی خۆی کردم و داوای بەخشینی کرد – "ئەوانەت لەبیر دەچنەوە!" لەگەڵ قسەکانیدا هەستم پێیکرد کە ئەویش وەك من لە ناخەوە دەسووتا و هەناوی پڕی خەم بوو.

بەڵام ئەرکێکی ڕەوایە و مرۆڤ دەبێت زۆر هانا بۆ خەمەکانی خۆی ببات، چونکە ناسۆری وەك ئاوە، کاتێك کە بەسەر ئاگردا دەپڕژێت، دەیکوژێنێتەوەو گەرماتییەکەشی ناهێڵێت – "بەرخەکەم!" ئێزرا بە دەنگێکی پڕ نزگرەی گریانەوە بانگی کردم – "تەنیا زەمان دەتوانی برینەکان تیمار و سارێژ بکات!" ئیتر ببڕای بڕ، جارێکی دیکە پرسیارەکانی لێنەکردمەوە. باسی ڕابردووی دەگەڵم نەکردەوە. پتر باسی ئەو پلانانەی بۆ دەکردم کە دەبوو بۆ خۆم دایانبڕێژم تا سەرکەوم؛ قسەکانی ئەو دنیا دیتەیە ئەوپەڕ هاوکاری من بوون. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، من هەرگیز سەربردەی خۆمم بۆی هەڵنەڕێژت. تەنیا جارێکیان نەبێ؛ بۆی بە دەنگ هاتم و پێیم گوت:

دکتۆر! ئایندەی مرۆڤ بەچارەنووسی خودی مرۆڤەوە پەیوەستە." ئەم ڕستەیەم ووت و هەناسەیێکم بۆی هەڵکێشا تا چرکەیێك پەیدا دەکەم و

بیر دەکەمەوە دەتوانم بیبێژم پێش ئەوەی بیرێژم، پاشان گوتم، "با چاوەڕێ بین، بزانین خودا چی بە نسیب کردووین!" هەر ئەم قسەیەم کرد، یێکسەر کابرا دەستی بە پێکەنین کردو بە توندی لە دژی ئەم جەشنە بۆچوونەم هەلگەڕاوە و ڕەنگی سوور داگەڕا و بە تووڕەییەوە پێی گوتم —

"قومپانی بڕای! کورە حەمە! ئەتوو بە تەواوەتی سەرچیغ ڕۆیشتی! بە هەڵەدا چووی! خودا ئەوە بە بەندەکانی خۆی دەدا، کە بەندەکانی حەولی لۆ دەدەن. ئەو کەسانەی هەر چاوەڕێی خودای دەکەن‌و ئیش ناکەن، خودا هیچیان ناداتێ.

" ئێزرا قسەکانی زۆر بە توندی کردو پاشان هەڵوەستەیێکی کرد، ئینجا گوتی، "لە قورئانەکەی خۆتاندا هاتییە — ئینسان هیچی لۆ نابی تەنیا ئەوە نەبی کە حەولی لۆ دەدا، کورە ئەمن مەعنایەکەیم لە بیرە و دەزانم ئەو ئایەتە چەندە گەورەو پیرۆزە، بەرام، ئەو دوژمنانەی خۆتان لۆیێ ئەوهایان تێتان گەیاندییە هەتا ئیش نەکەن و هەر دانیشن بەو ئومێدەی خوا لۆتان بنێری. خوا ئەوە ناکات.

" کابرای جوولەکە لە مەلایەکی باش، باشتر بۆی ڕوون کردمەوە. منیش گوتم — "ئافەرین جوولەکەی دانا! تۆ ئەو هەموو زانیارییە ڕاستەت لە کوێ دەستکەوتووە؟ تۆ قورئانت خوێندووە؟" ئیتر جەختم لەسەر ئەوە کردەوە کە مرۆڤ هیچی دەست ناکەوێ ئەگەر کاری بۆ نەکات و ئایەتەکەشم وەبیر هێناوە.

ئەمەم گوت‌و پەنجەی خۆمم گەست؛ وەبیرم هاتەوە کە من خۆم بە نەخوێندەوار ناساندووە و نەدەبوو ئاوها سەرچیغ بڕۆم! بەڵام وا لە دەستم چوو! سەیر ئەوە بوو ئێزرا ئەمەی بەسەر خۆیدا نەهێنا، وەك ئەوەی هەر گوێی لە قسەکەم نەبووبێت‌و 'پێیەکی لێی خشاند!' چەند ڕۆژ ڕابرد، هیچ

باس و سۆراغێکی قسەکەم لە کەسەوە بۆ نەکرا. پاشتر ئێزرا سەردانی کردم. لەسەردانەکەدا، چەندین بابەتمان ساوارکوت کرد، پاشان لە هیکرا پرسی — "حەمە! خۆ ئەتوو شوان نی، وە نییە؟!" پرسیارەکە وەك ئەوە بوو کەپکە شاخێك بەسەر سەرمدا برمێ. سارد بوومەوە! هزرم ڕاوەستا! مێشکم مەیی! تا پاش ماوەیێك ئینجا هاتمەوە سەرە خۆم و گوتم:

"دەزانی چییە؟ تۆ ڕاست دەکەی!" لەگەڵ قسەکانم، لێوم تەتەڵەی دەکرد، "من باشم خوێندووە، بەس توخوا مەهێڵە با جارێ کەس ئەم ڕاستییە نەزانێت، با چاوەڕێ بین بزانین چۆن دێت و چ دەبێت!" ئیتر ویستم بابەتەکە بگۆڕم و گوتم — "برینەکەی پاژنەم بە تەواوەتی وشك بووەو قەتماخەکەیشی فڕێ داوە." بەم چەشنە نەمویست لە دەربارەی بابەتی خوێندەوارییەکەمەوە چیتر بڵێم. "بەڕاستی پێشبینی ئەوەم نەدەکرد کە ئەم برینە قووڵەی پێم هێندە زوو سارێژ بێتو ڕەشبێتەوە." ئیتر لە درێژەی قسەکانی خۆمدا، سوپاسی خودام کردو کاری ئەویشم زۆر بە بایەخەوە نرخاند. ئێزرا بەئۆینبازی سەری خۆی هەڵبڕی بەڵام نەیگوت — (بەسەرتدا زاڵ بووم!) پاشان وتی:

"مەلا! ئەو نهێنییانەی ئەمن دەیازانم، لەگەر من دەچنە بن قەبری،" ئینجا ئومێدی سەرکەوتنی بۆ خواستم و چۆوە ئۆرشەلیم و نەمدیتەوە، بەڵام تا ئێستاش ئەو کەڵە جوولەکەیەم لە بیر نەچووەتەوە؛ پیاوێکی باش، لەو دەمی نەخۆشییەکەم، ئەو دکتۆرێکی بیهاوتا بوو. یادەوەرییەکانی ئێزرا هەر لە دڵم دەژین، ئومێد دەکەم، لە خاکی پەیامی خۆیان، هەموو ئاواتەکانی بۆ وەدی هاتبن.

## شوان و فەقێیان

برینەکەم تیمار بوو. چاك بوومەوە و بیانووم نەما. دەستم بە ڕۆیشتن کردەوە، بەڵام نەدەوێرام پاژنە بڕاوەکەم باش لەسەر زەویدا بچەسپێنم و وەك جاران بڕۆم؛ کەم و زۆرێك هەر دەلەنگیم. چوومە دیوەخانێ، سەرم لە ابراهیم ئاغەی گەورەی هێزی مەنتك، دا. ئێوارە بوو، چوونەکەم بەو نیازە بوو تا سوپاسی بکەم‌و ئومێدی ژیانێکی خۆش بۆ خۆی و بۆ هۆزەکەی بخوازم. ئاخر فرە ئاگادرم بوون. فرەتر نازی نەساغییەکەیان هەلگرتم. زۆر پیاو بوون، هەموو مەنتکەکان ئەوپەڕ پیاو بوون، هاوشێوەی ئەوانم کەم دیتووە.

"سەلام علیکم." سەلامم لێکردن و برایم ئاغە لەبەرم هەستاوە. زۆر پێم سەیر بوو و شەرمەزاری کردم. ویستم قسە بکەم، ئاغە ڕێی نەدامێ و خۆی هاتە قسەو فەرمووی:

" پاژنە بڕای! باش گێم لێبگرەو بزانە چت پێدەرێم." ئاغە زۆر لەسەر قسەکانی ڕژد بوو.

"بەڵێ، ئاغە!" وەڵامیم داوە.

"دەزانی ئەوڕۆ ئێزرا ڕۆیشت؟" ئاغە پرسی و منیش، هەرچەندە متمانەم بە جووەکە هەبوو، بەڵام دڵم هەر لێیدا؛ نەکا درکاندبێتی!

"بەڵێ، هاتە لام و خوادا حافیزی کرد بەر لەوەی بڕوات." وەڵامی ئاغەم داوە.

"پێش لەوەی ئێزرا ئۆغر بکا، تێیگەیاندم کە، الحمد لله، برینەکەت تیمار بووە." برایم ئاغە ڕوونی کردەوە.

"بەڵێ! ئیستا باشم." وەڵامی ئاغەم داوە و پێیم گوت، "ئەگەر جەنابتان بایەختان بە برینەکەی من نەدابا، زۆر لەگین بوو تەشەنەی بکردایە و ئیتر ئەنجامەکەی باش نەدەهات." ئەمەم بۆ ئاغەی ڕوون کردەوە و گوتم، "ئەو ڕۆژانەی لەمەو لا بۆ من دێن، لە چاکەی بەڕێزتانە. تا دەمرم قەرزدارتانم." دیار بوو ئاغە بە وردی گوێی لە وشە بە وشەی قسەکەم ڕاگرتبوو و سەری دەلەراندەوە. ئاخر لەو دەم بۆم نەکرا پێستی نەخوێندەوارێك لەبەر بکەم؛ قسەکانم ڕاست و دروست وەك خۆم دەرکەوتن و ئەویش دڵی بە شێوەی ئاخاوتنەکەم خۆشبوو. کە هەڵوەستەم لە قسەکانم کرد، ئاغە هیچی دیکە ڕانەوەستا، بەڵکوو بە پەلە و بە دەنگێکی بەرز، وتی:

"ئەمن ئەو ئیشەم لۆ خۆم کرد، لۆ کەسم نەکردییە و شوکرانەشم ناوێ." ئیتر، بە خێرایی، باسەکەی گۆڕی و فەرمووی – "سبەینێ لەگەر گەردی بەیانێ، بە دوو پیرۆتی دەکەوی و پێکەوە لۆ بەر مەڕی دەچن!" ئاغە قسەکەی کردو هەڵوەستەیێکی بۆ کرد، دا بزانێ چ دەکەم و چ دەڵێم، کە هیچم نەگوت، ئینجا ئەو خۆی تێیگەیاندم کە دەبێت ناوچەکە شارەزا بم، تەپۆلکە و گرد و تەلان و کەندەڵانەکانی بناسم، "دەبی لەو ناوە شارەزا بی؛ هەتا شارەزاش نەبی، زۆر لە گوندی دوورمەکەوە؛ زۆر بەپێیان مەڕۆ؛ نەکا برینەکەت دەست بە ژانێ بکاتەوە و تەشەنە بکا." ئاغە زۆر بە وردی ئامۆژگاری دەکردم.

"قسەکانت سەر سەر و سەر چاوان." وەڵامی ئاغەم داوە و گەلەکیش سوپاسم کرد، چونکە بەڕاستی شایان بوو. ئاغە سوپاسگوزارییەکەی منی زۆر بە دڵ بوو؛ هەندە بە دڵی بوون، ختۆکەی لێ وەدەهات.

"قومپانی بڕای! ئەگەر دەتەوێ لەو ئیشە دەرنەچی، دەتەوێ لێی بخۆی، دەبی وەکی چاوی خۆت ئاگات لە ماراتەکەم بی." ئاغە دەستی بە ڕێنمایی و ئامۆژگارییەکانی خۆی کردەوە و تەماشای ناو چاوانی دەکردم کە وتی:

"مێلە هەست بکەی کە ئەتوو ئیش لۆ من یان لۆ کەسەکی دیکە دەکەی. دەبی ئەو مێگەلە بە ماری خۆت بزانی." ئاغە هۆشیاری دەکردمەوە، فێری دەکردم چونکە وەك ئەو خۆی باسی کرد ئەگەر ئەو هەستەم لە ناخڕا دروست نەبیو ئەو ئاژەڵانە بە ماڵی خۆم نەزانم، ناتوانم ئاگادارییان بم. ئەگەر ئاگاداریشیان نەکەم – "بەرهەمیان نابیو ئەوەش ئەوها لە توو دەکا کە ئیشەکەت لە دەست بچی."

ئاغە جەختی کردەوە و تێی گەیاندم ئەگەر بێکار بمێنمەوە، ئیتر کەس بەخێوم ناکاتو نانی خواردنی خۆمم دەست ناکەوێت! ئەمجارە ئاغە فرە لە قسەکانیدا ڕژد بوو، پێشتر هەرگیز ئاوا بەمجۆرە نەمدیبوو؛ زۆر تووڕە و توند بوو؛ ڕەوان بوو؛ ئامانجی لە قسەکانی دیار بوو؛ چاوەکانی دەترووسکانەوە، ئاغە پێشتر ئاوا نەبوو، هیچ جارێك بەم ڕوخسارە تووڕەوە نەمدیتووە! ناچار بە بێ دەنگی گوێی خۆمم بۆ ڕایەڵ کردو وەك پێژن – بەرد قسەی کرد، من فزەم لێ وەنەهات. ئاغە لە قسەکانی نەپساوە، وەك گوتاربێژی مزگەوت هاتە بەر چاوم، کاتێك کە وتی:

"فێربە ئیش لۆ خۆت بکە، نەك لۆ من یان لۆ خەرکی دیکە!" برایم ئاغە گوتی و دووپاتی کردەوە کە دەبێ هەموو سەرە مەڕێك بە هی خۆم

بزانم، "ئەوانە هی من نینە، هی کەس نینە، هەموو مێگەلەکە هی تووە. ئەگەر هات و جارێك وا هاتە مێشکت کە ئەوانە هی خۆت نینە، ئیشەکەت بەجێبێلە. تێگەیشتی؟" ئەم ڕێنماییيانەی چەندین جار دووبارە کردەوە و منیش گوێم ڕاگرتبوو و دەمووت:

"بەڵێ! زۆر چاك تێگەیشتم!" وەلامی برایم ئاغەم دەداوە.

"چونکە ئەگەر ئەو هەستەت لە کن نەبوو، ناتوانی مەڕداری بکەی. ئاگات لێیان نامینێ. لۆ توو ئەوە باشترە شەرتەکەت بە جێبێلی نەك زەرەر لە ساحێب مارەکە بدەی. لێگەڕێ دا کەسەکی دیکە شوانییەکە بکا." برایم ئاغە قسەکەی کردو جەختی کردەوە کە دەبێ بە چاکی و هۆشیاری وریای ڕانە مەڕەکە بم، "ئەگەر نا، لە ئیشەکە دەردەکرێی و کە بێ ئیشیش بووی لە دووشیوانێت دەردەکەم، چونکە ئەمە لەو گوندە کەسانی بێ کارمان ناوێ و دەریان دەکەین." ئاغە هەموو شتێکی جوامێرانە بۆ ڕوون کردمەوە و بە وردی لە پێش منی داناو چاوەڕێ بوو قسە بکەم. بەڵام خۆ هەموو قسەیێك کە دەکرێ و دەگوترێ واتا نابەخشێ، جا دەبێ بزانم چ دەڵێم. ئیدی، هەناسەیێکی قووڵم هەڵکێشا؛ دەمویست چرکەیێك خۆم ڕابگرم، کاشکا نەختێك بیر بکەمەوە بۆ ئەوەی قسەکانم هەڵبژێرم و بە ڕەوانی وەڵامی بدەمەوە، ئینجا ناوی خودام لێهێنا و وتم:

"ئاغە!" سەرنجیم بۆ خۆم ڕاکێشا، "پەیمانتان پێدەدەم، من بۆ خۆم کار بکەمو بۆ کەسیتر ئیش نەکەم. پشت بە خودا و بە خۆم دەبەستم." پاش ئەم قسانەم نەختێك هێور بوومەوە کە زانیم برایم ئاغەم دڵنیا کردەوە و جەختم کردەوە کە تا ئەوپەڕ ئاگاداری ڕانەکە دەبم، وەك ئەوەی سەرمەڕی خۆم بن. "ئاغە، من دڵنیامە، ئەگەر ئەم ڕانە مەڕە نەبێت، منیش ژیانم نابێت. جا لە خودا دەپاڕێمەوە هاریکارم بێت، ئامین." بەمجۆرە شەرتی

شوانی لە نێوان ئاژەڵدار و شوانەکە کارا کرا و پیر و گەنج و هەرزەکارانی مەنتك، ئەوانەی ئامادە بوون هەموویان ئاگایان لێبوو و ماڵیان ئاوا بێت، ئامینیان بۆی خوێند، و هەموویان ئومێدی سەرکەوتنیان بۆ خواستم. پیاوی باشن.

وا هاتە خەیاڵم کە ئەمشەو تا بەیانی چاوەڕێ نەبم، بەڵکوو، هەر بەم شەوە، بچم ناوچەکە بپشکنم و هەوراز و نشێوی لێ دەستنیشان بکەم، لە کونی دڕندەکانی ئەو دەڤەرە شارەزا بم؛ چونکە ئەگەر نەزانم لە چ شوێنێکم، ناتوانم پاریزی لەو جێیە بکەم. بۆیێ وا باشە خۆم شەرمەزار نەکەم و پێش لە لەوەڕاندنی مێگەلە مەڕەکە، ئاشنای ئاقارەکە ببم. بەڵام پاشتر بیرۆکەکەی خۆمم گۆڕی، چونکە نەدەبوو بەپێچەوانەی ڕێنماییەکانی برایم مەنتك بجوولێمەوە، ئاخر ئەوەی سەرۆکێك و مامۆستایێکی نەبێت، نە دەتوانێت ببێتە سەرۆك و نە دەشتوانی ببێتە مامۆستا. سەرکردایەتی و مامۆستایەتی ئەرکیان زۆرە و هەردووکیشیان لەبەرانبەری خەڵك و خودا بەرپرسیارن.

چاوەڕێم کرد تا، پاش شەوێکی لە ڕادەبەدەر درێژ، بەیانی دا و ڕۆژی کردەوە. مام پیرۆت، پیرە شوانەکەی مێگەلی ماڵی ئاغەی، دەگەڵمدا هات و ڕێنمایی کردمو ئەو شاخ و داخ و مێرگ و لەوەڕ و کەند و جۆمی ناوچەکەی هەمووی لەگەڵ من گەڕا و نیشانی دام و ناویانی بۆ هێنام. چەند ڕۆژێك بارەکە هەر بەم شێوەیە بەڕێوە چوو. بەڵام هەر لە نزیکی گوندی دەخولاینەوە؛ چونکە زەمان خەریکبوو پەل و پۆی لە مام پیرۆت دەبەستەوە. شارەزای ناوی لەوەڕە باشەکانی نزیك گوندی دەکردم، گەلەك ناوی هێنان، بەڵام من هەموو ناوەکان بەو یێك جارە فێر نەبووم. ئاخر ئەو هەموو گرد و باسكو چەمو چۆمو دۆڵو دەوەنو بڵندو نەویو شاخو گردە،

نەدەكرا ئاوا بەئاسانو پاسانی ناوەكانیان فێر ببم! بەڵام هەر فێری هەندێك ناو بووم چەند كانی و جۆگە و مێرگ و باخم ناسینەوە و لە بیرم نەكردن. بەگشتی زەوییەكەم ناسی، خاك و خاپەلۆكی دووشیوانم خۆشویست. ناسین و شارەزا بوون لەم هەموو هەرد و وەردەی ئەم دەڤەرە، گەلەك لە ئەزبەركردن و تێگەیشتنی كتێبەكانی ئیبن حەجەر و جاحظ و النسفي و القرطبیو الرازيو البیضاوي، ئاسانتر نەبوون. ناو فێر بوون گەلەك لە وەعزو خوتبەو قایلكردنی ئەو كوردگەلە ئاسانتر نەبوو.

لەم ئیشە تازەیەمدا، دەبوو تەنیا فێربم چۆن ڕانە مەڕەكە ڕابدەم، چۆن بۆ لەوەڕیان ببەم و چۆن تێریان بكەم، چۆن ئاویان بدەمو چۆن بۆ هەوێزێ بیانهێنمەوە ، چۆن سەری بێرێ دەگرم تا مەڕ و بزنەكان بدۆشرێن و ئینجا چۆن وایان لێدەكەم تا مۆر بنو بحەسێنەوە. جیاوازی ئەو و ئەم، ئاسمان و ڕێسمان بوو! ئەوەی پڕ بایەخ بوو ئەوە بوو لەپاش بانگی بەیانیان، خێرا مێگەلەكە ڕابدەم؛ بۆ دەشتێیان ببەم و لەوێ، لەناو مێرگێكدا، بلەوەڕێن و تا كاتی نیوەڕۆیان ئاگاداریان بم، ئینجا پاش نیوەڕۆیان بەرەو گوندی بۆ بێرێیان بێنمەوە، تا بدۆشرێن و ئالیك بدرێن و پاشتر دیسان هەمان هاتن و چوون دووبارە بكەمەوە. هەنگاوەكانی مەڕداری پێكسانن، بەڵام پیاو ماندوو دەكەن؛ لەگەڵ ئەم هەموو ماندوو بوونە و ئەو كەینو بەینەدا هێشتا هێندەی ئەوە ئەستەم نەبوو وا بكەم ئەم كوردگەلە قسەكانم پەسند بكەن و لە ژیانی ڕۆژانەیاندا پەیڕەویان بكەن. ژمارەی ئەم پەیڕەوكارانەش فرە كەم بوو؛ زۆرینەی دەوڵەمەند و گەنج و شاردیدەكان، بە سووك و ئاسانی نەدەهاتنە ڕایێ و هەرگیز شەڕی شەیتانیان نەدەكردو گەلێك جار كاری دژە دینی ئاوایان دەكرد منی پێ شەرمەزار دەبوو؛ جا

لەبری ئەوان من خۆم تۆبەم دەکردو لە خوا دەپاڕامەوە لێیان ببورێت و وەبەر میهری خۆیانیان بگرێت.

زوو لە شوانی شارەزا بووم. ئەو هێنانو بردنەی ئەم ڕانە مەڕە گەلەك لە هێنانو بردنی تەسبیحەکان جودا نەبوو. هەردوو ئیش لە کوێ دەستیان پێدەکرا، هەر دەهاتنەوە ئەوێ و ئیتر ژیانی شوان و مەڕ و بێری وەك خولی تەسبیحەکەی لێدەهات و نەدەگۆڕا. بەڵام ئەوەی لە نێوانی ئەم دوو کارە جودا بوو، تەسبیحەکان هیچیان بۆ مرۆڤ پێ نەبوو، بەڵام مەڕداری ڕزقی لێ دەباری!

دوو شیوان بۆ من وەك دیوەخانەی برایم ئاغەی لێهاتبوو، جا من ناچار بووم لوتم بۆ ئەملا و ئەولا ببەم، کاشکا کەلێنێك دەدۆزمەوە ڕووناکییێکی جیاوازی لێ دیار بێت. ئەو گەڕانەم بە دووای شتی تازە، بۆی ئاشکرا کردم، کە لە گوندی دووشیوان، حوجرەی فەقێیان هەبوو. لەو حوجرەیەدا ژمارەییێکی باش فەقێی لێبوو. فەقێیەکان تەفسیری قورئانو فیقە و شەرعو قەواعید و ئەدەبی عەرەبیو حەدیس و مەنگق و کەموزۆرێك فەلەك و بیرکاریشیان دەخوێند. فەقێیەکان حوجرەی تایبەتی خۆیانیان هەبوو. لێیان دەخوێند و دەخوارد و دەخواردەوە؛ ئەوانەی خەڵکی گوندی دووشیوانیش نەبوون، هەرچەندە ژمارەیان بە پەنجەی دەست ئەژمار دەکرا و زۆر لێرە نەدەمانەوە، هەر لەناو ئەو حوجرەیەشدا دەنووستن.

منیش چونکە ئالوودەی ئەم چەشنە ژیانەی فەقێیاتی بووم، نەمتوانی خۆم لەو ژوورە چەپارە بدەم، بۆم نەکرا لێی دوور بکەومەوە و نەچمە ئەوێ؛ جا هەموو ئێواران کە ئەرکی شوانەتییەکەی خۆمم تەواو دەکرد، لەبری ئەوەی بچمەوە ماڵ یان بچمە دیوەخانی گوندەکە، دەچوومە ناو فەقێیەکان و لەوێ بێ دەنگ، دادەنیشتم و گوێم لێ دەگرتن و ڕابردووی

خـۆمم وەبـیر دەهاتـەوەو زانسـتییەکانی پێشـانی خۆیشـم ئـاو دەداوە و نەمدەهێشت کانی مێشکم ئەم زانستییانە چك بکات. هیچ کام لـە فەقێیـەکان بایـەخی بـە هـاتن و نـەهاتنی مـن نـەدەدا. هەرکەسـێکیان خـەریکی دەورکردنەوەی خۆی بـوو. دەرسـەکانی خۆیانیـان بـۆ بـەیانی ئامادە دەکـردو ئەوەی دەچووەوە ماڵی خۆی، ئەوانی تر لێی دەخـەوت. منـیش تـا هـەموویان دەخـەوتن لـەناویان دەمامـەوە. دەتگـوت زمـانم لەدەمیـدا نـەبوو. هیچـم نەدەگوت، فەقێیەکانیش هیچ پرسـیارێکیان لـێ نـەدەکردم، وەك ئـەوەی هـەر لەوێدا نەبووم! بەڵام زانیارییـەکانم لـەو حوجرەیـەدا، بـۆم دەزانـەوە. زۆر بـە وردی چاودێریم دەکردن و گوێم لـێ ڕادەگرتن و هەسـتم دەکـرد تێنوومـە و ئـەو فەقێیانـە تێـراوم دەکەنـەوە. زۆر شـتم لەسـەر زاری ئەوانـەوە وەبـیر هاتنەوە. کەمێك لەو بابەتانەی ئەوان دەیانخوێند، هەبوو من نەمخوێندبوو. جا باشتر گوێم لێ دەگرتن و لە موستەعیدەکانیان فێـر دەبووم. سـەیر ئـەوە بـوو، لـە یێـك دووانێکـی بـترازێ، فەقێیـەکانی دیکـە هـەموویان هـی گونـدی دووشیوان بوون؛ ژمارەیێکی زۆر کەمیان لە گوندەکانی کانی بـزرە و بێستانە و هی دیکەوە هـاتبوون. پـاش ئـەوەی کـە بـۆ مـاوەیێکی زۆر گـوێم لـێ گـرتن، هیچ نەما کە بایەخی پێ بـدەم. ئـەوەی ئـەوان دەیانخوێنـد مـن خوێنـدبووم؛ زانیـاری مـن لـەخۆیان و لـە هـی مەلایەکەشیان باڵاتر بـوو. ئـەوانیش دیـار بـوون، هـەر ڕۆژ دەچـوونە مزگـەوت و لەبـەر دەسـتی مـەلای گوندەکـە دەرسـەکانی خۆیانیـان دەخوێنـد. مـەلا گـە، مامۆسـتایان بـوو. پـاش چـەند شەوێك لەگەڵ فەقێیەکان، تێگەیشتم کە مەلا گە تەنکە عیلمێکـی شـەریعەت و فیقھ و زانستی حەدیس و قورئـانی هەبوو، تـەنیا بـایی ئەوەنـدەی دەزانـی چۆن پێشـنوێژی بـۆ خەڵکەکـە بکـاتو ژن مـارە بکـاتو زانسـتێکی تـەنکی خوێندنەوەی قورئانی فێری ئـەو فەقێیانـەی دووشـیوانێ دەکـرد. جـارێ یـان

دوو جار دڵنیا بووم، دوو یان سێ لەو فەقێیانە نەدەچوونەوە ماڵەکانیان لەگەڵ هاوڕێ گوندنشینەکانی دیکە، لە حوجرە دەوری خۆیان دەکردەوە و دەرسەکانی خۆیانیان دەخوێند، تا خەویان دەهات و ئیتر هەر لەو شوێنانەی خۆیانەوە دەخەوتن؛ مانەوەیان تەنیا لەبەرئەوە بوو چونکە پێشتر دەرسەکانیان ڕەوان نەکردبوو، مانەوەیان لەوێدا، ناچاری بوو.

پاش ئەوەی لە ڕادەی شارەزایی زانستی مەلا گە لە زانینی ئیسلامی، دڵنیا بوونم، تێگەیشتم بۆچی ژمارەی فەقێیەکانی تەنیا هەر هەندەیە و پتر نابێت؛ ئەو فەقێیانەی دەیانویست زانستی پتر وەربگرن و فێر بن، لەسەریان پێویست بوو سەفەر بکەن، لەم گوند بۆ ئەو گوندو لەم شار بۆ ئەو شار بڕۆن و بە دوای مەلای ناودار و زانادا بگەڕێن تا دەیاندۆزنەوە و ئینجا هەوڵ لەگەڵ ئەو مەلا باشانە بدەنو قایلیان بکەن و باوەڕیان پێبێنن کە فەقێی زیرەکن، تاکوو جێیان لەناو حوجرەی فەقێیان بۆ فەراهەم بکەن و لێیان بگەڕێن بمێننەوە و ڕۆژانە، دووشەممە و جومعە نەبێ، دەرسییان پێبڵێن. هەر لەبەرئەوە بوو کە فەقێیەکانی وەك خۆم ئاسا، لە ماڵ و گوندو دایك و باوكو دۆست برادەرانیان دەترازان و لە حوجرەی دوور لە خانەوادەکانیان لەنگەریان دەگرتو دەسلەمانەوە و دەیانخوێند و ئەمانە دەشبوونە مەلای بێ هاوتا.

چەند ڕۆژێکی دیکەش چاوەڕێم کرد، ئینجا بە چاکی تێگەیشتم کە مەلا گە جەختی لە گوتنەوەی بابەتە سادەکان دەکردەوە و ئەوانی بە فەقێیەکانی دەگوت. مەلا گە چەند ئایەتێکی نیشان کردبوو کە بە پەنجەی ئەنگوست دەژمێردران و هەر ئەوانی بە فەقێیەکانی خۆی دەگوت، مامۆستا پتر نەدەبەزی. کە ئەم دەستە فەقێیە وازیان لە خوێندن دەهێناو چەندانێکی دیکە دەهاتنە بەر خوێندن، مەلا گە هەر ئەو چەند ئایەت و

حەدیسە بەردەستەکانی پێیان دەگوتو نەیدەگۆڕین و هەنگاوی بەرینتری نەدەهاوێشت؛ چونکە دیار بوو کە نەیدەزانی لە سورەتە کورتیلەکانی قورئان، گرینگی نوێژکردن و گوناحی نوێژنەکەر و ڕیزگرتن لە داباوکان و ئەرکی موسوڵمان لەبەرانبەری دراوسێی، و گوناحی پاشەملەی خەڵکی، بە فەقێیەکانی بڵێت و نەشی دەویست خەڵکی گوندی بزانن کە مەلا نەزانە، جا هەر ئەو بابەتانەی دەگوتو دەگوتنەوەو پتر جەختی لەسەر زەکات و سەرفترەی ڕەمەزان دەکردەوە دەرسی مارەبڕین و تەڵاقدان و تەلقین و دابەشکردنی میراتیشی بەجێ نەدەهێشت؛ چونکە هەمووی هەر بۆ گیرفانی خۆی دەچووەوە.

چەند جارێك تا پاش نوێژی عیشایان و درەنگی شەو، لە حوجرە، لەگەڵ فەقێییەکان، دەمامەوە. لێیان دڵنیا بووم کە چەندە بێ عیلمن! لە زانستی ئیسلامیدا، چەند کۆلەوارن. شەرعیان نەدەزانی، ڕێزمانی عارەبییان نەدەزانی و باسی ڕێزمانی کوردی هەر مەکە، وشەسازی و لۆژیك و زانستەکانی دیکەی مەدرەسەی فەقێیانیان ڕێ پێ نەبرد. دڵنیا بووم کە خۆم گەلەك لە مەلا گە پترم خوێندووە، گومانم نەبوو، کە من خوداناسیم لەوان باشتر دەزانی، لە شەرعو فیقهی ئیسلامی و فەرموودەکانی پێغەمبەری مەزن (ص) گەلەك لەوان پترم خوێندبوو، پترم دەزانی، ئاگادارتر بووم، لەوان زۆرتر ماندوو ببووم، لەبەر دەستی مەلای باشترم خوێند بوو، لە گوندێکەوە بۆ گوندێك، لەم مەدرەسەیە بۆ ئەو مەدرەسە، دەشتو دەر گەڕاوم تا مەلای زانام دۆزیوەتەوە، لێیان فێربوویمە. من هەر لە دەقەری جافایەتی نەمخوێندووە، فرە شارو وڵاتان گەڕاوم. عارەبستان و عەجەم و ئەستەنبولم تەنیوە؛ هەردەم، فێربوون ئەوپەڕ ئاواتم بووە. هەمیشە دەبوو ئەمڕۆ لەدوێنێ پتر بزانم؛ دەنا وامدەزانی ژیانم بە فیڕۆ چووە!

مـن بابـەتی شـەریعەتی ئیسـلامیم بـە تـەواوەتی خوێنـدووە و تێیگەیشتووم. بەڵام پێناچێت، ئەم فەقێیانە خوێندبێتیان؛ ئەگەر هەر لەم گوندەشدا بمێننەوە، ڕەنگە تا هەتایە هەر فێری ناوەکەشی نەبن. ژیان تێیگەیاندم، کە زانست لە شوێنێك پەنگاو ناداتەوە و گل نابێتەوە. زانست وەك بایە، لە چەشنی ئاوە، بەسەر هەموو دێ و شارو وڵاتێکدا پەرتەی کردووە؛ ئەوانەی شەیدای زانستینەو بەدوایدا دەگەڕێن، دەیدۆزنەوە؛ زانست بۆ خۆی و بەخۆی و بێ کۆشش، بەدەست ناکەوێت، بێی ئەرکدان، دەستەمۆ و ماڵی نابێت. ئەگەر کەسێك هەموو تەمەنی دەستی بۆ ئاسمان بەرز بکاتەوە بپاڕێتەوە، خودا هیچی پێنادا، لە ئایەتی ٩٢ ی سورەتی (آل عمران)دا خودا بۆ هەمووان ڕوونی کردووەتەوەو دەفەرمێ – {لَن تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ. – واتا – چاکەتان دەست ناکەوێت تا ئەوەی خۆشتان گەرەکە لە پێناویدا خەرجی نەکەن}.

کەواتە مرۆڤ دەبێ نەترسێت و کات و تەمەنی خۆی خەرج بکات تا بە ئاواتە بەرزەکانی بگات. زانین‌و فێربوونیش یێك لەو ئاواتە بەرزانەیە. ئەو مرۆڤانەی بە دوای زانیندا دەگەڕێن، بێگومان هەر پێی دەگەن.

من بۆ خۆم، گەڕام، خوێندم، لە گوندو دەڤەر و وڵاتەکەی خۆم دوورکەوتمەوە، چەندین گوندی دوورو نزیکم کرد، چەندەها شارم پشکنین بە دووای مامۆستای باشدا چووم؛ ئینجا توانیم لە خزمەتییاندا بخوێنم و زانستە ئیسلامییەکانیان لێ فێر بم. ئیجازەی مەلایەتی لەو مەلایە گەورانە وەربگرم کە دەرسیاندام، فێریان کردم‌و لە خزمەتیاندا خوێندم. لە خزمەتی گەورە مامۆستایانی قەڵاتی هەولێر خوێندم‌و مەلای گەورەی هەولێر ئیجازەی مەلایەتی پێدام. ئینجا دەسەڵاتی ئەوەم وەرگرت کە خوتبە بخوێنمەوە، وەعز بدەم، ئامۆژگاری خەڵکی بکەم فەتوای ئیسلامی بدەم.

بوون بەمەلا نەکارێکی سانایە! چەند ساڵێك بەر لەئەمڕۆ، ئەو بابەتەم خوێند کە ئەم فەقێیانە ئێستا خەریکن ڕاڤەی دەکەن؛ هەڵگێڕ و وەرگێڕی دەکەن و خۆیان لێی شەتەك و ماندوو دەکەن و تەواو تێی ناگەن و داخەکەم! منیش نابێت قسە لەو بابەتانەدا بکەم!

بە کورت و کرمانجی، نەوێرام خۆم ئاشکرا بکەم، چونکە بە بۆچوونی خۆم - نەوێران و خۆشگوزەران - هاوتەریبی یەکترین. نابێت گۆمەکە بشلەقێنم و دەگەڵ ئەو مەیلەو فەقێیانە دەست بە مەلە بکەم؛ ئاخر ئەگەر بچمە ناو بابەتەکە، خۆم ئاشکرا دەکەم؛ ڕەنگە ئەمەش بۆ ژیانی ئایندەی خۆم نەك هەر سوودی نەبێت، بەڵکوو زیانیشی لێببێنم! مـن فـرە گردبوونەوەی فەقێیەکانم لا خۆش بوو. ئەو جڤاکەی فەقێیەکان، لەپاش ئەوە کۆدەبووەوە کە وانەکانیان دەور دەکردەوە و (ئاری دەرێ بابە)ی خۆیانیان تەواو دەکرد ئینجا دەهاتنەوە ناو حوجرەکەیان ئیتر ژیانە بێهاوتاکە لەو کاتەوە پەیدا دەبوو. ژوورەکەیان لە دیوەخانی ئاغەی خۆشتر بوو؛ لە دیوەخان، باس هەر باسی دەغڵ و دان و هەوجار و داس و جووت و دروێنە و هێستر و چوونە هەولێر و هاتنەوە بوو و کەمکەمەش باسی پارە و پوول دەکرا، بەڵام لە ژووری فەقێیەکان باسی زمان و دەرس و تاووتوێی فێربوون، باسی مامۆستا و بابەتە ئایینییەکانیان دەکرد. کە باسەکانیش کۆتایی دەهات، یاری کەڵەمستانێ، یان وەك خۆیان دەیانگوت (کەرەمستانێ)یان دەکرد؛ شەویش لەگەڵ ئەو فەقێیانەدا، هەر خۆش بوو و خۆشی تایبەتی خۆی هەبوو.

لەناو فەقێیەکاندا، هەرگیز باسی کەسێك نەدەکرا کە خۆی لەوێ نەبایە؛ پاشەملە حەرام بوو، نەدەکرا! بەڵام ئەگەر گوندنشینێك بهاتبایە ناویان، ڕۆژێك لە پێدانی (ڕادبە)ی فەقێیان دووا کەوتبا، ئەوە ڕۆژی ئەو ڕۆژ

بوو، مەگەر خودا یارمەتی دابا، ئەگینا بە خۆڕایی لە دەستی ئەم هەموو فەقێیانە قورتاری نەدەبوو. ئەگەر ڕادبە نەدەر خۆی بادابایە نەهاتبایە بن نیر و پەیمانی نەدابا کە بۆ بەیانی بانگهێشتی هەموو فەقێیەکان دەکات خواردنیان بۆ دەکات، کۆپەڵانیان لەمل دەکردو وا وەیلا لەخۆی؛ دەبوو هەر پەیمانی بانگهێشتی خواردنیان پێ بدات، ئەگینا تا دەرۆیشتەوە ئەو نیر و کۆپەڵانەیان لەملی دانەدەکەلاند. فەقێیاتی ژیانێکی تایبەتی کوردەواری بوو. لەپێشتر دەستەواژەی (ئارێ دەری بابە)م بە کار هێنا؛ ڕەنگە هەموو خوێنەرێك، بە تایبەتی گەنجەکان، نەزانن ئەمە چییەو چی بووە! ئەمە دەستەواژەیێکی تایبەتی فەقێیان بوو؛ لە کاتی پێداچوونەوەی دەرسەکانیاندا، لە هاوین، لەبەر سێبەری دیوارێك و لە زستانانیش، لە پەنایێکی دوورە با، کتێبەکانیان بەدەستەوە دەگرتو دەهاتن و دەچوون؛ کاتێك، وشەیێك یان ڕستەیێك یان دەستەواژەیێکی خوێندنەکەیان نەدەهاتەوە بیر، ڕانەدەوەستان تا سەیری ناو کتێبەکە بکەن و لەناو کتێبەکەدا بیخوێننەوە. بەڵکوو بێ ڕاوەستان و هەر بەڕۆیشتن و بێ ئەوەی سەیری کتێبەکانیان بکەن، کورتە هەڵوەستەیێکیان دەکردو دەستەواژەی (ئارێ دەرێ بابە) دەبووە 'بنێشتە خۆشکەی سەر زاریان' و چەندین جاران دووپاتیان دەکردەوە و دەیانگوتەوە تا دەرسەماڵوێرانەکەیان وەبیر دەهاتەوەو تەواویان دەکرد.

دەنگی ئارێ دەرێ بابەی فەقێیەکان، بەم شەوە گەرم و سارد و تاریك و ڕوناکانەوە، ئاوازێکی سازگاری، فرە خۆشی لەسەرتاسەری گوندەکانی کوردان پەخش و بڵاو دەکردەوە؛ ئەم نەریتە تەنیا هەر لەناو خوێنەرانی کورددا هەبوو؛ کە گوێم لە ئاوازەکە دەبوو، هەستم دەکرد ئەوا فریشتەکان لە ئاسمانەوە هاتوونەو لەگەڵ فەقێیەکان هەمان ئارێ دەرێ بابە دەکەن و

دەنگەکە بۆ هەموو لایێکی دووشیوانێ دەبەن و ئاوەدانی بۆ ئەو ناوە دێنن و ڕەحمەتی بەسەردا دەبارێنن. کە دەنگەکان تێکەڵی یەکتری دەبوون، سمفۆنیاییێکی خوداوەندانەی خۆش بوو؛ ئەم ئاوازە ساز و تایبەتە، لەهیچ شوێنێکی ئەم دنیایەدا نابیسترا، لەناو ئەو گوندانەی کوردستان نەبێت! لەوێ و لەناو گوندیو لە دەوروبەری حوجرەی فەقێیان ئەو ئاوازانە دەنگیان دەدانەوە و ئەو ناوەیان پڕ سۆزێکی سازدار دەکردو هانی گەنجانیان دەدا تا بچن (ئارێ دەرێ بابە) بخوێنن!

دەرسەکان دەگوترانەوە، ئینجا فەقێیەکان ڕێچکەیان دەبەست و دەهاتنەوە ناو حوجرەکەیان و دەستیان بە مشتومڕە خۆشەکانی خۆیان دەکردەوە. بەو دەرسانەدا دەچوونەوە کە تازە خوێندوویانە. سەیر بوو، لە نوێژکردن بترازێ، هیچ نەدەحەسانەوە! یێك یان دوو سعات پاشتر زۆربەیان پەرتەی لێدەکردو بزر دەبوون. حوجرەکەی فەقێیان تێرایی هەموو فەقێیەکانی نەدەکرد.

برایم ئاغە پەیمانی دابوو ژوورێکی دیکەیان بۆ دروست بکات؛ هێشتا نەیکردبوو! ئەگەر ژوورەکە دروست بکرابایە، فەقێییەکان نەدەگەڕانەوە ماڵەکانیان هەر لەوێ دەمانەوە پتر فێر دەبوون؛ چونکە دەبوو بە کۆمەڵ دانیشن و بخوێنن و دەورەکانیان بکەنەوە و ئەمەش توانای فێربوونیانی پتر دەکرد. داگیرکارانی ئەم خاکە، بەدرێژایی سەدان ساڵی حوکمی کوردستان، هیچ قوتابخانەیێکی، نە ئایینی نە فەرمی، لەسەر تاسەری ئەم دەڤەرە دروست نەکرد. ژوورەکانی فەقێیان بچووك بوون؛ بەڵام فەقێیەکان ناچار بوون خۆیان کورژ بکەنەوە و تێیاندا دانیشن. تا ئێستاش، کەس قوتابخانەیێکی نیشان نەداوم، لەهەموو ئەم وڵاتە و بڵێت — ئەم قوتابخانەیە لەسەردەمی دەوڵەتانی فەرماندارنی کوردستاندا دامەزراوە و خۆیشم لەهیچ

دەزگاییێکمدا نەخوێندووە کە بڵێن دار و بەردەکانی ئەو دەوڵەتانە لەسەر یێکیان دانا، تا منداڵانی کورد تێیاندا بخوێنن!

بەڵێ! داگیرکارەکان لە داکشانی ئاستی زانیاری و زانستی لە کوردستان و لەهەموو ئەو وڵاتانەی فەرمانداریيان کرد، بەرپرسیارن و تا ڕۆژی قیامەت، ئۆباڵەکەی لەملی فەرماندار و دەسەڵاتانی ئەواندا دەمێنێت. زانست لە وڵاتانی ئەوروپایی، پێشکەوت، هەرچەندە کەنیسە و سەرتاسەری قەشەکانیان، لە دژی پێشکەوتنی زانست بوون، چونکە دەیانزانی ئەو زانستانەی زانایانی دنیایی گەشەیان پێدەکردن، بەپێچەوانەی زانستە ئایینییەکانی ئەوان بوون و بەری لە ژێر پێیان دەدزیەوە؛ بەڵام دەسەڵاتدارانی وڵاتانی ڕۆژاوا بەرانبەری کەنیسە و قەشەکان ڕاوەستان و زانستی پێویستییان بۆ زۆرینەی خەڵکەکە و بۆ وڵاتەکانیان بە پێشخست. سوڵتانەکان وا نەبوون و زۆرێك لە مەلایەکانیش، بە فیتی سوڵتان و دار و دەستەکانیان، خۆیان بەبەشێکی ئایەتی (أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ – ٥٩/النساء) خەریك کردبوو و نەیاندەگوت دەبێ (أولي الأمر) ڕاست بێت و دڵسۆز بێت و دادپەروەر بێت، ئینجا پێویستە ملکەچی بیت؛ هەر کەسێکیش بەرانبەر بە فەرماندارێك بوەستابا، با ئەو فەرماندار بێ دین و زۆرداریش با، بێ هەڵوەستە لێکردن، ئەو کەسیان بە یاخی لە قەڵەم دەداو بە کافریان دەناساند بە بیانووی ئەوەی کە لە قسەی حوکمدار دەرچووە، لەناویان دەبرد.

بەم ڕەفتارانەیان وایان لە گەلانی ژێر دەستی خۆیان کرد ببنە کۆیلە و نەوێرن باسی حاکم و دەوڵەتەکەی بکەن. ئیتر مرۆڤ، بەتایبەتی لە کوردستان، کرا بە پاشکۆی سەردەمانی بووری و کرایە مردوو پەرست و یادەوەرییەکانیان لە ژیانی ئێستایان لە لا بەهادارتر کران؛ مەن جۆرە،

ئایندەی کورد تاریك کرا و نەیانهێشت چیتر کۆشش بکات بۆ ئەوەی ژیانی ئێستا و پاشەڕۆژی خۆیان و منداڵەکانیان ڕێك بخەن و ساز بدەن تا خۆشتر لە ئێستاکەیاندا بژین.

با بگەڕێمەوە سەر باسەکەی پێشتر، حوجرەکانی فەقێیان ڕێك و ئاسایی و سادەو خاوێن بوون، بەڵام وەك مەدرەسەیێك لێکرابوون‌و فەقێیەکان بابەتەکانی خوێندنی خۆیانیان لەو حوجرانەدا هەڵدەسەنگاند و تاوتوێیان دەکردن و دەوریان دەکردەوە. گەلێك جاران ئەو فەقێیانە لەسەر بابەتێك ڕێك نەدەکەوتن؛ یێك ڕێ، یێك ڕا، نەبوون‌و بە یێکتر نەدەگەیشتن. دابەش دەبوونە چەند لایێك و نەیاندەتوانی لەسەر خاڵێکی هاوبەش کۆببنەوە؛ ئاخر هەموو کورد بوون، کوردیش هەروا بووەو هەر واش دەمێنێتەوە؛ مەگەر موعجیزە لەناو کوردەکان ڕووبدات، ئەگەر نا هەر ئاوا دەمێننەوەو هەر ئاواش بە هیچ ناگەن کە سوودی بۆ هەموو لایێکیان هەبێت. ئەو حوجرەی فەقێیانەش کوردستانێکی بچووك کراوە بوو؛ ئەستەم بوو بتوانی هەموو فەقێیەکان ببینی کە لەسەر یێك ڕا، بە دوای یێك ڕاو بکەون؛ ئەستەم بوو کۆك بن‌و کۆ بنەوە؛ چارەسەری مامناوەندییان نەبوو! کە لە جیاوازی نێوانیان وردبوومەوە، تێگەیشتم نە ئەوەندە سەرچاوە و نە هێندە زاراوەیان لە دەربارەی ئەو بابەتانەوە هەبوو کە هەڵیان دەتەکاندن؛ جا گەیشتن بە خاڵی هاوبەش ئەستەم بوو. ئاسان نەبوو لەنێوان خۆیان لەسەر بابەتێك ڕێك بکەون، بۆیێ، هەندێك زۆربەی ئێوارەکان لە یێکتری زویر دەبوون‌و چینێك بە لالوتی لە حوجرەکە دەردەچوون. منیش خەمبار دەبووم؛ چونکە لەبەر ناسکی هەڵوێستەکەم، نەدەوێرام خۆم لە مشتومڕەکانیان بگەیێنم و لای چینی ڕاستیان مەیلەو ڕاستییان بگرم.

گوندی دووشیوانم کەوتە دڵ! بووە دووا مەنزلگەم! خەریکبوو لە کاری شوانیش ڕادەهاتم و برینەکەی خۆمم لە بیر دەچووەوە، هەندە بە جوانی دەڕۆیشتم، ئەوەی پێشتر نەیدیتبام و نەیناسیبام، ئەستەم بوو بزانێ چەند حەفتەیێك پێشتر نەمدەتوانی تا مزگەوت بچم. چاك بوومەوە. گەلەك ناخۆشییەکانم خامۆش بوون، بەڵام ئەستێرەی سارا لەبەر چاوم ئاوا نەدەبوو! لەهەر شەش لاوە گەمارۆی دابووم!

مێگەلە مەڕی برایم ئاغەی مەنتکم ڕادەداو بۆ دەشتو دۆڵ و سەر گردەکانی دەوروپشتی گوندەکەم دەبرد، بەڵام هەرگیز لە گوندی دوور نەدەکەوتمەوە. هەر هێندە جودا دەبوومەوە، تا لە ئاوەدانی بزر دەبووم. ئینجا لە شوێنێك دادەنیشتم کە ئەو ڕێ و بانەی دەور و پشتمم لێ دیار بێت، بەڵام وامدەکرد من لە ڕێبواران دیار نەبم. ئێستا خۆم بشارمەوە باشترە نەك پاتاڵی خۆم هەڵدەم و پاشان دەستان ماچ بکەم تا وەرمبگرنەوە و شاروەدەرم نەکەن.

کە خۆم بزر دەکرد، ئەوجا کتێبێکم لەو کتێبانە دەردەهێنا کە لە بن کورتانی کەرە گولەکەمدا شاردبووەوە، و دەورم دەکردەوە. ئاخر ئەسپەکەم نەمابوو، پێویستم نەبوو؛ تەنیا مرازم ئەوە بوو ئەو زانیارییانەم لە بیر نەچنەوە کە پێشتر خوێندبوویانم. هەر بۆیێش کتێبەکەم لە ژێر کورتانی کەری شوان دەپاراست، تا کەس نەیبینێ و نەزانی من خوێندەواریم هەیەو کتێب دەخوێنمەوە. جاری وا هەبوو کتێبەکەم تەڕ دەبوو، ئاخر ئاوی ناو دێمکەی سەر پشتی کەرەکەی بەسەردا دەتکاوە.

جارێکیان هەندە ئاوی ناو دێمکەکە جۆڕابووەوە و دلۆپەی بەسەر کتێبەکەدا کردبوو، تەواوی لاپەڕەیێکی دەستنووسەکەی لەکەدار کردبوو و یێك دوو ڕێز نووسینی هەر تێك دابوو؛ ئیتر نەدەخوێندرانەوە! ڕەنگی ئەو

دێڕانەی ئاوەژوو ببوونەوە، وەك ئاستی زانینی فەقێیەکانی حوجرەکەی گوندی لێهاتبوو، تەماشات بکردایە، دەتزانی ئەمە پێشتر نووسین بووە، بەڵام نەتدەزانی بیخوێنییەوە. فەقێییەکانیش کە دەکەوتنە لێکدانەوەی کتێبەکان، دەتزانی ئەمانە شتێکیان خوێندووە، بەڵام نەدەتواندرا لێیان تێبگەی، چونکە ئەوان خۆیان ئەوەی خوێندبوویان، تێکەڵ و پێکەڵ و ئاوەژووی ناو مێشکیان ببوو.

بەڵێ! فەقێ بوون! ئەوەی نەنگ بوو ئەوەبوو کە خۆیان بە زانا دەزانی، بەڵام نەك هەر زانا نەبوون، بەڵکوو فەقێی نەزانیش بوون! لەسەردەرەی فێربوون ڕاوەستابوون و نەچووبوونە ناو زانستە ئایینییەکان و ڕەچاویش نەدەکرا بەم زووانە ببنە مەلاو بتوانن خوتبە بخوێننەوە یان وەعزان بدەن.

## سەگەکانی ماڵی ئاغەی

کە ڕانە مەڕەکەم بۆ لەوەڕ دەبرد، دوو گەمبۆڵی کەنگاڵی ماڵی ئاغەم بۆ پاسەوانی مێگەلە مەڕەکە، لەگەڵ خۆمدا دەبرد. پێشتر لە کتێبە بەناو و دەنگەکەی (الحیوان) کە ئەلجاحظي فەیلەسوف، لە سەدەی هەشتەمیندا نووسییەتی، چەند شتێکم لە دەربارەی سەگ خوێندەوە.

جاحظ دەنووسێت – 'سەگ لە پاسەوانی و لە ڕاوکردندا، شارەزا و زیرەك و وشتن.' سەرباری ئەم نووسینەی ئەم چاودەرپەڕیوە نووسیویەتی، منیش دڵنیاتان دەکەمەوە کە دڵسۆزی سەگ بۆ خودانەکەی زۆر لە دڵسۆزی خزمەتکار بۆ گەورەکەی، دڵسۆزتر و ئەمینتریشە. گەلەك جاریش بیستوومە کە سەگ شت لە بیر ناکەن و ئەو کەسەی پێشتر ناسیبیان، لە بیریان ناکەن و دەیاننا‌سنەوە و ئەو ئامـاژە و هێمایانەی پێشتر لە کەسێك فێر بووبن لە بیریان ناچێتەوە و بە گوێی دەکەن. بە کورتی کورد دەڵێ – "سەگ لە کەسی بێ سیفەت دڵسۆزترە."

ئەوەشم بیستووە دەگوترێت 'سەگ وشیار و زیرەکە، جێی متمانەیە و ئەوەی فێری دەبێتو ئەو کەسەی بیناسێت، هەرگیز لە بیریان ناکاتو پشتی پێ دەبەسترێ.' بۆیێ هەستام خۆم فێری ڕاهێنانی سەگ کردو پاشان هەردوو سەگەکانم پێکەوە مەشق دان. وا بە چاکی هەردووکیانم فێرکرد، ئیتر دەمتوانی دڵنیابم کە ئەگەر خۆیشم لەوێدا نەبم، بەهەردوو سەگەکان، ڕانە

مەڕەكە بپارێزن و نەشهێڵن تەنیا یێك تاكە مەڕیش، لە ڕانەكە، ترووودی بێت. سەگەكان فێر ببوون نەیاندەهێشت مەڕەكان بەو دەشتەدا بڵاو ببنەوە. هەردووكیان وەك منداڵی زیرەك لەگەڵ ئاماژەكانم دەجوولانەوە. كە هەردووكیان نزیكم دەبوونەوە، فیكەیێكم بۆ لێدەدان، ئیتر خێرا دەچون و دەوری مەڕەكانیان دەگرتو ڕانەكەیان بۆ نزیكی من دەهێناوە.

فێری ئەوەشم كردبوون كە چۆن چاودێری ئاژەڵە كێویو زیانبەخشەكان دەكەن، چۆن ڕێیان لێدەگرن ناهێلن لە ڕانەكە نزیك ببنەوە. ئەگەر گورگێك یان چەقەڵێك زاتی ئەوەی بكردایە و لە ڕانەكە نزیك بووبایەوە، هێرشیان دەكردە سەر و زیرەیان لێ هەڵدەستاندن و ناچاریان دەكردن لە مەڕەكان دوور بكەونەوە و تۆبەیان پێیان دەكرد، نەكا جارێكی تر ئەم هەڵەیە دووبارە بكەنەوە لە مێگەلەكە نزیك ببنەوە.

فێری ئەوەش ببوون ئەگەر سەرێك و دوو سەر لە ڕانەكە دوور بكەوتبوونایەوە، زوو دەچوون و زۆر بە شارەزایی دەیانهێنانەوە و ئازاریشیان نەدەدان و ڕێشیان پێنەدەدان دزە بكەن بۆ ناو دەغڵ و شینایی خەڵكانی دیكە بچن و بە حەرامی لێیاندا بلەوەڕێن. زۆربەی كارەكەی من، ئەو دوو سەگە جێبەجێیان دەكردو منیش دادەنیشتم و بە نهێنی كتێبەكانم دەور دەكردەوە و سەگەكانیش پاسەوان بوون.

لەدوا قۆناغدا، سەگەكان فێری هەموو ئیشەكەیان ببوونو ئەركی خۆیان بە ڕەهایی فەراهەم دەكرد. هەرچم لێیان داوا بكردبایە، وەك مرۆڤ، پشتی ملی خۆیانیان نەدەخوراند، بەڵكو حەپەیێكیان دەكردو دەردەچوون و بە غاردان قسەی منیان ڕادەپەڕاند. كەسم نەدیوە هێندەی ئەو سەگانە لە گوێ و حەمدی خاوەنەكەیاندا بن. خۆیشم كەم و زۆرێك، هاریكاری

سەگەکانم دەکرد؛ چونکە ئەوان هۆشی ئەوەیان نەبوو بزانن کەی ڕانەکە تێنووە و دەبێت‌و پێویستە ئاو بدرێ، من ئەوەم دەکرد.

سەگەکان شارەزا بوون لەوەی نەهێڵن مەڕەکان بچن لەو زەوییانەی خەڵکیدا بلەوەڕێن کە لە قەراخی ڕێگەدا بوون. ناوە ناوە سەگەکان دەهاتن سەریان لێدەدام. منیش نەختێك پاداشتی خواردنم پێدەدان. لەتێك نانم لە شیری مەڕەکان هەڵدێنجا و لە پێشم دادەنان‌و ئەوانیش کلکی خۆیانیان بادەداو نانەکەیان دەخوارد، کە تێر دەبوون، سەریان هەڵدەبڕی و کلکە سەماییێکیان بۆ دەکردم‌و چەند جارێك دەور و بەری منیان دەپشکنی و زەوی‌و کورتان و بن کلکی کەرەکەیان بۆن دەکردو حەپەیەکیان دەکردوەك ئەوەی سوپاسم بکەن، پاشان هەیپایان لێدەکردو بۆ چاودێری ڕانەکە دەچوونەوە. گەلێك جاران خۆزگەم دەخوازت مرۆڤ هێندەی ئەو سەگانە بە ئەمەك و دڵسۆز با!

منو هەردووك سەگەکانم تیمێکی توکمەی یێکگرتوو و کارامەمان پێکهێنابوو. چیرۆکی هەر دوولامان، وەك ئاگری ناو پووش، بەناو خەڵکی دووشیوانێدا بڵاو بووەوە. سەربردە و چیرۆکی سەیر و سەمەرە لە باسی پەیوەندی من‌و سەگەکان لەناو خەڵکی درووست ببوو. سەریان سڕمابوو لەم پەیوەندییەی لە نێوانی مرۆڤ و سەگەکاندا هەبوو! گوێم لێبوو دەیانگوت:

"ئەو سەگانە کوو هەندە وریا و چالاك و زیرەکن؟! کوو هەردەم لە گێ و حەمدی ئەو شوانەن و بە قەدەر نووکی دەرزی لە قسەکانی پاژنەبڕای لانادەن؛ هیچی لێ هەرنابێرن و لێی ناترازێن!" ئەو خەڵکە هەر ئەو قسانەیان دەگوت‌و دەگوتەوە و بابەتەکە دنیای گوندی دووشیوانی مەنتکانی تەنیبوو!

"ئـەوە کـوو ئـەو قومپـانی بڕایـە ئـەوها لەگـەر ئـەو سـەیانە ڕێـك کەتییە؟" پرسیار دەکرا و وەڵامیان نەبوو.

"ئەو سەیانە هەنـدە بـە باشـی مەشـق درایـنـە، هەرکـە قومپـانی بـڕای هۆیهایان لیدەکا، ئیدی ئەوان یێکسـەر ئـەو لا و ئـەو لای مێگەلەکـە دەگـرن و نایێلن کێشکەش لەناویان قورتار بیێ!" مەنتکێکی دیکە وتی.

"کاکـــە، نـــازانم کـــوو ئـــەو ســـەیانە هەنـــدە بندەســـتی ئـــەو قومپانیبڕایەینە؟" یەکێك دەیگوت و نەیدەبڕیەوە.

" ئـەمن مەرەقمـە بـزانم ئـەو شـەلەیە، کـوو دەزانـی قسـە لەگـەر سەیەکان بکا؟" یەکێکی تر پرسی و نەیپساندەوە – "ئـەمن بـە چاوی خـۆم ئـەو حەمـە قومپانیبڕایـەم دیـتو بـەگێی خـۆم گـێم لێیبـوو بـە سـەیەکانی دەگۆت – غاردەن. هـەردووکیان وەك مـامزی هـەردەهاتن. کووش پێـی گـۆتن دانیشـن، هـەردووکیان وەرکـەتن! کـە پێشـیانی گـۆت – وەرنـە کنـە مـن، هـەردووك لەبـەر پێـی حەمـە ڕاوەسـتان و بـە چـاوی خـۆم دیـتم سـەیەکان چاویان تێی بڕیبوو. ئەو کابرایە وەی لێکردینە لە زمـانی ئینسانی دەگـەن." ئەمەی دەووترا و دەووترایەوە؛ سەری خۆی بادەدا!

"ئەمن هاتیمە سەر ئەوەی بـڕێم ئـەو پیـاوە جنۆکـەی لـەناو قەلبیـدا هەیە." یەکێك ئەمەی لە دەم دەرچوو.

"هـەموو شـتەك لـەم دنیایـەدا دەبـی، لـۆ نـا؟" پیرەمێردێـك وەڵـامی دایەوە و بووە پێکەنین.

خەڵکەکە هەموو کاروباری خۆیـان لـە بـیر کردبـوو و خۆیـان بـەو دوو سەگەی ئاغە خەریك کردبوو! قسەو قسەلۆك هەر لە دووشـیوانێ ڕانـەوەسـتا، ناو بانگی ئەو پاژنـەبڕاوە گەیشـتە کـانی بـزرە و بێسـتانەو لـەو دوو گونـدەش ڕەتیـدا و لـە گردەسـۆر و خوڕخـوڕ و ئازیانەشـدا دەنگـی داوە؛ کـەس نـازانێ،

ڕەنگە ئەو ناوبانگە گەیشتبێتە زڕگوێزیش! من بەرپەرچی هیچ کەسێك و هیچ قسەیێکم نەداوە، هەر خەریکی ئەوە بووم باشتر فێری شوانیو مەڕداری ببم. قسەکەی عارەبانم باش لە بیر بوو کە دەڵێن — (مَنْ راقَبَ النّاسَ ماتَ هماً - ئەوەی چاودێری خەڵکی بکات، لە خەمان بە سگ دەدات).

من ڕۆژ لە ڕۆژ پتر شارەزای سەگەکان دەبووم، ئەوانیش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پتر لە ئامازە و قسەکانم ڕەهاتر دەبوونو خەڵکەکەش ئەمڕۆ لە سبەی قسە پتریام بۆ هەڵدەبەستام. سەگەکان شارەزای جۆری فیتەلێدانم بووینە. بە یێك فیتە، دێنە لام. بە دوو فیتە لەخۆم دوور دەکەونەوە. فیتەی درێژ لە مێشکی سەگەکان بە پاسەوانی دەهات و ئیتر وشت و بەئاگاو چوست ڕادەوەستان تا بزانن ئەنجامەکەی چییە. کە فیتەی کورت و بە دووای یێکتر لێدەدرا، سەگەکان لەسەر دەستەکانیان دەڕۆیشتن، وەك ئەوەی قاچیان هەر نەبێت!" ئەمە هەموو ئەو هەڵبەستە سەیر و بێ بنەمایانە بوون کە لەناو بێرییانەوە، بۆم دەهاتنەوە. ئەو قسانەی بەمن دەگوتران، هیچیان وانەبوون؛ ئاخر عەقڵ پەسندی نەدەکردن! قسەکان وەك خەنجەر دڵیان دەهاڕیم. لەڕاستییان تێپەڕاند. دووا جار ئەوە بوو منیان کردە جادووگەر؛ ماڵی باوکتان نەڕمی وتیان ئەو شوانە سحربازە! سبحان الله!

ئەم قسانە خزێندرانە ناو دیوەخانی برایم ئاغەی مەنتك. ئەو جوامێرە ژیرە بەم قسانەی باوەڕ نەکرد؛ بەڵام چونکە سەرۆکی هۆزەکە بوو، ناچار بوو وە بنی قسەکان بگات و بزانێت باسەکە چییە کە ئاوا جڤاکی مەنتکانی هەژاندووە. ئاغە کابرایێکی بە دووامدا نارد. ئەویش تێیگەیاندم کە ئاغە وا چاوەڕێمە. منیش چوومە دیوەخان و سەلامی خۆم لە ئامادەبوون کرد.

"دانیشە." ئاغە فەرمانی پێکردم.

منیش دانیشتم.

" قومپانیبڕای!" ئاغە بە نەرمە زەردەخەنەیێکەوە، پرسی: "پێمبڵێ، ئەو سەربردەیەی توو لەگەڵ ئەو سەیانە، چییە؟"

"ئاغە، سەربردەی چی؟" خۆم لەلایێکی ترەوەم هێناوە و وەڵامی ئاغەم نەداوە.

"سەربردەی خۆت و ئەو دوو سەیانە، چییە؟" ئاغە پرسی، "خەرکی گەلەك باستان دەکەن‌و قسەی ئەنتیکەتان لەگەڵ سەیەکان لێ دەگێڕنەوە!" ئاغە بۆی ڕوون کردمەوە.

"بەڵێ! بەڕێزتان دەتانەوێ چ لە دەربارەی سەگەکانتانەوە بزانن؟" لە ئاغەم پرسی.

"دەمەوێ هەموو شتەکی بزانم." وەڵامی دامەوە، هەڵوەستەیێکی کرد ئەنجا گوتی، "تکایە!".

"ئاغە! سەگەکانی ئێوە زیرەکن. لەوە زیرەکترن کە زۆر کەس تا ئێستا وایان نەدەناسین." جەختم لەسەر وشەی (ئێوە) کردەوە، تا ئەوانەی لەوێ دانیشتوونە، خۆیان لە ئیشەکە بە خاوەن نەکەن. پاشان ڕووی خۆم وەرسووڕاند و سەیری ئامادەبووانم کردو وتم – "بەڕاستی، جوامێرینە! لەهەموو ژیانم هیچ سەگێکم نەبینیوە وەك ئەو سەگانەی برایم ئاغە، زیرەك بن." ئەمەم بە هەمووان ووت. ئینجا ڕووی خۆم بۆ برایم ئاغەی مەنتك وەرگێڕا و قسەکانم بۆ بەڕێزیان کردو وتم –

"ابراهیم ئاغەی مەنتك! ئەو سەگانەی تۆ وەکوو سەگی هیچ کەسێکی تر نینە. لەم ناوەدا هاوشێویان نەبووەو نابێت!" براگەورە جێی خۆی خۆشتر کردو شانازکردنی بە سەگەکانییەوە، لە ئاکاری وەدەر کەوت. منیش کە ئەم پیاوەم بەم شێوەیە بینی، دڵنیا بووم کە نیشانەکەی خۆمم شکاند!

ئینجا وتم – "ابراهیم ئاغە! ئا لەم دانیشتنە و لەبەر چاوی ئەم هەموو جوامێرانەی مەنتکایەتی، دڵنیات دەکەمەوە، کە سەگەکانی جەنابت، لە هەندێك ئادەمیزاد هۆشمەندتر و بەئاگاترن! بەڵێ، لەوانە عاقڵترن، کە قسەو قسەلۆك دێنن و دەبەن." ئەم قسانەم زۆر بە توندی و بە چوستی و بە هەستێکی ڕاستەوە کرد، چونکە پاشملەی ئەو خەڵکە برینداری کردبووم. قسەکانیشم، بە باشی، سەرنجی ئاغەیان ڕاکێشا و لەلاییێکی تریشەوە، ئەو خەڵکەی ئەوێی هەموو بێ دەنگ کردو کشومات دامان. ئەوانەی ئەو قسانەیان بۆ ئاغەی هێنابوو، خۆیان کورژ کردبووەوە و چاویان شۆڕ کردبوو!

"ئاغە!" ویستم هێشتا سەرنجی باشتر ڕابکێشم؛ ئاخر هێشتا بە تەمای قسان بووم. قسەکانم مابوون، تەواو نەببوون!

"بەڕێ، پاژنەبڕای! لەوە پتر چت پێیە؟" ئاغە پرسیاری کرد.

"سەگەکانی ئاغەی بێهاوتانە! کە هەردووکیانم بینی، لەو دۆڵە، ڕاوی گورگێك دەنێن، دڵنیا بووم کە بێهاوتا و ژیرن." بابەتەکەم بۆ ئاغەی ڕوون دەکردەوە، "هەردوو سەگەکان لەلاییێکەوە، پەلاماری گورگەکەیان نەدا! جودا بوونەوە." زەینی برایم ئاغەم دا تا بزانم چ لە ئاکاری دیار دەدا، دیتم شانازی لە چاوەکانی دەترووسکانەوە؛ جا نەوەستام‌و وتم – "ئاغە! سەگەکانت لە یێکتری دوور کەوتنەوە، بەرەیێکی دوو باڵییان پێکهێنا." دەبوو ئاکاری ئاغە بخوێنمەوە. هەردوو چاوی ئاغەی تروسکەیان دەدا، زەردەخەنییێکی نایاب بەسەر لێوەکانیدا هات و هەژاندیانیەوە و بە هەموو هەست و هۆشییەوە، گوێی لێڕاگرتبووم کە وتم – "سەگێکیان لای چەپ و ئەویتریان لای ڕاستی لە گورگەکەی گرت،" و وێنەییێکی باشی ئازایی و چەپووکی سەگەکانم نیشان دا و ئاماژەم بەوە کرد کە سەگەکان هێزیان لە

گورگەکە بڕی و ناچاریان کرد بە خێرایی لەبەر دەستیان هەڵبێت و ئیتر ببڕای ببڕ، بیر لە گەڕانەوە نەکات.

ئینجا پاش ئەم هەموو ڕاڤە کردنە، هەڵوەستەیێکم کرد، بەڵام سەیر ئەوە بوو، کەسێك نەبوو لەناو دیوەخانەکە فزەی لێوە بێت؛ هەموویان دەمیان واڵا و چاویان زەق ببووەوە. جا گوتم - "گورگەکە هەڵات و مەیدانی چۆڵ کرد! هیچ زیانێکی نە بە ڕانەکە و نە بە سەگەکان نە بە خۆیشم، نەگەیاند. ڕایکردو تا ئێستاش جارێکی دیکە ئەو هەڵەیەی نەکردووەو نەگەڕاوەتەوە. منیش لەو باوەڕەدا نیمە، کە جارێکی دیکە گێلاتییەکی ئاوا بکات و بۆ ئەم ناوە بێتەوە. ئاخر سەگەکانی ئاغەی، ترسێکی ئاوایان وەبەر ئەو گورگە نەدا کە لە بیری بکات." ئەم هەمووەم گوت بێ ئەوەی کەس دەنگی لێ وەبێت، یان ڕەخنەیێك بگرێت، بۆیێ هانی خۆمم دا پتر باسی ئەوە بکەم کە ڕاونانی گورگەکە ئەوە دەسەلمێنێ کە سەگەکانی ئاغەی لەوە زیرکترن کە تێیان دەگەن. "سەگەکانی برایم ئاغەی دەرسێکی باش فێری مرۆڤ دەکەن. ئاغە ئەوەی دەڵێم، وا نییە؟" پرسیم.

"بەرێ، بەرێ! کوو وەنییە؟" ئاغە گوتی:

لەگەڵ ئەمەشدا، من دڵنیا بووم کە نیوەی ئامادەبووان، هیچ لەو شارەزاییە سادە و ساکارە سەربازییانە تێنەگەیشتن کە من باسم کردن، جا هەڵوەستەیێکم کرد تا لە کاردانەوەی برایم ئاغە بگەم و بزانم ئەو چۆن تێیان گەیشتبوو. ئەو باوەڕی بە قسەکانم کردبوو. هەستم کرد ئاسوودە بوو، جا منیش وەك ئەووم لێهات. هەناسەیێکی درێژم هەڵکێشا و بە متمانەوە وتم:

"ئاغە! دەتوانم پێتان ڕابگەیێنم کە ئەم دوو سەگەی جەنابتان، دەبنە باشترین و دڵسۆزترین پشتیوانی خۆم و چاکترین پارێزەرانی

ڕانەکەتان." دیسان جەختم کردەوە کە دەتوانم ئاغە دڵنیا بکەمەوە کە هەردووک سەگ لە ناسکترین و لە سەختترین کاتدا پشت و پەنام بووینە و نازانن درێغی لە ئەرکەکانیاندا بکەن و وتم – "ئێمە هەر سێکمان یێک چەپارەییێکمان پێکهێناوە، ناکرێ ئەو چیوەیەی ئێمە بشکێت؛ هەر سێکمان بە یێک مێشك بیر دەکەینەوە. دەتوانم، لە هەندێك کەس، پتر پشتییان پێببەستم و متمانەیان پێبکەم." پاشان داوام لە ئاغەی کرد تا ناو لەهەردووك سەگەکان بنێت.

ئامادەبووان هەموو بە یێک دەنگ پێکەنین و بووە کۆڕێکی سەفابەخش؛ بەڵام ئاغە هەستی خۆی ڕاگرت و پێنەکەنی! دیار بوو زۆر بە باشی لە نیازی من تێگەیشتبوو؛ نیازم هەر ئەو هێندە نەبوو کە برایم ئاغە ناو لەو سەگانە بنێت، بەڵکوو بۆ ئەوەم بوو هەموو خەڵکی گوندی لەوە تێبگەن کە من خودانی سەگەکان نیمە؛ بەڵکوو سەگەکان خاوەنی خۆیان هەیەو من تەنیا شوانەکم و ئیش و کارەکانی مێگەلەکە بەدەستی من نینە؛ هەمووی بەر فەرمانی برایم ئاغە ڕەها دەبن.

ئەو جوامێرە زۆر بە چڕی زەینی خۆی لێ ڕاگرتم. وەخت بوو بە چاوەکانی بچێتە ناو مێشکم؛ گەرەکی بوو بزانێت چۆن شوانێکی نەخوێندەوار ئاوا بیر دەکاتەوە! باش لە ئاغەی تێگەیشتم و تویکڵەی هزریم خوێندەوە. ئینجا سەری خۆی بۆم لەقاندەوە و تێیگەیاندم کە بنی قسەکانمی هەڵهێناوە. ڕەنگە کەسانێك لە ئامادەبووان ڕێیشیان بە مەرامم نەبردبێتو کوردووتەنی، لەلای ئەواندا – 'ئاش لە خەیاڵێك و ئاشەوان لە خەیاڵێکیتردا بوو.'

"کورە قومپانی برای!" یەکێك لە ئامادەبووان هاواری لێکردم، بەر لەوەی ئاغە دەمی خۆی لێ وەکاتن.

"بەڵێ، فەرمووا" وەڵامی کابرام داوە.

"بە خێری خۆت، دەتوانی سەیەکانی منیش وەکی ئەو سەیانەی خۆت مەشق بدەی؟" کابرا پرسی.

"من بەرفەرمانی ئاغەم، برا!" ئەمە وەڵامی من بوو و ئەویش زۆرتری دەویست و وتی:

"زۆرم پێخوشە سەیەکانی منیش ئەوها مەشق بدرێن کە بتوانن وەکی ئەو سەیانەی خۆت مەڕەکانی منیش بپارێزن، ئاخر هەموو دەزانین ئەو سارەکە گورگ زۆر بووینە." کابرا داوای لەمن کرد؛ وەك بڵێی هیچ بایەخی بە برایم ئاغەی نەدا.

"نا! ئەوانە سەگی من نینە. ئەوانە سەگەکانیماڵی برایم ئاغەینە. نانی ماڵی برایم ئاغەی دەخۆن." ئەمەندەم گوتو ڕاوەستام.

دەمویست بزانم نەکا ئاغە لای ئەو خواستە بێتو بیەوێت دەگەڵ سەگەکانی خۆی سەیەکانی ئەو کابرایەش مەشق بدەم؛ ئەمەش شتێك بوو کە خۆم نەمدەویست بیکەم. ئاخر ئەمە کار و پیشەی من نەبوو. من بە ناچاری و لە ناچاری خۆم بوو، بوومە شوان! کە برایم ئاغە لای کابرای نەگرت و دەنگی نەکرد، ئیتر کاری خۆم بوو، بابەتەکە ڕوون بکەمەوە و وتم —

"من هیچ دەسەڵاتێکم نییە و ناتوانم." ئیتر بڕیمەوە. بەڵام بە داخەوە! دیار بوو کابرا پێ ی داگری لێ دەکردو دەیویست ناچارم بکا کە ئیشەکەی بۆ بکەم، بەڵام بۆ ئەو تەنیا زیندە خەون بوو، جا پێیم گوت — " خاڵۆ! من دەسەڵاتی ئەوەم نییە کە بتوانم توولەکانت ڕابێنم؛ چونکە من بەرفەرمانی برایم ئاغەم. من شوانی ڕانە مەڕی ئەوم و ئەو نانم دەدات و منیش تەنیا ئەو سەگانە مەشق دەدەم کە ئاغە فەرمانم پێدەدات." ئەمەم گوتو چیتر نەما.

برایم ئاغە سەیری کابرایەکەی کرد کە خواستەکەی لێ دووبارە کردمەوە و بە شێنەیی لەگەڵیدا قسەی کردو ئەوانی لەوێش دانیشتبوون، هەموویان لە شێوەی قسە نەرمەکەی ئاغەی گەیشتن. ئیتر هیچ کەسێکی دی زاتی ئەوەی نەکرد خواستی دیکەم لێبکات. جا ئیشەکە لێرە بڕاوە بەڵام برایم ئاغە، وەك چۆن هەمیشە دەبوو بە بنج و بنەوانی بابەتەکان بگات بزانی ئەنجامەکانیان چ بووەو چ دەبێت، ئەمجارەش فەرمووی:

"مەنتکینە، تەماشام کەن! گوێ بگرن و گوێتان لێم بێ،" ئاغە ئاوازی قسەکانی خۆی گۆڕی.

"بەرێ، ئاغە!" خاوەنی خواستی مەشقدانی سەگەکان وتی.

"هیچ شت و هیچ ئیشەك لە قومپانیبڕای مەخوازن هەتا لۆتان بکا." ئاغە بۆ هەمووانی ڕوون کردەوەو ئینجا پێی ووتن – "ئەو پیاوە نە سەی کەس مەشق دەداو نە هیچ ئیشیش لۆ کەس دەکاو نە لەباتی کەسەکی دیکەش دەکا." قسەکانی کردو تێیگەیاندن کە – "ئەگەر حەمە ئیش لۆ توو بکا، دەبی لۆ هیدیکەش بکا، ئیدی مێگەلەکەی من لۆ گورگ و توورگ و کەمتیارەکانی ئەو ناوە بەجێ دەمینێ." ئاغە بە گرژی ئەو قسانەی کردو وەك جاران نەگرژییەوە، پاشتر سەیری منی کردو پێی گوتم – "ئیشەکەی خۆت خۆش بوێ و بیکە، گێت لە قسەی کەس نەبی." ئاغە بۆ دڵدانەوەم جەختی لەم ڕستەیەی خۆی کردەوە.

"بێگومان، ئاغە! تەنیا گوێ بە فەرمانی جەنابتان دەدەم." بە زەردەخەنەیێکەوە وەڵامی برایم ئاغەم داوە.

"بەرێ هەموو تێگەیشتین." پیرەمێردێك لەناو ئاپۆڕەی ناو دیوەخانەکە، بە دەنگێکی لەرزۆکەوە، ئەم قسەیەی کردو ویستی هەوێزەکە پاك بکاتەوە و بە ئاغەی گوت – "ئاغە! توورە مەبە، دنیا هەر ئەوها دەبی.

دووشیوان گوندەکی گەورەیە، هەموو شتەکی قەت بە دری هەمووومان نابی."

پیرەمێردەکە تا قسەکانی خۆی کرد، هەناسەی لەبەر بڕا.

کابرایێکی تر، دیار بوو دەیویست بابەتەکە بگۆڕێت، بۆیێ پرسیاری لە ئاغەی کردو وتی - "برایم ئاغە!" ئاغەش ئاوڕی لێی داوە و ئەویش ماوەیێك کپ بوو، پاشان ناچار بوو بێتە دەنگ و بڵێ - "ئەرێ ئەتوو ئەو داخوازییەت لە بیر چوو، شوان لێی کردی؟" قسەکەی کردو لیکی خۆی قووتداوە. پێدەچوو برایم مەنتك لە پرسیاری کابرا فرە قایل نەبی، بەڵام بەسەر خۆی نەهێنا و لێی دەرباز بوو و گوتی:

"ڕاست دەکەی! حاجی، باشت کرد بە بیرت هینامەوە." ئاغە وەڵامی داوە و پاشان ڕووی لەمن کردو گوتی - "پاژنەبڕای،" ئیتر هەڵوەستەیێکی نەکرد تا وەڵامی بدەمەوە و فەرمانی پێکردم - "دەبرێ، دوو ناوان لۆ سەیەکان هەربژێرە، بزانم رام لێیان دەبی یان نا." ئاغا زەردەخەنەی هات و سەیری لێوانی دەکردم.

کابرایێك لێی وە پێش من کەوت وتی - "با سەگە بۆرەکە ناوی (ئازۆ) بێتو بەڵەکەکەشیان، با ناوەکەی ببێتە (هێزۆ)." نەمزانی ئە پیاوە ئەم دوو ناوەی کە پێنشیاری کردن لە کوێوەی هێنابوون، تا بە توانج پێیان ووت - "ئەوەیە خیندەوار!"

چەند ڕۆژێك بەسەر ئەم دانیشتن و قسەو پێشنیازەدا ڕەت بوو، بەڵام من هیچ ناوم بۆ سەگەکان هەڵنەبژارد و هەردوو ناوە پێشنیار کراوەکانم پشتگوێ خستن. هەر سەگێك و بە فیتەی تایبەتی خۆم بانگم دەکردو ئەوانیش لە فیکەکە تێدەگەیشتن. بە بۆچوونی خۆم ناوەکان هیچ واتاییێکیان نەدەبەخشی. پێشنیازەکەم، ئەگەر کردبێتم، تەنیا بۆ قووڵکردنی پەیوەندی خۆم و برایم ئاغە بوو. ئاخر خۆشە پەیوەندیت دەگەڵ کەسی مەرد و

جوامێر هەبێتو هەوڵ بدەی پەیوەندییەکە بتەوتر و قووڵتر و ڕاستتری بکەی. پیاوی وەك برایم ئاغەی ڕاستو دروست و مەرد و سەربەرز، دەگمەن بوونو لەهەموو شوێنێك پەیدا نەدەبوون تا برادەرایەتییان لەگەڵ پەیدا بکەی؛ ئەو پەیوەندییەی ئاغەی لەگەڵ مندا، لەوە بڕکی کردبوو کە ئاغە یەقینی بوو من نەخوێندەوار نەبووم‌و لە هزریشیدا سەپابوو کە نە دەگونجا من کابرایێکی بابردەڵەی بێ بنچ و بنەوان بم، بەڵام هێشتا ئاڵای خۆمم لە پێش ئەو جوامێرە هەڵنەکردبوو؛ بەڵام لە دڵڕا پێمخۆش بوو پەردەکە لەسەر ئەم نهێنییەی خۆم لە پێش برایم ئاغەی مەنتك لادەم.

## هیشکە دەودەوانێ

هەر ئێوارەیێك، کە خۆر ئاوا دەبوو، بەرەو حوجرەی فەقێیان شۆڕ دەبوومەوە. لەوێ لەناو فەقێیان، هەستم بە ژیان دەکرد. کات لەوێ سوودی هەبوو؛ ئەوەی خوێندبووم، ئەگەر لەوێ نەشخوێندرابا، بەڵام دانیشتن لەو حوجرەیە تامێکی تایبەتی خۆی، هەر هەبوو. لەناو ئاواییەکانی کوردان، حوجرەی فەقێیان تاکە شوێن بوو هەستم پێی دەکرد کە ڕووناکی هزرییان لێهەبێت.

حوجرەی فەقێیان هەمیشە مشەی دەهات و دەنگە دەنگ و هیشکە دوەدەوانێی فەقێیان، نەدەبڕاوە. بەڵام منوەك سازێکی ئاینگۆ بەر گوێم دەکەوتو فرە لام خۆش بوو. بێجگە لە ڕێکی مۆزیقا ناڕێکییەکەی ناو حوجرە، هێشتا هەر ئەو شوێنە بوو تێیدا خوێندبوومو ئەو کولانکانەی (وەك فەقێیەکان ناویان دەنا) لە دیوارەکانی حوجرەکەیاندا هەبوون، شنە بایێکی فێنکیان بۆ ژوورەکە، لێیەوە دەرباز دەبوو. دەتگوت لە بەهەشتەوە هاتووە. کە گوێم لە مشتومڕی فەقێییکانیش دەبوو و ئەو نمە بایەشم پێدەکەوت، دەبووژامەوە و ماندووبوونی شوانیم لە بیر نەدەما. من ئاشنای ئەم سەودا و سەفا و هەراو هۆریایە بووم، ئاشنای بۆن میزی مەڕ و بەران و قاڕەی بەرخ و حەپەی سەگ و لوورەی گورگ و نووزەی ڕێوی و هوشەی بای دەشتو گەرمای هاوین و سەرمای زستان، نەبووم.

ئێواران چوونە نێو فەقێیەکان ئامانجم بوو؛ بەڵام هەرگیز خۆم لە قەرەبەقەرەی ئەوان نەدەداو نە بەشداری زانیارییەکانیانم دەکردو نە خۆم لە دەرسەکانیان دەگەیاند؛ چونکە نەمدەویست بزانن من خوێندەوارم و خوێندەوارییەکەشم فرە لە هی ئەوان باڵاترە، بەڵام هەر ناو فەقێییەکانم لەناو دیوەخان و لە مەجلسی ئاغە پێخۆشتر بوو؛ من فرچکم بەو جۆرە مەجلیسانەوە گرتبوو؛ مەرداڕی و جوتیاری و چاندن و دروێنە، لەگەڵ من – وەك ئاسمان و ڕێسمان وابووین؛ بەس ناچاری شتێکی جیاوازە! فەقێیەکان هەر خەریکی ئەو بابەتانە بوون کە من شەیدایان بووم. ئیتر هەر دەچوومە ناویان و ئەوانیش تەنیا بەخێر هاتنیان دەکردمو جار و باریش داوایان لێدەکردم تا تاخمێك چایەیان بۆ بخەمە دار و پیاڵەکانیان بۆ بشۆم و گسك لە ژوورەکەیان بدەمو منیش بەقسەیانم دەکردو وەك ئەوە وابوو برینم سارێژ بکەن و مەرهەم لە زامەکانم بدەن. ئەوان بەخێرهاتنەکەیان دەکردم، منیش لەبەرانبەردا، ئەوانم فرە خۆش گەرەك بوو.

ئێواران کە دەچوومە حوجرەی فەقێیان، لەبەر دەرگای ژوورەکەیان دادەنیشتم و گوێم لە قسەو بۆچوونیان دەگرت؛ حەزم لێبوو بزانم چ دەڵێن چۆن ڕاڤەی هەندێك دەستەواژەی ئایینی ئیسلام دەکەنو چاوا لێیان تێگەیشتوونە. تا جارێکیان وا ڕیکەوت، فەقێیەکان خەریکبوون بابەتێکی ئیسلامی گەلەك ناسکیان تاووتوێ دەکرد کە نەك هەر بە جڤاکی ئیسلامیی ناو گوندی دووشیوان پەیوەست بوو، بەڵکوو هەموو کۆمەڵگەی کوردەواری دەگرتەوە.

لەناو کوردان گەلەك ئایین و هزری جیاواز هەیە. ئەو فەقێیانەش، بەو زانستە کەمەی خۆیان هەیانبوو، پڕی عەقیدە و ئایینەکانی هەموو ئەو جڤاك و کەمینانەی ناو ئەو دێیانەیان دەدا کە لەناو دووشیوان و ئەو

گوندانەی نزیکی بوونو بە ئاشتیو بە برایانە دەگەڵ کوردە موسوڵمانەکان، دەژیان. قسەکانیان ئاگر بوو تەڕ و وشکی بە یێکەوە دەسووتاندن؛ بۆ کەس ژیانی تیدا نەدەهێلا.

سەرباری ئەوەی کە ئاستێکی زانستی ئایینی ئاوایان نەبوو کە ڕێیان پێبدا فەتوا دەربکەن، بەڵام یێك دووانێکیان سەیری سیبەرەکانی خۆیانیان دەکردو قەوارەی ڕاستی خۆیان و زانیارییەکانیان لە بیر چووبووەوە. ئەو جووتە فەقێیانە دەیانویست جڤاکی گوندەکانی کوردان دابەش بکەن و لە پیرە گوندی دووشیوانڕا، دەستیان پێکرد. باسی ئەوەیان کرد کە لە دووشیوانێدا (أهل الکتاب) دەژین و باوەڕیان بە ئایینی غەیری ئیسلام، هەیە. ئەوانەیان لە مەنتکەکانی دووشیوانێ هەڵاوێرد. دەیانویست خۆیان بکەنە (الفقیە)و فەتوایان لە بارەوە بدەن.

باسی ئەوەیان دەکرد کە ئاغە، لەویش هەورازتر، دەسەڵات و دەوڵەتداری، دەبێ چۆن هەڵسوکەوت دەگەڵ پەیڕەوکارانی ئەم ئایینانە بکەن. دەبێت چ دەگەڵ ئێزرا و پەیڕەوکارانی ئایینەکانی دیکەدا بکەن؟ ئەمانە هەموو نە لە ئاستی زانیاری ئەوان بوون؛ نە بابەتەکە کاری ئەوان بوو؛ نە ئەرکی ئایینییان بوو. بەڵام وا پێدەچوو بزاڤێکی سیاسی کلافداری ئیسلامی لە پشتی ئەم فەقێیانەدا بوو بێتو بە نەفامی ئەوان و بە نرخێکی کەم، وا بکەن ئەم کۆمەڵەی گوندەکانی دووشیوان و دەور و بەری بهەژێنن و نەهێڵن خەڵکەکەی تیدا بحەسێنەوە، تا دەستەمۆیان بکەن و بکەونە بەر ڕکێبی خۆیان و بڕیاریان لەلا نەمێنێت.

لەلایێکی تردا، ئەوە ڕوون بوو کە لەم کاتەدا بۆیێ ئەم بابەتە ئاوا کوتکوسنگی وەپێش خرا، چونکە ئاغە زۆر ڕیزی لەو تیمارچییە جوولەکەیە گرت. لەو کاتانەی کە ئیزرا دەهاتە دیوەخان و برینەکەی منی تیمار کرد،

ئـەو ڕێـز و ئاگادارییـەی بـرایم ئاغـە، لـە ئێـزرای گـرت و نیشـانی دا، ڕەنگـە خەڵکی ئەو گوندە، پێشتر، ئەوەیان بە چاوی خۆیـان نـەدیتبێت. ئاغـە لەبـەر من هەنـدە بایـەخی بـە ئێـزرا دا؛ بـۆیێ لـەم کاتـەدا، بـە ئـەرکی خـۆمم زانـی بەرگری لە هەڵوێستی ئیبراهیم ئاغەی مەنتك بکەم، بەڵام هەر لە هەمان ئان و ساتیشدا، پێویست بـوو ئاگام لـە هەڵوێستی خـۆم هـەبێت و چاوەڕێ بم تـا دەزانم دووا بڕیاریـان چـۆن دەگـەڵ هەڵوێسـتی ئـایینی ئیسـلامی یێـك دەگرێتەوە. نابێت ڕێ بدەم، چەند نەزانێك، شەرعی ئیسلامی بشێوێنن و بـە هەڵە و بۆ بەرژەوەندی هیچ کەس و هیچ بزووتنەوەیێکی پەنا پەردەو بەپێی خواست و بەرەوەندی خۆیان ئاوەژووی بکەن یان هەر بیگۆڕن. شەرع لای من پەنگر بوو، نەدەکرا کەس ئاوی پێدا بکات و هەوڵ بدات بیکوژێنێتەوە.

دەودەوانێیەکـە درێـژەی کێشـا؛ ژمـارەی ئەوانـەی ئاگرەکـەیان هەڵگیرساند، کـەم بـوو، بـەڵام زۆر لەسـەر قسـەکانیان پێـداگر و مکوڕ بـوون. لەگەڵ ئەمەشدا، خەریك بوون ڕێچکۆڵەی باریك و پێچ و پـەنای پێچەوانەی ئـایینی ئیسلامییان دەدۆزییـەوە تـا پێناسـەی جوولەکە و دیانیـانی پێبکەن. پاش چەند پێناسەیێکی شێواو و نامۆ، ئەمجارە چۆنیەتی هەڵسوکەوت کـردن لەگەڵیان، وەبەر نەشتەرە کولەکەی ئەو ئیسلامزەدانە کەوت.

لەبیرمـە جارێکیـان مامۆسـتاییێکم ئامۆژگـاری کـردم و پێـی گـوتم کـە هـەرگیز هاوپشـکی دەودەوانێـی کەسـانی بـێ ئامـانج نەکـەم، بـە تایبـەتیش ئەگەر دەودەوانێیەکە لە نێوان کەسانێکدا بێت وەك کەڕ و لاڵ وا بن؛ گوێ بە بەلگـە و بـالۆرەیی یـێکتری نـەدەن. یـان ئەگـەر مشتومڕەکە پەیوەنـدی بـە خـودی منـەوە نـەبێت، وا پەسـندە لێـی دوور بم. بـەڵام ئـەو بابەتـەی فەقێیەکان، بە نەشارەزایی، خەریکی بوون، وەك ئەوە بوو باڵندەیێکی نـامۆی

بێ پەڕو باڵیان ڕێك دەخست، بەو مرازەی بەناو جڤاکێکی نەخوێندەواری بێ سەواد، پەخش و بڵاوی بکەنەوەو ئاژاوە بنێنەوە.

بەرگری کردن لەئایینی ئیسلام و ڕێگری کردن لەم چەشنە چەواشە کارییە، ڕێك لەناو کرۆکی ئەرکی ئەخلاقی و جغزی قانوونی و مرۆیی من بوو. لەلایێکی دیکەوە، کاری لەکەسانێك دەکرد کە ڕاستەوخۆ هاریکاری منیان کردبوو و فرە یارمەتییان دابووم. ئەگەر برایم ئاغە و ئێزرای تەبیب نەبوونایە، من نەدەمامو نە ئەم پەنگرەی ئەوانم دەبینی. ناچار بووم خۆم لەو گێژەنە بدەمو وەك یێژن هێلکەیێکی سپیکراویان پێ بدەم. سەرباری ئەو هەموو ڕاڕاییەم، پێم نەکرا خۆم لە مشتومڕی فەقێیەکان دوور بگرم. زانیم هیچیان لە باخەڵێدا نییە و مێشکیان هێندەی نەخوێندووە، لە (ئارێ دەرێ بابە) دەر بچن. جگە لەمەش من لەو ماوەیەی لەناویان دادەنیشم و گوێم لێ دەگرتن، دڵنیا بووم کە نە سەریان لە یاسای میری و نە لە شەرعی ئیسلامی دەردەچوو نە دەشیانزانی ئەرکی موسوڵمان بەرانبەری خەڵکی خودان کتێبە پیرۆزەکان چییە.

هەندێك شتم لەلادا هەبوو لەگێن بوو زانیاری لەلای ئەوان زەنگینتر بکات. بەڵام ئاگاداری سەلامەتی و ژیانی خۆم، منی لەناو گێژەنێکی ڕاڕایی بەستەوە! لە نێوان دوو بەردە ئاشدا، گیر بووم. گوشاریان لێکردم خۆم دوور بگرم. لە دەودەوانێی نێوان ئەو فەقێیە کەڕانە، پەراوێز بوەستم. تووشی دڵەڕاوکێ بووم. بەڵام سەلامەتی خۆم زۆر لەوە گرینگتر بوو فەقێیەکان دەرس بدەم. خۆ لە کۆتاییدا، هەر دەبێ بناغەیێکیان هەبێتم تا لەسەر ئەو بناغەیە دیوارێك دروست بکەن و خۆیان هەڵنەدێرن. لەبەرژەوەندی خۆمدا نەبوو، دەسماڵەکەم هەڵدەم. ئەگەر خۆم ئاشکرا بکردبایە، مافم بە برایم

ئاغەی مەنتك دەدا تا لەناوچەی مەنتکایەتی دەرم بکاتو بانشم بکات؛ ئەی چی بکەم، باشـــە؟

ئەو برایم ئاغەیە جوامێرە و قـەدری بەرانبـەر و کـەسو کاری خـۆی دەگرێـت؛ یـا خـوا بیـانووی نـاڕەوای بەدەسـت دەکـەوت تـا بـۆ زرگـوێز ڕەوانم بکاتەوە و لەم ناوەدا لەناو دەچووم! ئاخر ئەمە لە نەمانی من گـرینگتر و پـڕ بایەخترە! ئازاردانی خەڵکی بێدەسەڵات بە هەڵە و لـە بـن پـەردەی ئایینـەوە، تاوانـە و نـابێ ڕوو بـدات و بکرێـت! لـەوەش دڵنیـا بـووم کـە فریـودانی ئـەو خەڵکە، بەم چەشنەی ئەم چـەند فەقێیانـە دەیانـەوێ بیکـەن، چـەخماخەیەك بوو، ڕەنگبـوو هـەموو دەوروبـەرم بسوتینێ. ویسـتم خـۆم بـەم شـێوەیە قایـل بکەم کە لەبەرژەوەندی خۆمدا نییە تێکەڵی ئـەو کێشە و بێشـەیەی نـاو ئـەم فەقێیانــە بــبم. مــن لــە نێــوان شــەپۆلی دەریــای هــزر و ئەندێشــەدا گــیرم خواردبوو، تا لە هیکەوە، فەقێیێك گـوتی – "خـودان کتێبـە ئاسمانییـەکان – أهل الكتاب – پێویستە ئیسلام بکرێن." فەقێیەکە چواچمکە هەڵقونجا بـوو و ڤیژاندی، ئینجا هەڵوەستەیێکی کرد، جا وتی – "ئەگەر ئەوانە ئیسلام نەبن، دەبی بە شیر چارەیان بکەین." فەقێ لە شەڕدا نەبوو، بۆیێ هێندە شیرەکەی تیـژ بـوو. منـیش کـە گـوێم لـەم قسـەیە بـوو، ئـیتر ئاگـام لـەخۆم نـەماو نەمتووانی چیتر خۆم ڕابگـرم؛ ئینجا بـە تووڕەیییـەوە و بـە زمـانی عـارەبی گوتم – "عذرا، یا سید!" هەموو فەقێیەکان کشومات بوون، حەپەسان کـە بـۆ جاری یێکەم گوێیان لە دەنگم ببێـتو بـەمجۆرە بـە ڕشـتی و بـە عارەبییـەکی پـاراو قسـە بکـەمو دوو وشـە دەربـبڕم! ئـاخر لـەم وڵاتـەدا، هەمیشـە شـوان نەخوێنـدەوارو مەیلـەو کۆڵـەوار بـوونو عارەبییـان نـەدەزانی و پێشـتریش زۆربەی قسەی فەقێیەکان بە عارەبی بوو.

ئەم بڕیارە ناڕەوایەی فەقێیەکە بوو، ناچاری کردم خۆم بسوتێنم؛ بەڵام نەهێڵم دینەکەم بسوتێنن، خۆیان لە دەقی ئایەتە ڕوونەکان لادەدا، سەرباری ئەوەی کە نەیاندەزانی، هێشتا هەر خەریك بوون فەتوا دەربکەن، کە مافیان نەبوو. ئیتر ناچار بووم، کە هەموو هەستییان لێ ڕاگرتم نەدەبوو ئیتر قسە نەکەم؛ جا گوتم –

"فەقێینە! ئێوە هیچ کامتان نەگەیشتوونەتە ڕادەی مەلایەتیو ئیجازەی مەلایەتیتان نییە، چۆن دەگرێ فەتوا بدەن؟ خۆ تەنانەت هەموو مەلاییێکیش، با لەناو کۆمەڵێکی نەخوێندەواریش بێت، دەسەڵاتی ئەوەی نییە، خۆی لە خودا بکاتو فەتوا بدات!" زۆر بە شێنەیی و بە ڕەوانی ئەم پرسیارەم لێیان کردو پاشان وتم – "ئایینی ئیسلام هەرگیز دەگەڵ ئەم بۆچوونەدا نییە." هەڵوەستەیێکم کردو پاشان قۆڵی خۆمم لێ هەڵماڵی – چونکە زانیم دەهۆڵ دڕا و تەقەی لێبڕا – جا با بۆچوونی خۆم ڕوونتر بکەمەوە بۆیێ ئاماژەم بۆ ئەو جاهیلە کرد کە فەتوایەکەی دا و لە پلەی زانستی ئیسلامی دامگرت و وتم – "سوختە! تۆ ڕەنگە هێشتا مانای فاتیحەی بە باشی نەزانی، سوختە! چۆن فەتوا دەردەکەیت؟" (سوختە پێکەم پایەی خوێندنی فەقێیاتی بوو.)

بەڵام فەقێیە دەنگ زلەکە لە نەزانی خۆی ڕشت بوو و دەیویست فەتوایێکی نافەتوای ناڕەوا، لە دژی ئەو هەموو نا موسوڵمانانەی دنیا دەربکاتو نەهێڵی کەس لەسەر هیچ ئایینێك بمێنێتەوە و پێویستە هەموو ئیسلام بکرێن و پێی گوتم:

"شوان! ئەتوو چ دەزانی هەتا قسە لەو بابەتە بکەی؟ ئەتوو فاتیحەت ڕەوان نییە و بە چاکی قیبلەی ناناسی، کوو لە دینی قسان دەکەن؟" پاشان خۆی لەخۆی پرسی کە دەبێت ئاوا بە تەنگەتاوی موعجیزە ڕوویدابێتو من

فێری عارەبیو شەریعەتی ئیسلامی بووبم تا ئاوها قسان بکەم. ئەو بێدەنگ بوو!

لەلایێکی دیکەدا فەقێیێکی تر لەوانەی پشتیوانی بە کافرناساندنی غەیری ئیسلامەکان بوو، بابەتەکەی هەڵقۆستەوە و وتی:

"ئەرێ ئەتوو، شوانیژگە!" خەریکبوو سەرنجم بۆ خۆی ڕابکێشێت، بەڵام من بایەخم بە قسەکانی ئەو نەدا و وەك ئەوە بوو نە خۆی هیچ بووبێت نە قسەکانیشی جێی بایەخی من بن. ئینجا کەسی سێیەم لەناو فەقێیەکانەوە پەنجەی لێ بڵند کردمو داوای کرد قسە نەکەم و نەڕاندی و وتی:

"شوان!" بەڵام من گوێم بەو نەزانەش نەدا و هەڵوەستەم لە هەڵوێستی خۆم نەکردو وەڵامیانم داوە و وتم:

"فەقێینە! با منیش قسەی خۆم بکەم." ئەمەم گوتو ڕاوەستام گەرەکم بوو بزانم چی دیکەیان لێ دەبیستم و چیان لە باریدا مابوو، بەڵام دەرکەوت کە هەیانبوو کاتێك یەکێکی دیکەیان بە زەدەخەنەی گاڵتەجاڕییەوە وتی:

"هەر ئەتوو مابووی؟" بەڵام من نەمهێشت پتر پێدا بچێت و پەنجم لەبەرانبەری هەڵبڕی، وەك ئاماژەیێك پێی بڵێم، بەسە؛ گوێ ڕاگرە. جا وتی – "با بزانین، شوان چ دەرێ؟"

"فەقێینە، ئاگادرای دینەکەتان بن، لە خۆتان مەشێوێنن!" یێکەم جار هۆشیارم کردنەوە و وتم – "ئەرێ فەقێینە، قورئان سەرچاوەی سەرەکیی و دووا قسەی موسوڵمان نییە؟" لێیانم پرسی.

"بەڵێ، گومان لەوەدا نییە." وەڵامم دراوە.

"قورئـــانی پـــیرۆز دووا سەرچـــاوەی بـــاوەڕی هـــەموو موســـوڵمان و ئیمانداریکە و دەبـی هەموو ملکەچی دەقی ئایەتەکان ببین." بۆیـان ڕوونم کردەوە. ئینجا ئایەتی ٤٢ سورەتی (البقـرە)م وەبیر هێنانـەوە کە دەفـەرمێ - (وَلَا تَلْبِسُوا الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُوا الْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ – ڕاسـتی بـە نـاڕەوا پەردەپۆش مەکەن و ڕاستی مەشارنەوە کە خۆتان دەیزانن) کە ئـەم ئایەتـەم خوێنـدەوە، سـڕم کـردن هـەموو دەملـەقوچ مـابوون، و چاوەڕێ بـوون بـزانن چیتر دەڵێم.

جا ئایـەتی ٦٢ ی سورەتی (البقـرە)م بـۆ خوێندنـەوە، کـە دەفـەرموێ: (إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ هَادُوا وَالنَّصَارَىٰ وَالصَّابِئِينَ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَعَمِلَ صَالِحًا فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ. – ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و ئەوانەی کە ڕاستەڕێ بوون‌و نەسرانی و سـابیئەکانیش لەوانـەی کـە باوەڕیـان بـە خـودا و بـە ڕۆژی دووایـی هێنـاوەو کـاری باشـیان کردووە، ئەوانە لە کن خودا پاداشتی خۆیانیان هەیەو ترسیان لەسـەر نییـە و نیگەرانیش نابن).

هـــەموو فەقێیـــەکان لەسەرســـامیدا، بـــەنگ بـــوون. پاشـــان وتم: "فەقێینە! ئەمە هەڵوێستی قورئانـە بەرانبـەر هـاوبیرانی ئـەم ئایینانـەی کـە ئێوە وا خەریکن بە کافر لە قەڵەمیان دەدەن." دیسان هەڵوەستـەیێکی دیکـەم کرد، فەقێیـەکان وەك ئـەوەیان لێهاتبوو دەتگوت (کأن علي رؤوسهم الطير – باڵندە لەسەر سەریاندایە)، تاسابوون، ئاخر ئەم شوانە نەخوێدەوارە لـە کوێ فێری ئەو ئایەت و تەفسیرانە بوو؟ بەڵام من لێیان نەگەڕام پتر بیر بکەنـەوەو وەڵامم بدەنـەوە کـە گوتم – سـەبارەت بـە نـەوەی ئیسرائیلیش، ئایـەتی ١٦ی سورەتی (الجاثية) دەفەرمی - (وَلَقَدْ آتَيْنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ –

ئێمــە کتێــبو فەرمانــداری و پێغەمبەرایــەتیمان بــە نــەوەی ئیســرائیل بەخشیوە).

جا ئایەتی ٤٦ی سورەتی (العنکبوت)یشم وەبیر هێنانەوە، دەفەرمێ: ﴿وَلَا تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِلَّا الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ وَقُولُوا آمَنَّا بِالَّذِي أُنْزِلَ إِلَيْنَا وَأُنْزِلَ إِلَيْكُمْ وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمْ وَاحِدٌ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ –﴾ دەودەوانێ لەگەڵ ئەوانەدا مەکەن کە کتێبدارن مەگەر بە چاکە بێت، تەنیا ئەوانە نەبن ستەمیان کردو پێیان بێژن ئێمە باوەڕمان بەوە هێناوە کە بۆمان دابەزیوە و بۆ ئێوەش دابەزیوە و خودای ئێمە و خودای ئێوە هەر یێکە و ئێمە خۆمان بە ئەو ڕادەسپێرین).

'سەرباری ئەمەش،' ویستم لەو خەیاڵانەیان بە ئاگایان بێنمەوە و وەبیرم هێنانەوە کە – "زانایانی موسوڵمان جەختیان لەسەر ئەوە کردووەتەوە کە ئەرکی حکومەتی ئیسلامە سەلامەتی خودان کتێبەکان بپارێزێت و پشتگوێ خستنیان گوناحێکی گەورەیە."

ئینجا تۆزێك بیرم کردەوە و ڕووم لە فەقێیەکان کردو گوتم: "فەقێیان ئێوە هیچتان هەندەتان لە بارێدا نییە بتوانن فەتوا بدەنو کەسێك کافر بکەن کە خودای گەورە بە توانستی خۆی نە کافری کردوونە نە بە خراپی لە قەڵەمی داون." ئەمەندەم گوتو بەپاڕانەوە لە خودای، بابەتەکەم بڕییەوە، و گوتم – "ئیتر هیوادارم خودا ڕێی ڕاست بە هەمووومان نیشان بدا و ئەگەر ئێوەش ئاگاداری خوێندنەکەتان بن بۆ ئێوە باشترە چونکە هێشتاکە هی ئەوەی نینە فەتوا دەربکەن. شەوتان شادو خودا لەهەموو خراپەیێك بتانپارێزێت." چیتر لەسەریان ڕانەوەستام تا بیر بکەنەوە و قسەی پێچەوانەی قورئانم بۆ بکەن، ئەمە قورئانە و (وَمَا هُوَ بِقَوْلِ

شَاعِرٍ (الحاقّة ٤١) – قسەی هەڵبەستڤانێك نییە). دەكرێت هەوڵ بدەی تا تێیدەگەی بەڵام ناكرێت بەپێچەوانەی ئەوەوە فەتوا بدەی.

هەستامەوە، ویستم بڕۆم. ئەوەندە ئاگام لێیان بوو کەهەر یێکەو تەماشای ئەوانی دیکەی کردو هەموو کپ بوون‌و مات دامان! دەتگوت تووشی نسکۆ هاتن. ئینجا لە حەپەسانی ئەوان هاتمەوە سەرەخۆ و تێگەیشتم کە من خۆمم لە داوێ خست و دەشێت کارەکەی خۆم لە دەست بدەم، کە حەفتەی پێشووتر وەرمگرتبوو! بەڵام ئەوەم پێخۆش بوو کە هیچ یێکێکیان یێك قسەی دیکەی لە بابەتەکەدا نەکردو قسەکان براونەوەو هەر کە هەستامەوە، هەموو فەقێیەکان لەدوای من هەستانەوەو بە دووامدا بۆ دەرەوەی حوجرەکە هاتن. ئەمجارەیان، وەك جارانی پێشووتر نەبوون. یەکێکیان بە ڕاکردن چوو دەرگای بۆ کردمەوەو یەکێکی دیکەشیان چوو کەوشەکەی بۆ دانام.

"فەرموو مامۆستا." هەستم پێکردوەك مامۆستای خۆیان ڕێزیان لێگرتم. ئەو شوانەوێڵە نەبووم کە دوێنێ لەناویان دانیشتبووم؛ ئەمڕۆ ئەو کەسە نەبووم کە هەر شەو دەهاتمە لایان لە حوجرە و نەیاندەویست لێ بگەڕێن قسەیێك بکەم! ئەو شوانە نەبووم کە کەرستەی چایەم بۆیان دەشووشت، بابەتەکە گۆڕا! بۆ ئەوەی ڕیزی خۆیان بۆ خۆم و بۆ بووچونەکەم نیشان بدەن، هەر ئەو هەندە نەبوو کە لەپاش من لە حوجرەکە دەرکەوتن، بەڵکوو یەکێك لە فەقێیەکان دەست پێشخەری کردو کڵاشەکەی بۆ دانام.

منیش سوپاسیم کردو تکام لێیکرد بۆ منوا نەکات. لە ژوورەکە دەرکەوتم. هەموو فەقێیەکان لەپاش مندا هاتن. خودا حافیزییان لێ کردم. هیوای شەوێکی ئاسوودەیان بۆ خواستم و هەموویان بە یێکەوە گوتیان – "خودات لەگەڵ، مامۆستا!"

## هەرگیز متمانە بە فەقێیان مەکە

ڕۆژی پاشتر، وەك هەموو ڕۆژێك، ڕانە مەڕەکەی برایم ئاغەم بۆ لەوەڕەگەکانی دەوروبەری گوندی دووشیوانێ ڕادا. لە دۆڵێکی نزیکی گوندیوەرچەرخامەوە و سەنگی خۆمم وەبەر گۆپاڵەکەم دابوو و سەیری جوانی ئەو دەڤەرم دەکردو چاوەڕێ بووم مێگەلەکە بە لەوەڕ بکەون و منیش سەرێك بەکتێبە شاردراوەکانم دابخشێنمەوە. مەڕەکان لەمن پتر ناوچەکەیان پێخۆش بوو؛ من لەبەر جوانی و خێرو بێرو گیاو گوڵ و هەورازو نشێوی بوو کە دۆڵەکەم بە دڵ بوو، بەڵام دیار بوو ئاژەڵەکان سەریان لە زۆری سەوزی ئەو هەردو کەندو لەندە سڕمابوو، نەیاندەزانی دەم بۆ کامە گیا پێش ئەوی دیکەیان ببەن و بیخۆن و ورگیان پێی پڕ بکەن و پاشان لەکاتی مۆربوونیاندا، لە هەوێزێ، بیانهێننەوە و کاوێژی خۆیانیان بکەن و برسێتی خۆیان بشکێنن و هەرسی بکەن و خۆیان پێی قەڵەو بکەن و شیر بۆ خاوەنەکەیان فەراهەم بکەن، تا کابان فرۆ و ماست و پەنیر و لۆر و ژاژی و دۆی لێ دروست بکات! ئەم ناوە فرە پڕ بێرە؛ خودا هەر ئاوەدانی بکات.

دەستم بۆ کتێبەکانم برد، تا یەکێکیان دەربێنم و دەست بە دەوری خۆم بکەمو نەهێلم ئەو زانستانەی زمانی عارەبیو شەرعو نەحو و سەرف و بیرکاری و زانستی گەردووناسی و ئەو ئەدەبەی کە بۆ ماوەی چەندین ساڵ

خوێندوومـە و دەورم کردوونەتـەوە، لـە بیریـان بکـەم‌و قوربـانی شـووانییان بکەم. من هێشتاکە هیچ کتێبێکم دەرنـەهێنابوو کاتێـك کە گوێم لێبـوو مـام پیرۆت لە دوورەوە بانگی لێدەکردم.

"حەمـە! کوره قومپـانی بـڕای!" پـیرۆت هـاواری دەکـردو لـێم نزیـك دەبووەوە و نـەیدەبڕیەوە!

"بەڵێ! مام پیرۆت، چ دەڵێی؟" بە هاوار کردن وەڵامیم دایەوە.

کـە گـوێی لـە وەڵامەکـەی مـن بـوو، ئـیتر زمـانی لـە دەمیـدا نـەما! ڕاشنەوەستا تا لێی نزیك ببمەوە و بـۆ لای ئـەو بچـم. هـەر خـۆی بـۆ لای مـن هات و لێی دیار بوو ساڵان سەنگێکی زۆریان خستبووە سـەر شـانی و هـەردوو قاچەکانیان بەرەو لای دەرەوە لێ چەماندبووەو شـەڵوارەکەی لـە ئاست خـۆی بەرینتر نیشان دەداو بـە سووك و ئاسانی دەتزانـی ئـەم کابرایـە لـە جاحێڵی لاقـەکانی ئـاوا وەك دوو کەوانـە بـۆ دەرەوە نـە چـەمابوونەوە، بـەڵام زەمـان شەرمی لە ساڵانی تەمەنی ئەم پیاوە کۆڵنەدەرە نەکردووەو دەستی خۆی لێـی وەشاندووە و خەریکە ڕێگەی لێ دادەخـات و ڕەنگـە هـەر ئەمساڵە خـودا بـۆ خۆی بیباتەوە!

"برایم ئاغەی مەنتك ئەمنی لۆ کنە توو نارد!" پیرۆت هێنکە هێنکی بوو و قسەی دەکرد؛ "ئاغە پێی گۆتم هەڕوو ئاگات لە مەڕەکان بـیو حەمـەم لۆ بنێرەوە!" پیرۆت پێی گوتم و تێی گەیاندم کە دەبێت بۆ دێیەکە بچمەوەو سەر لە برایم ئاغەی بدەم. "هەڕۆوە و خوا ئاگادارت بـی!" ئـیتر مـام پـیرۆت زمانی لـە دەمیـدا نـەما. دیـار بـوو ئاراسـتە کرابـوو بـەڕێزەوە قسـەم لەگەڵدا بکات.

"سوپاس! خودا پاداشتت بداتەوە! نازانی ئاغە بۆ چی، بـەم چێشـتانە، بانگم لێ دەکات تا بچمەوە؟" پرسیارم لێی کرد.

"برا گەورە ئەتووی دەوێ، لۆ چییە؟ ئەوە هەر خوا دەزانی!" ئەمەی گوتو هەڵوەستەیێکی کردو بە جوولەی دەستو پەنجەکانییەوە تێی گەیاندم کە دەبێ هەڵوەستەی لێ نەکەم و یێکسەر بەرەو دووشیوان شۆڕ بمەوە.

"خودا یار بێت، مام پیرۆت، هیچ نابێت، إن شاو الله!" من گوتم پاش هەڵوەستەیێك ئینجا ئومێدم خواست و لە مام پیرۆتم گەیاند کە زوو دەگەڕێمەوە و پێیم گوت – "هەر لەلای برایم ئاغەی دەرچم یێکسەر دێمەوە."

"ڕەنگە نەگەڕێیەوە!" پیرۆت وەڵامی دامەوە و بێ هەڵوەستە منی جێهێشتو بەرەو ڕانەکە چوو و دەنگی لێ هەستا و هاواری کرد – "هەڕە، دەی!"

لە ناخڕا هەستم بەوە کرد کە ئەم لە ناکاو بانگ کردنەوەیەم، ڕەنگە پەیوەندی بە دەودەوانێی دوێنێ شەوەوە بێت. ئاخر من بەم زمانە نارحەتەمەوە بۆچی چوومە ناو ئەو تەنگژەیەی یێك دوو فەقێ دروستیان کرد؟ خۆ دەکرا وەك شەوانی پێشووتر، خۆم هەر بە کەڕو لاڵی بهێلمەوە و وا بنوێنم کە لەلای مندا، نە با دێ و نە دەشبارێ.

بەڵام عارەب یێژن – "ئەوەی خۆی لە ئاستی ڕاستیدا بێدەنگ بکات، ئەهریمەنێکی لاڵە!" من باشم کرد، خۆ نەمهێشت چەند نەخوێندەوارێکی نەزان، بەشێکی جڤاکی کوردەواری کافر و بێ ئایین بکەن و بڕیاری جەهالەتیان بەسەردا بسەپێنن و بیاندەنە دەستی کەسانی هار و بێ عەقڵ بۆ ئەوەی ئەوانیش بە دڵی خۆیان و بەپێچەوانەی حوکمەکانی ئایینە پیرۆزەکان، بڕیاری سەربڕینی ئەم و ئەو بدەنو جڤاکی کوردەواری لە قاوخی ڕاستی خۆی دەربێنن و فیتنە بڵاو بکەنەوە. لەناو مێشکمدا خەریك بووم ئەو خەیاڵانەم تاو و توێ دەکرد کارێك هەندەم زانی وا لە پێش دەرگەی

دیوەخانەکەی دووشیوانێ ڕاوەستاوم و برایم ئاغەش لە ژوورێ، لەبەرانبەری دەرگەی دیوەخانێ پاڵی داوەتەوە. بڕیارم دابوو کە هەموو ئەنجامەکانی ئەو هەڵوێستەی دوێنێ شەوم قەبووڵ بکەم.

ئاغە کە چاوی بە من کەوت، بێ هەڵوەستە و خێرا هەستاوە! منیش چوومە ژووری دیوەخانەکە و سەلامم کردو وتم – "السلام علیکم!" پێشوازییەکەی برایم ئاغە وەك جارانی پێشتری نەبوو! ئەمجارەیان، ئەو جوامێرە لە جێی خۆی هەستاوە و زۆر بەگەرمی بەخێر هاتنی لێ کردم. ئەو هەڵوێستەی ئاغە بەپێچەوانەی ڕێکارە جڤاکییەکانی ناو کوردەواری بوو؛ ئاغە لە پێش شوانێك هەستێتەوە، 'کوجا مەرحەبا؟' - ئەوەی پێشتر من بە چاوی خۆم دیتبووم، ئەوەیە مەگەر کابرا پیر بوو بێت، ئەگینا مەحاڵ بوو ئاغە لەبەر کرمانجێکی خۆی هەستێتە پێوە، چ جا ئەگەر ئەو کەس شوانەوێڵەیێکی بابردەڵەی ئاوارە و دوورە خزمو کەسی خۆی بیت! ئەم برایم ئاغەیە کەسێکی ئاسایی نەبوو! ڕەفتارەکەی واقی وڕ هێنام! من نە پیرم، نە مەلامە، نە شێخم، نە میوانم و نە ئاغەیێکی هاوسەنگی ئەم جوامێرەم، ئەی بۆچی لە پێشم ڕادەبێت؟!

ئاشکرابوو کە هۆزان و چاوەش و هەقایەت خوێنەکان ڕێزی تایبەتییان لەلای ئاغەکاندا هەبوو؛ من لەهیچی ئەوانەدا نەبووم! ئەوانەی هەقایەتیان لە دیوەخانەکاندا دەگێڕاوە، هەمیشە خەریکی سەربردەی شیرین و خوسرەو و مەم و زین و کەچەڵ حەسەن بوون تا سعاتی ١٠ی شەو، ئەو کاتەی کە کەڵەشێری زیزان بانگی خۆیان دەدا، پتر درێژەیان نەدەکێشا و دەچوون دەنووستن.

کەس نەبوو سعاتی گیرفانی هەبێت، مەگەر ئاغە یان خودی مەلا بێت! کوردەواری بۆ دیارخستنی کاتی نوێژ و هاتنەوەی ئاژەڵەکان و

بێرکردن، دارێکیان لە زەوی دەچەقاند و بەگوێرەی جوولەی سیبەری ئەو چیلکە دارە کاتەکانیان دەزانی؛ هەبوون لەو کارە فرە شارەزا بوون خەڵك دەچوونە لایان و لە کاتی نوێژ و کاتەکانی دیکە پرسیاریان لێیان دەکردو ئەوانیش بە شانازییەوە دارجغارەکانی خۆیانیان دەردەهێناو لەبەرانبەری هەتاو لە شوێنێکیان ڕادەگرت کە سێبەرەکەی دیار بێتو بۆ ئەو کەسانەیان ڕوون دەکردەوە کە کاتەکە چەندە و چۆنە، با هەمیشە ڕاستیش نەبان.

برایم ئاغە وەڵامی سەلامەکەی دامەوە ئینجا داوای لێکردم تا دانیشم. منیش ویستم، وەك هەموو شوانێك، لە، سەر کۆسپەی بەر دەرگای دیوەخانەکە دابنیشم؛ بەڵام ئاغە بە دەنگێکی نەرم لێی خواستم دا هەڵکشێم و بچم لەلای هەورازی ناو دیوەخانێ دابنیشم! ئەمەش، بۆ هەمووان و بە تایبەتیش بۆ خۆم، فرە واتای زۆری دەبەخشی! ئاخر کەی و لە کوێ بووە ئاغە داوا لە شوانێکی ئاوارەی بێ پشت و پەنا بکات تا هەڵکشێ، خۆ ئێستاکەش برینداز نیمە و چیتریش میوان نیمە! سبحان مغیر الّحوال! ئەمە تەنیا کاری خودایە! ڕیزلێنان بەم چەشنە بۆ من زۆر بوو، هەستم کرد زۆر قەرداری ئاغەی دەبمەوە! ناچار هەڵکشام. بۆ لای برایم ئاغەی چووم. گەیشتمە تەنیشتییەوە و هیچ کەس‌و هیچ شتێك لە نیوانماندا نەما کە ئاماژەی بۆ شوێنێکی چۆڵی تەنیشتە خۆی کردو پێی وتم:

"فەرموو! دانیش، مەلا، ئێرە جێی تووە."

وای! لەم شەرەفە مەزنەی ئەم پیاوە گەورەیە بە منی دا! ناچار بەقسەی ئەوم کردو چووم لەو جێیە دانیشتم کە ئاماژەی بۆ کرد. تازە گەیشتبوومە عاردی، کە زەینم دا، ئاغە لە ناخڕا پەلەی بوو بە بنج و بنەوانی ئەو قسانە بگات کە بۆی هاتبوون. بۆیێ لە پێستی خۆی دەرچوو و بە توند و توورەییەوە تێی گەیاندم و فەرمووی – "حەمە! ئەوڕۆکە ئەو

ڕۆژەیە درۆ و ڕاستی لێکدی جودا دەکرێنـەوە!" ئاغـە لـە قسـەکانیدا، گەلـەك توند بـوو. "هەنـدەك قسـەو باسـم لۆ هاتییـە هـەمووی سـەبارەت بـۆ خۆتـە، ئـەتوو، حەمـەی قومپـانی بـڕای!" خـەریکبوو ئاغـە ئـارامی لـێ هەڵـدەگیرا، سەبری نەماو وتی – "ئەو خەبەرەی لۆم هات، گومانی لە کنـە مـن نەهێشت و ئـەمن مەزەنـدەی چـم لـە تـوو دەکـرد، ئـەتووش هـەر ئـەوها دەرچـووی!" هەڵوەسـتەیێکی کـردو هەناسـەیێکی قـووڵی هەڵکێشاو و تەماشای نـاو چاوی کردم – "حەمە! ئەوەی لۆیان گێڕامـەوە، وەك ئـەوە بـوو ئـەمن گومـانم لێـی هەبوو." برایم ئاغە فرە ڕاست بوو، بێ پێچ و پەنا بـوو؛ کوتکوسـنگی قسـەی بۆ دەکردم.

"ئاغـە! چ درۆیێـك چ ڕاسـتییێك لـە یـەکتری جـودا دەکەیـەوە؟!" لـە برایم ئاغەم پرسیار کرد.

"وەختی ئەوەیە بە بڕیارەکانی خۆماندا بچینەوە." ئاغە ئەم قسانەی وەك سیاسـەتوانێکی دانوسـتانکار دەکـردو بـە پەرۆشـەوە بـوو خاڵـە سیاسـییە گرینگـەکانی ڕێککەوتنەکـەمان هەڵوەشـێنێتەوە، بـۆیێ هەناسـەیێکی قـووڵی هەڵکێشا، گومانم کرد ڕەنگە ئەو هەموو بایەی هەڵیمژی بردییـە نـاو سینگی دەلوێت گە سییەکانی بتەقێنێت! پاش هەناسەکە، هەڵوەستەی کرد تـا هـزری خۆی ساف بکاتەوە. پاشان پرسی – "ئـەتوو شـوان نـی، وەیـە؟" پرسـیارەکەی لـێ کـردم، بـەڵام ڕانەوەسـتا تـا وەڵـامی پرسـیارەکەی، دەدەمـەوە و گـوتی – "ئـەتوو لەگـەر مـن راسـتو ئـەمین نـەبووی!" ئەمـەی ووت و دەنگی گۆڕا – "ئـەمن ئـەتووم لـەو گونـدەی خۆمـان وەرگـرت بـێ ئـەوەی لێت بپێچمەوە و بزانم کێی و لە کێ هـاتی، هـەر چت گۆت هـەمووم بـە ڕاسـت لـێ وەرگرتـی؛ برینەکەی پێتم تیمار کـرد؛ باشـترین نـوینم لۆ دانـای؛ ئیشـم لۆ دیتییـەوە؛

ژیانەکی باشم لۆ دانای. وەیە یان نا؟" ئاغە بێدەنگ بوو و هەناسەی ڕاوەستا؛ هەناسەی نەدا! خەریك بوو دەگریا.

زانیم ئەو پیاوە چ خەمێکی گەورە بەر دڵی گرتووە، زانیم من چ هەرەسێکم بەم جوامێرە هێناوە. مات دامام! پاشان ویستم خەمەکەی سووك بکەمو داخەکەی لەسەر دڵیدا نەهێلم، ئینجا وتم – "ئەوانەی تۆ باست کردن، هەموویان ڕاستن!" هەڵوەستەیێکم کرد تێمگەیاند کە منیش بەر فەرمانی هۆیێك بوومو لە ئایندەی خۆم دەترسام و نەمدەویست بە جارێك خرارەکەم هەڵڕێژم و هەرچی هەیەو نییە هەمووی بەو گۆڕەدا وەربکەم –

- "بەڵام، ئاغە، من هەرگیز ڕەچاوی ئەوەم لە جەنابت نەدەکرد کە ڕۆژێك دێت و ئەو چاکە و پیاوەتییەی لەگەڵ منتدا کردن، هەموویان، لە دووای یێکتریدا جەلەیان بکەیتو بە چاوم دابدەیتەوە! ئەمە لە ڕێزی ئێوە ناوەشێتەوە، ئەوەی تۆ بۆ منت کرد، ئەرکێکی فەرمانداری جەنابتان بوو و منیش هەمیشە ئاوا هەستم کردووە کە کەوتوومەتە بەر سیبەری باوکم!"

لەلایەنی نەریتییەوە، تەماشای ئەو قسانەی ئاغە بکەین، دیارە کە لە نەریتو پیاوەتی کوردەواریدا جێیان بۆ نەکراوەتەوە و نییە! ئەو قسە بە چاو دادانەوەیە، ناچنە ناو جاغی کوردەواری؛ بۆیێ ئاغە بێدەنگ ما؛ ماوەیێك بیری کردەوە، پاشان وتی:

"کورە، مەلا، هەندە لێت تووڕە بووم، ماری بابت ئاوەدان بی، هیچم لە بیر نەمابوو؛ ڕاست دەکەی! نەدەبوو ئەمن ئەو قسانە هەر بکەم؛ بە چاو دادانەوە زۆر ناپەسندە." ئینجا بۆ هەمووانی ڕوون کردەوە کە ئەوەی ئەو پیاوە بۆ منی کردووە هەمووی ئەرکی پلە و پایەکەی بووەو دەبوو بیانکات. ئەرکی خۆی بوونو بێ منەت بۆ منی کردووەو دەشبێت بۆ هەر کەسێك

بیانکات کە ڕوویان لەم گوندە دەکەن‌و هاوار بۆ ئاغەکەی دێنن؛ ئینجا دیسان ڕووی لە مەجلیسەکە کردو وتی:

"خزمینە! بەڕاستی لەو قسانەم پەشیمانم دەبوو نەیانکەم؛ ئەنگۆش لەبەر درتان گرێ نەبی، توخوا!" ئینجا گۆپالەکەی گرتە دەست‌و لە عاردی کوتا؛ کە سەری هەڵبڕێ، باش لێی دیار بوو کە زۆر پەشیمانە؛ هەر ئەوەتا نەدەگریـا.

"حەمە! وەت لێکردم ئارەقەی ڕەش و شین بکەم؛ هەی مار ئاوەدان، گەرووم هیشك بووە." ئاغە ئەم چەند قسەیەی کرد؛ پاشان تەماشایەکی کردم‌و وتی – "پاژنە برای! کە زانیم ئەتوو ڕاستی سەربردەکەی خۆت لێم شاردیتەوە، هەستم کرد گەرووم دەگیرا؛ قسەم لۆ نەدەهات؛ هەنووکەش چاوەڕێی ئەوەت لێ دەکەم لێرەوە غەیری قسەی ڕاست، هیچی دیکەم لۆ نەگێڕیەوە. مەلا، چاوەڕێی ڕاستیت لێ دەکەم؛ برێ، بزانم چت لە کنیدا هەیە." ئەمەی ووت و چاوی لەناو چاووم نا و ووشت بوو، چاوەڕێ بوو گوێی لە دەنگم بێت.

قسەکانی بە دوو بڕدا پەرت دەبوون، لەلایێك فەرمانی لەسەر دەکردم‌و لەلایەکەی دیکەی لێم دەپاڕاوە! پاڕانەوە و فەرمانەکەی هەردووکیان، لەسەر یێك ئامانج گرد ببوونەوە؛ یارمەتی بدەم‌و ئەو مەیلەی بۆ هەڵبێنم و نەهێلم جێی لەناو ئەندامانی عەشیرەتەکەیدا لەق ببێت یان بە بێ توانا لە پێشیان دەربکەوێ. لێی خواستم لەگەڵیاندا ساغ بم، ڕاست بم و بە بێ پێچ و پەنا هەرچی هەیە بۆی باس بکەم‌و 'ئەوەی بن بەڕێ بێنمە سەر بەڕێ'.

"بەڵێ، ئاغە! دەتەوێ چ دەربارەی کەسایەتی من بزانی؟" پرسیم.

"حەمە! هەرچەندە ئاسان نییە لەمە بە دوواوە باوەڕت پێبکەم، بەرام بەراستی دەمەوێ، سەبارەت بە خۆت، هەر چت هەیەو نییە، هەموویم بە راستو ڕەوانی بۆ بگێڕیەوە." پاش ئەو قسانە و دەربڕینی دڵەڕاوکێی خۆی، هەڵوەستەیێکی کردو سەری خۆی هێنا پێشو ئەم چەند پرسیارەی بە توندی لێ کردمو گوتی:

"بە هەموو ئەو خزمانە برێ؛ ئەتوو کێی؟ لە کێ هاتی؟ لەبەر چی خزمو وراتی خۆت بە جێهێشتییە؟ کوو لە خێلی خۆت جودا بوویەوە؟ کوو دەستبەرداری خزمەکانت بووی؟ سەرتاپای سەربردەی خۆتم لۆ بگێڕەوە و برێ بزانم لۆ ئەو پێیەت ئەوها براپتەوە؟ کێ بڕیەوە؟ کێ زیندانی کردبووی؟ چ کەتنەکت کردبوو؟ کێ لە دووت دەگەڕێ؟" لەسەر زاری ئەو پیاوە، پرسیارەکان شەڕیان دەکردو بە تەنگەتاوی یێک لە دووای یێک بێ ڕاوەستان دەگوترانەوە، تا لە هیکەوە و بە کتوپڕی ڕاوەستاو ئیتر هیچ پرسیاری بۆ نەهات؛ دەیویست هەر گوێی لە مێژووی ژیانی من بێت، یانیش پێویستی بە کات هەبوو، بیر لەپرسیاری تر بکاتەوە؛ تا، وەك هەڵوەستەکەی، لە ناکاو هاتەوە قسەو فەرمووی – "ئەوی بە خۆت دەزانی و لێی یەقینی، سەبارەت بە حەمەی پاژنە بڕای، هەموویم بۆ باسکە و هیچ لە بن پەردەی نێلیەوە،" پاشان بۆی ڕوون کردمەوە کە خۆی هەر لەسەرەتاوە و لەو ڕۆژەی کە بۆ یێکەمجار منی بینی و پاشان گوێی لە شێوەی قسەکردنم بوو، ئەو پیاوە گومانی لە ڕاستی قسەکانم و لە هەقیقەتی خۆمدا هەبووە، زانیتی کە من بەراستی شوان نیمە و "قەتیش شوانیت نە کردووە!" ئەمەی ووت، ئیتر ئاماژەی پێدام تا قسە بکەم؛ بەڵام بەر لەوەی کە دەمم بکەمەوە، پێشی لێ گرتمەوە و وتی:

"پرسیارم لەخۆم کرد، کوو دەکرێ شوانەکی نە پسپۆر و نە شارەزای وەکی توو، بەو مەنتیقە جوانە قسان بکا! کوو دەگونجێ، شوانەکی وەکی توو ئەو ئەسپە ڕەسەنەی لە بن بی؟ کوو دەبی کەسەکی وەکی خۆت لە ئیش بگەڕێی؟ هیچ ئیشەکیش نا، شوانی! سوار و لە ئیش گەڕان! کوجا مەرحەبا!"
دیسان هەڵوەستەیێکی دیکەی کرد. دیار بوو برایم ئاغە ماندوو بوو؛ گوشارێکی زۆری لەسەر بوو؛ بەخۆی گوشارەکەی لەخۆی بارکردبوو، ئەگینا لەو ئاواییە کەس نەبوو زاتی ئەوە بکاتو بوێرێت بە برایم ئاغە بڵێ – 'لە پشت چاووت دوو برۆ هەیە!'

"پاش ئەو هەموو بگرەو بینە و بەردە، هەنووکە لۆم ڕۆن بوویتەوە کە ئەتوو نە شوانیو نە قەتیش شوانیت کردییە! ڕەنگە ئەتوو کوڕە میر بی! میری هۆزەکی جافان بی! ئەوە ئەگەر ئەتوو لەهەر بنەمارەك بی، دەبی لە گەورەکانی ئەو بنە مارەبی، نابی ئەتوو شوان بی! لەهەمووان دیارتر ئەوە کە ڕەنگە ئەتوو مەلا بیو مەلایەکی باشیش بی! زانینەکی گەلەك باشت لە دینی ئیسلام و عیلمی قورئانو فەرموودەکاندا هەبی! قومپانی بڕای! دەبی ئەمن سەرچیغ چووبم؟!!"

برایم ئاغە پاش ئەو هەموو قسانەی هەناسەیێکی قووڵی هەڵکێشا و ئیتر بێ دەنگ بوو. منیش لەگەڵ ئەو هەموو گومان و گلەییانەی ئاغە لێی کردم، سەرم سووڕا! ئاخۆ دەبێ من ئەم هەموو ئازارەم بۆ ئەم کەڵە مێردە دەگەڵ خۆمدا هێنا بێت؟ ئێستا دەبێ چۆن و بە چ ووشەیێك داخوازی لێ بکەم کە بمبوورێت! دەبێ بتوانی بمبوورێت و مەنتك هیچ نەڵێن؟!

"باشە، حەمە!" برایم ئاغە هەر ئەوەتا نەدەگریا، نزگرە قورگی گرتبوو، بەڵام ئەو جوامێرە دانی بە خۆیدا گرت، ئینجا توانی قسان بکات – "دوونێ شەوێ، ئەتوو چوویە حوجرەی فەقێیان، فەقێیەکان هاتنە کنە منو

باسی توویان لۆ کردم! ئەو فەقێیانە مکوڕ بوون لەسەر ئەوەی کە ئەتوو لە مەلایەکی باش بترازێی هیچی دیکە نی!" ئەمەی ووت و لیکی خۆی قووت داوە، ئینجا سەری گۆچانەکەی لە زەوی کوتا و گوتی – "لۆم باس کە! ئەتوو چەندت خیندییە؟ لە کێ خیندیتت؟ لە کن چ مەلایەکیت خیندییە؟ هیچ لە گوندەکەی خۆتان دەرچووی هەتا لە جێی دیکە و لە حوجرەی دیکەدا بخینی؟ باسی خۆت بگێڕوە و کەس قسەت لێ نابڕی. هەمووومان گێمان لێتە هەتا دووا قسەت گێت لێ دەگرین هەتا بزانین چت پێیەو چ دەرێی!"

ئاغە گەلەك بە ڕژدی قسەکانی خۆی کردو پاشان بێ دەنگ بوو و گوێی ڕاگرت تا ئاگای لەوە بێت بزانێ من چ دەڵێم و چی بۆ دەگێڕمەوە. دیوەخانەکە بووە چۆلەوانی؛ دەنگی تێکدانی پیاڵەی چای وەك دەهۆڵ دەزرینگاوە. ئامادەبووان هەر چاوێکیان بووە چوار چاو؛ گوێیەکان وشت بوون! پێویست بوو قسەکانم بە چاکی هەڵبژێرم، تا بتوانم سەردەستی بابەتەکە بم و دۆخەکە بە دڵی خۆم هەڵبڕم. بەڵام پێش هەموو شتێك ئێستا دەبێت قسە بکەم؛ جا گوتم:

"بسم الله! ئاغە، لە سەلامەتی خۆم دڵنیام بکە و منیش مەشکەکەت بۆ دەهەژێنم و کەرە و دۆیەکەت بۆ جودا دەکەمەوە." بۆ دڵنیا بوونی خۆم ئەم داوایەم لە ئاغەی کرد، پاشان گوتم – "پەیمانم پێ دەدەی کە دەمپارێزیت؟ بڵێم برایم ئاغە پەیمانی پێدام کە دەمپارێزێت، ئیتر منیش هەموو بابەتەکەت بۆ بگێڕمەوە؟" ئەمە دووا پرسیارم بوو لە برایم ئاغەی مەنتکم کرد. پاش پرسیارەکەم، لەوە تێگەیشتم کە من چەندە پێویستمە گوێم لە پەیمانی ئاغەی بێت، ئەویش هەندە شەیدای ڕاستی ئەو قسانەی من بوو کە ویستی لە لێوی خۆم و بە دەنگی خۆم گوێی لێیان بێتو ڕاستی ژیانی من بزانێت چییە! من بۆیێ دەمویست گوێم لە قسەی ئاغەی بێتو پەیمانی

پاراستنی ژیانم بدات تا سەربردەی خۆی بۆ بگێرمەوە. برایم ئاغە ناوبانگی ئەوەی هەیە کە پیاوێکە قسەی خۆی دەناسێتەوە و خۆی لە پەیمانەکانی نادزێتەوە و ڕێز لە زمانی خۆی دەگرێت. ڕاوەستام، چاوەڕێ بووم ئاغە ئا یان نایێك بکات.

"پاژنە بڕای! دەزانی پیاو لە چ دەبەسترێتەوە؟ پیاو وەکی حەیوانی نییە، لەملی یان لە پێی ببەسترێتەوە؛ پیاو بە زمانی دەبەسترێتەوە، ئەو کەسەی ڕێزی قسەی خۆی نەگری، کەس ڕێزی لێ ناگرێ." ئەو قسە نەستەقەی کوردانی بۆ کردمو ئامادەبووانیش، تێکڕا سەری خۆیان بۆی لەقاند؛ واتا ڕاستە. ئینجا برایم ئاغەی مەنتك جەختی کردەوە و فەرمووی:

"ئەمن خۆ گومانم لەوەدا نییە کە ئەتوو دەبی هەموو قسەکانم لۆ بکەی؛" ئاغە بەمە ئاگاداری کردمەوە؛ لەپاشاندا وتی — "ئا دەبی! لەگەر هەندێش، پاراستنی توو پەیوەستە بەو قسانەی کە هەنووکە دەبی بیانکەی، ئەوجا ئەگەر هەمووی بەڕاستی بگێڕیەوە و ئەولاو ئەولای تێدا نەکەی، ئەمنیش پەیامانت دەدەمێ کە ترساندرابووی یان تۆبزیت لێ کرابوو، ئەتوو بە خۆت کەست نەترساندییە و زۆریت لە کەس نەکردییە، ئەمن بێ شك بەرگریت لێ دەکەم و دەتپارێزم و ئامادەم بە خۆم و بە هەموو ئەو جوامێرانەی هۆزی مەنتك و بە هەموو ماڵ و سامانم بتپارێزم و نێلم دەستی کەست بگاتێ." برایم ئاغە زۆر بە پیاوانە و بەسەر بڵندی پەیمانی پاراستنی منی دا و ئەرەکەکەی لە ئەستۆی خۆی و هۆزەکەی، گرت.

"جوامێری، ئاغە!" لە خۆشی ئەو قسەو پەیمانەی برایم ئاغەی نەمزانی چۆن قسەکان بکەم، ئاخر هەموو چیرۆکەکە بە یێك قسە ناگەڕێتەوە و منیش دەمەوێ هەمووی خێرا بگێڕمەوە — "تکایە، گوێتان لەسەربردەکەم بگرن." ئینجا هەناسەیێکی درێژم هەڵکێشا، کاشکا بتوانم

وردو درشتی سەربردەکەمم وەبیر بێتەوە و میشکم لەناو ئەم کۆزە بکەم، تا وشەی جوان دەستبژێر بکات؛ ئینجا پاشان دەستم پێکردو وتم: "ئەو ڕووداوانەی ئێستا و ئایندەی ژیانیان گۆڕیم، لەو دەمەدا دەستیان پێکرد کە من بۆ یێکەم جار هەستم بەو دنیایەی دەوری خۆم کرد." بێدەنگ بووم؛ تەماشای ئەو ئاپۆڕەی ناو دیوەخانێم کرد. هەموو چاوەکان لە مۆڵەق مابوون؛ تەماشای منیان دەکرد. سەرەکان وەك سەری کەڵەشێری برسی، قیت ببوونەوە؛ دەیانویست بزانن چ دەڵێم؛ هەندێك لیوەکانیان تەتەڵەیان دەکرد، دەیانویست پرسیار بکەن، بەڵام ئاغە چەپارە بوو؛ بۆیێ قسەکانم ئاراستە کردن.

"خزمینە! من خەڵکی لادێی زڕگوێزم. لە دۆڵی جافایەتی. من جافم. باوکم میرێکی جافان بوو. میرێکی تیرەی تیلەکۆی جافان بوو. باوکم هەستی کرد فرە نەخۆشە، بۆیێ بەر لە مردنی، میرایەتی رادەستی یێك لە ئامۆزایەکانم کرد، تا من گەورە دەبم و کە باوکم فەرمانی خودای بەجێ گەیاند، من تەمەنم پێنجساڵان بوو.

میر محمدی جاف، هەموو ماڵ و موڵك و زەوی‌و زار و ماڵاتەکانی میری لێ زەوت کردم‌و تەنانەت ژیانێکی ئاساییشی بۆ من‌و بۆ دایکم فەراهەم نەکرد. دایکم ناچار بوو کۆڵ نەدات و ژیانێك بۆ من مسۆگەر بکات. باخێکی بچووکمان بۆ ماوە کە دایکم لە باوکییەوە بە میراتی گرتبوو. دایکم ڕێی نەدا من کار بکەم. ئەو کەڵە ئافرەتە، دنیای باش دەدیت و دووری دەڕوانی؛ بۆیێ پێی گوتم – 'بچۆ بخوێنە،ڕۆڵە.' ئەو ژنە لەلاییێك هانی دەدام تا بخوێنم و دەیگوت – 'پیاوی خوێندەوار جێی لەسەرەوەی دیوەخانێیە؛ خوێندەوار گەورەیەو دەبێتە براگەورە!'

لەلایەکەی ترەوە، دایکم ناچاری کردم تا بچم لە مەدرسەی فەقێیان، لەبەر دەستی مامۆستای گوندی، بخوێنم. جەختی لێ دەکردمەوە کە دەبێ بخوێنمو 'خۆم پەرومردە بکەم، ئەگەر خۆت فێری زانیاری بکەی، ببیە مەلا، دەبییەوە براگەورەو دەبێ میر، ئەگەر پیاو بێت، لە دوواتەوە نوێژ بکاتو بڕوات!' جارێکیان دایکم پێی وتم – 'پێویستە فێری خوێندن و نووسین ببیو پێویستە ئەو چەکەت لە دەست بێت کە چەکی زانست و هزرە. ئەگەر زانیاری باشت نەبێت، ناتوانی نە کاروباری خۆت و نە هی ئەم گوندەش بەڕێوە ببەیت.'" دیسان هەڵوەستەیێکی دیکەم کردەوە؛ جامێك ئاوم بەسەر دەومەوە کردو ئەلحەمدوللایەکم کردو سەیرێکی ئەو خەڵکە باشەم کردەوە؛ هەموو لەهەموو دەمیان بەش کردبووەوە؛ کە خەڵکەکەم ئاوا دیت، قسەیێکی کۆنی عارەبیم وە بیر هاتەوە کە دەڵێ – "کَأَنَّ عَلَى رُؤُوسِهِم الطَّير – وەك ئەوە بوون باڵندە لەسەر سەریانەوە نیشتبێت!" دیمەنێکی سەرنج ڕاکێش بوو! نەمهێشت وەئاگا بێنەوە کە گوتم:

"میر محمەدی جاف چاودێری دەکردم؛ ڕێی پێنەدام بۆ حوجرەی فەقێیان بچم و لەوێدا بخوێنم و بە دایکی گوتم – 'لێی گەڕێ! ئەو کوڕەت تەنیایە، ئەگەر فێری کارێك یان پیشەیێك نەبێ، بە تەنیایی بەڕێوە ناچێت! با ئەو کار و بەرخانە بلەوەڕێنێ و ببێتە بەرخەوان؛ بۆ حەمە ئەو کارە ئاسانە و بەسە!" دایکیشم کە گوێی لەم قسەیە و لە پێشنیارەکەی بەگ بوو، تێیگەیشت بۆچ نایەوێ من فێری خوێندەواری ببم؛ بۆ ئەوەی ببوو ملکەچی خۆی بم. دایکم هەناسەیێکی ساردی هەڵکێشا و نکوڵی لە قسەکانی میری کرد.

هەرکە لەکۆتکێ میری دوور کەوتینەوە، دایکم بەپێچەوانەی قسەکانی میر محمدی، ئامۆژگاری کردمو فەرمووی – 'ڕۆڵە! تۆ دوو ڕێگەت لەپێشە؛

یان دەبێ ببیە مەلاو وەك باوکت، بە عیلمەکەت، پێشڕەوی خەڵکی خۆت بکەی؛ ئەگەر ئەوە نەکەی و قسەکەم پشتگوێ بکەی، دەبێ بەقسەی حەمە بکەی و لەبری ئەوەی فێری زانست ببیت و بتوانی بچیتەوە شوێنی باوکت و ببیەوە میری جافان، دەبێ ببیتە خزمەتکار و نۆکەری محمد پاشای جاف؛ کامیانت لا خۆشە؟ من نامەوێ ببیە نۆکەر؛ دەمەوێ تۆ خزمەتکارت هەبیو پێڵاوت بۆ دابنێن؛ تێگەیشتی، کوڕەکەم؟' منیش بە گوێی دایکمم کردو قسەی محمد پاشام لە بیر کرد." قوڕگم ووشکی کرد، ئاوم خواردەوە. خەڵکەکە لەگەڵ مندا گونجابوون.

"دایکم سەرەژنی ئاواییەکەمان بوو، خوێندەوار بوو، ڕێبازی خوێندنی بە خێر و بەرەکەت دەزانی؛ منیش ئەوپەڕ ئومێدی دایکم بووم. ئەو دایکەم ئەوەی بۆی لوا بۆی کردم؛ کە بەگ نەیهێشت بچم لە حوجرەی فەقێیانی زڕگوێز بخوێنم، دایکم بە یانییێك لەگەڵم هات و منی بردە لای مەلای ئەو گوندە نزیکەی لای خۆمان و منی ئەمانەتی دەستی مەلای دا و پێی ووت – "مامۆستا! تۆ هاوڕێی باوکی محمدی بووی؛ ئەویش گەلێ جاران باسی دڵسۆزی و ڕاستی تۆی بۆ دەکردم؛ ئەو خۆی ڕۆیی و ئێستا وا لەبەر دەستی خودایە، بەڵام محمدی ئامەنەتی من دا، منیش ئەوا هێناومە و ئەمانەتی تۆی دەدەم؛ ئومێد دەکەم بۆ ئەم تاقە کوڕەم، ببیە خاڵ و مامو مامۆستا.

بەڵێ، ئاغە! دایکم شاژنێکی خوێندەوارو عەقڵمەند و دوور بین بوو. لەبەر دەستی باوکی خۆی فێری قورئانو حەدیس و خوێندنەوە و نووسین ببوو. باوکی پیاوێکی هزر پاك و ڕەوشەنبیر بوو. تا میری باوکم مابوو، زیندوو بوو، فەرماندار بوو، دایکم تاکە ژنە میر بوو، کە هەمیشە هانی خەڵکی دەدا تا فێری خوێندەواری بن. سوود لە ژیان وەربگرن. دایکم،

هاوشێوەی باوکی، هەموو ژیانی خۆی، تا باوکم لە ژیاندا مابوو، بۆ هاریکاری دێ نشینەکان تەرخان کردبوو، منیش یەکێك بووم لەوانەی دایکم پەروەردەی کردم، پشتیوانو ڕێ نیشاندەرم بوو؛ هەمیشە کۆشش و ماندووبوونی بۆ ئەوە بوو کە ڕیز لەخەڵك بگرم، خۆم فێر بکەمو بە مێشك و جەستە و ژینگەوە، خۆم پاك ڕابگرم." هەندەم قسە کردو هێندە ئەو یادەوەرییانەم کارییان تێکردم، دووبارە قورگم ووشك بوو، کەف هەردوو لێوارەکانی دەوی گرتم. قومێك ئاوم خواردەوە. جڵەوی هەستی خۆمم گرتەوە و وتم:

"بەڵێ، ئاغە! پاش ئەوەی سیپارەم خوێند و سورەتی (الفاتحە و الاخلاص و الناس)م لەبەر کردو دایکم نەیویست بەقسەی ئەو میرە بکاتو بۆ بەر بەرخانم بنێرێت، بەڵکوو منی نارده ئەو دێیەی دێیەی دراوسێی گوندی زڕگوێز؛ ئیتر مەلای دێیەکە وەکوو باوکم چاودێری دەکردمو هەمیشە وەبیر فەقێیەکانی خۆی دەهێناوە و دەیگوت – "محمد برازامە؛ بۆ من، باوکی ئەم کوڕە لە مەقامی برام بوو." جا قورگی دەگیرا و گریان قسەکانی پێدەبڕی و فەقێیەکانیشی هەموویان منیان وەك برایەکی بچوك لەناو خۆیاندا، پەسند کرد. دایکم وەك هیچ کام لە دایکەکانی ئەو کوردەوارییە نەبوو؛ سەرەژن بوو؛ ڕێبەر بوو؛ چاودێر بوو؛ بۆم باوكو دایك و برا و خوشك و مامۆستا و کتێبو دەفتەر بوو! هەمیشە هانی دەدام تا لە خوێندنەکەم باڵا بم و ئیجازەی دووازدە عیلم وەربگرم تا 'خەڵکی چاویان لە دەمی من بێت، بزانن چ دەڵێم، نەك من خۆم چاوم لە دەمی خەڵکی بێت تا بزانم چ دەڵێن.

کوڕم، دەبێ تۆ ڕێی ڕاست بە ئەو کوردگەلە نیشان بدەی و لە ڕاهی خودا خزمەتیان بکەی. ئامۆژگارییان بکە تا لە خراپە و دوو زمانی و درۆ دوو بکەونەوە؛ مێشکیان ڕوون بکەوە و فێری خواپەرستی ڕاستییان بکە.'

دایکم دەیویست من بکاتە هزرمەندتا قسەم لەناو خەڵکیدا بڕوات و منیش بتوانم کاریان فەراهەم بکەمو باری خواریان بۆ ڕاست بکەمەوە و فەلسەفەی ژیانی کامەرانییان فێر بکەم؛ پشتیوانی ئاشتیو هاوسەنگی ژیانی ئەو لادێییانە بکەم؛ گوندی زڕگوێز لەگەڵ گوندەکانی دەوروپشت جودا نەکەمەوە؛ ئومێدی دەخواست ببمە سەرۆك و مافی خەڵکی مسۆگەر بکەمو نەهێلم کەسێك بە دڵ ساردی شەو بخەوێت؛ دایکم دەیگوت – 'ئەگەر خەڵکت لێ قایل بێت، خودا لێت قایل دەبێت!' کە قورئانم ختم کرد، دایکم لە باوەشی گرتم و وتی: 'ڕۆڵە! منداڵی لە تەمەنی تۆ ئەم قورئانە پیرۆزە بەساڵێك یان بەساڵ و نیوێك ختم دەکەن؛ بەڵام ئەوە تۆ زۆر بە خێرایی هەموویت خوێند؛ خودا پشتیوانتە! حەمە، کەیفت بەخۆت بێت، تۆ فرە زیرەکی و هاوشێوەت لەم وڵاتەدا، بە دەگمەن پەیدا دەبن. نابێ تۆ پشت لەخوێندن بکەیت تا هەموو عیلمەکان دەخوێنیت.

' دایکم ئەم قسانەی بۆم دووبارە کردنەوە، ئینجا منی بردە لای مەلاو ئەمانەتی ئەوی دام و ئەویش، خودا لێی ڕازی بێت، قەواعیدی عارەبیو بنەماکانی شەریعەتی ئیسلامیی پێ خوێندمو لەلای ئەو کتێبی 'سعد اللەی بچووك'یشم خوێند. ئیتر مەلایەکە بڕی ویستی منی لە لا نەما؛ منیش بڕم بە دەرسەکانی ئەو نەدەشکا، ئاواتەکانم لەو گوندە دوورتر کەوتنەوە."

هەڵوەستەیێکم لە قسەکان کرد تا لێوەکانم تەڕ بکەمەوە و گوتم –

"بەرەو حوجرەی فەقێیانی گوندە نزیکەکانی گوندی زڕگوێز، سەفەرم کرد. بە دوای بەناوبانگترین مەلایەکانی ئەو دەڤەرانەدا گەڕام و لێیانم وەرگرت، تا سەردەمی جاحێڵیم داهات و فێری زانستی پتر بوومو ئەزموونی پتر لەو مامۆستایانەی کە دەرسییان پێ دەوتم و لەو فەقێیانەی کە لەگەڵیاندا دەژیام، فێر بووم؛ دڵنیا بووم کە هەر چەند پتر بخوێنم هێشتا

هەر قەواڵە بە تاڵە و زانین لە دیوی دوورتری ژیاندا لیسی کردووەو هێلکەی لێ داناوە و دەبێ بچم لەسەریانەوە، بنیشم تا هەڵبێن و سوودیان لێ ببینم! لەم دیوەش دایکم سەروەری ژیانم بوو، دەبوو هیچ هەنگاوێك نەهاوێژم ئەگەر ئەو پیرۆزیان نەکات؛ گەڕامەوە زڕگوێز و چومەوە ماڵ و دەستی دایکمم ماچ کرد، کاشکا ڕێگەم پێدەدات تا بچم لە قووڵایی کانیاوی عیلمی ئیلاهی بپشکنم و مرواری پڕشنگداری ئیسلامییان لێ دەربێنم و بێمە ڕیزی ئەو زانایانەی کە دەمناسین و ڕیزم لێدەگرتن. کە دایکم لە مرازی من گەیشت، شادەییێکی بە هەقی هێنا و فەرمووی – 'ڕۆڵە نە لە نامۆبوونو نە لە هەژاری مەترسە؛ چونکە هیچ کامیان تا سەر لەگەڵ کەسدا نابن.'

ئینجا هەڵوەستەیێکی کورتی کردو هزری خۆی تەیار دا و وتی – ' ڕۆڵە! ئەوانەی لە سنوورەکان وەرنەچەرخانەوەو بەمەبەستی فێربوونی زانست لێیان دەرباز بوون، هیچیان باری ئابووریيان لەهی تۆ باشتر نەبووە. ئەوەی لەخوێندن و فێربوون بترسی هەتا دەمری لەناو جغزی نەهامەتیدا دەژی. بڕۆ بخوێنە و لەبیرت بێت – ئەوەی بۆ خوێندن دەچێت، خودا ڕێی بۆ واڵا دەکاتو خەڵکیش دەست لەسەر سینە بۆی ڕادەوەستن.' ئەمەی گوتو سەری ماچ کردم.

من تەمەنم تەنیا چواردە ساڵان بوو، کە لە دەڤەری زڕگوێز دوور کەوتمەوە. پتر لە حەوت ساڵان لەو غەریبییەدا ژیام. لەو دوورییەدا تەنیا یێك ئامانجم هەبوو کە بە شەو و ڕۆژ هانی دەدام و هێزی پێ دەبەخشیم و ئارامی پێ دەگرتم؛ ئەویش فێربوونی زانستی نوێ بوو؛ لەهەر گوندێك مەلایێك ناوبانگی باشی دەربکردایە، خۆم دەگەیاندە ئەو گوندو دەچوومە خزمەتی مەلایەکە و لێی فێر دەبووم. شایەدی ئەوە بۆ مەلاکوردەکان دەدەم، کە دەیانزانی فەقێیەکی زیرەك بەدوواى زانستی ئیسلامیدا دەگەڕا، بێ سێ و

دوو لێکردن، لە قوتابخانەکانی خۆیاندا وەریان دەگرتن و فێریان دەکردن و لەناو مەلایانیش شانازییان پێیانەوە دەکرد.

منیش لەو لایەنەدا، شار بە شار و گوند بە گوندی کوردستانم پشکنی، لە بن دەسەڵاتی پارسەکانەوە بۆ ژێردەسەڵاتی عوسمانییانەوە دەچووم و وەرنەدەرچەرخامەوە؛ ئاواتم عیلم بوو؛ چەندین مامۆستای بەناوبانگ و چەندین مەدرەسەی فەقێیانم کردو لێم وەرگرتن. لە قوتابخانەکانی سنە و سلێمانی و پاوە و بیارە و هەولێر و شەقڵاوە و ڕەواندز و حەلەب و شام و موسڵ، خوێندم. نەوەستام تا توانیم هەر دووانزدە عیلمەکانی ئیسلامەتی فێر ببم؛ عیلمی قورئانو عیلمی حەدیس و عیلمی تەفسیرو عیلمی فیقە و عیلمی بەیان و بەدیع و نەحو و سەرف و علیمی مەنتق و عیلمی ریازیات و عیلمی فەلەك و عیلمی عەروزم تەواو کردن. گەیشتمە ئەو ئاستەی کە بتوانم ئیجازەی مەلایەتیوەربگرم و چووم لە حەلەب ئەو ئیجازە زانستییەم وەرگرت و لەوێشەوە هاتمەوە هەولێر و لە مەدرسەی قەڵات، لەو شارە و لە خزمەتی مەلای گەورەی مەدرەسەی قەڵات ئیجازەییێکی تری مەلایەتیم وەرگرت؛ ئیتر، لە چاکەی خوداوەندەوە، بوومە مەلا. ئەو کات تەمەنم تەنیا بیست و یێك ساڵ بوو، کە گەڕامەوە گوندەکەی خۆمان و ئومێدم بوو بەری ماندووبوونو دووری دایك و گوندەکەم بڕنم و لە گەڵ دایکمدا، بە یێکەوە بیخۆین و خودا دەستم بدا، بەشێك لە چاکەی دایکم قەرەبوو بکەمەوە. خەریك بوو خەونی بوونە مەلای گوندی زڕگوێزم بێتە دی و بەرهەمی خوێندنەکەم بخۆم و خزمەتی خزمو هاو گوندەکەم بکەمو قوتابخانەیێکی باش لەو گوندە بکەمەوە و مەلای باشی لێ فێر و پەروەردە بکەم. خەونی گەورەم بۆ زڕگوێز هەبوو؛ خەونیش دەبێت ببێتە ڕاستی تا بەرهەمی هەبێت!"

"جودابووبەوەکەم لە دێی زڕگوێز، لەهەموو پێشبینییەکانی هەڵبارد. ئاخر حەوت ساڵ دووری، باجی خۆی دەبێت! لەو دێیە سادەیە ئەو هەموو ساڵانە کەلێنێك لە نێوان منو خەڵکەکەی دروست دەکات! ژمارەیێکی کەمی ئەو خەڵکەی زڕگوێز لە ئاقاری گوندییان دوورتر نە دیتبوو! کەمیان هەبوو سەردانی گوندە نزیکەکانیان کردبوو! درەنگی شەو گەیشتمەوە زڕگوێز. کاتێکی گونجاو نەبوو تا سەردانی ماڵی میر محمدی ئامۆزام بکەم؛ جا یێکسەر بەرەو ماڵێ خۆمان بوومەوە و بۆ خزمەتی دایکم چووم؛ پیرە دایکم، کە چاوی بە من کەوت، لە خۆشی خۆیدا دەستی بە گریان کرد. منیش داهاتمەوە و کەوشەکانی ئەو پیرە دایکەم ماچ کرد. ئەویش هەردوو گوێچکەکانی گرتم و هەڵیستاندمەوە و بڵندی کردمو سەری لە باوەش گرتم، وا هاتە بەر چاوم کە من منداڵەکەی جارانم و لە باوەشی گرتوومەوە؛ ئای کە خۆش بوو! کە منداڵ بووم زۆر کەڕەت هەر بۆ ئەوە لە لادێیەکەی نزیکی زڕگوێزەوە دەهاتمە تا دایکم لە باوەشم بکات! دایکم دەستی لەسەر نیوچەوانم داناو خەریك بوو بزانێ ڕاستە ئەوە منم؛ من ڕاستم، یان هەر خۆی خەون دەبینێت! ئینجا پاشان باسکی کردەوە و وەك جاری جاران لە باوەشی کردمەوە؛ گوشیمی، بەرینەدەدام! ماوەیێك بوو هەناسەکانی هێندە توند بوون، ترسام دڵی ڕاوەستێت! ئای خودا! ئەو هەستەی ئەو دەمی لەهەموو شتەکانی تری ئەم ژیانەدا جودا بوو؛ ناکرێ بە وشە باسی بکەم!"

ڕاوەستام، لێوی خۆمم تەڕ کردەوە.

"ئەو شەوە لە ماڵی خۆمان، لەگەڵ دایکمدا، مامەوە. سەربردەی ئەو هەشت – نۆ ساڵەی، هەمووی، بۆ گێڕامەوە کە منی لێ دوور بوو. لە پێشدا باسی هەڵوێستی خەڵکی گوندی کرد. تێی گەیشتم کە لە بار و دۆخەکە ناقایلە و گوتی – 'کوڕم، گوێی پێ مەدە! لەمە و دووا، هەموو شتێك بە دڵی

تۆ دەبێ. دەتوانی هاریکاری میری بیت و یارمەتی بدەیت تا بە باشی فەرمانداری ئەم ناوچەیە بکاتو کار و باری ئەم جەفگەلەبەرێوە ببات.' کە دایکم ئەم قسانەی بۆ دەکردم متمانەی زۆری بە بۆچوونەکانی خۆی هەبوو؛ نەیدەزانی میر چی لە مێشکدا هەیەو زەمان چی لێم حەشار داوە! "

"دایە! بەڕاستی، من نامەوێ ببمە بەشێك لە فەرمانداری ئەم دەڤەرە؛ من پلانم ئەوە کە مەدرەسەیێك بکەمەوە و ببمە مەلای ئەم گوندەی خۆمان و خزمەتی زانستی فێری منداڵانی بکەم. هەڵوەستەیێکم کرد تا بزانم دایکم چ بێژێ. بەڵام کە ئەو هیچی نەگوت، من هاتمەوە قسەو وتم: دایکە! زانست لە فەرمانداری باڵادەستو گەورەترو بەهێزتریشە.

زانست دەسەڵات بۆ مرۆڤ دەڕەخسێنێت و وڵات بەرەو پێش دەبات و هاوڵاتییان دەحەسێنێتەوە و ئەو دەسەڵاتەش کە بێ عیلم و زانست بێت لێڵ و وێڵ دەبێتو ماڵ و وڵات و نەتەوە تێکدەشکێنێت. ئەمەم ووت و هەستی خۆمم ڕاگرت بەڵکوو دایکم قسەیێك دەکاتو شتێك دەڵێت. بەڵام ئەو خۆی لە بابەتەکە دزییەوە و سەرنجی بۆ بابەتێکی جیاواز ڕاکێشام و باسی سارای کچی میری جاڤانی بۆ کردمو فەرمووی – 'هەموو ڕۆژێك، سارا خان، سەردانی کردوومە، لە هەواڵی تۆی لێدەپرسیم و منیش هیچم لەلا نەبوو پێی بڵێم؛ بەڵام بەیانی کە هاتەوە، ئیتر هەواڵی تۆی پێ ڕادەگەیێنم، دەزانم دڵی خۆش دەبێت.' دایکم پاشان باسی ئەوەشی کرد کە هەر جار کارەکەرەکەی خۆی دێنێت و ماڵم بۆ خاوێن دەکاتەوە، جلوبەرگە دڕوونەکانم دەشوات و ماڵ گسك دەدات – 'سارا هەمیشە ئاگای لەمن هەبووەو گەلێ جارانیش لە تۆی پرسیوە. نازانم چۆن پاداشتی بدەمەوە! کوڕەکەم، ئێستا کاتی ئەوەیە کە ژن بێنی تا ئاگای لە خۆت و لە ماڵت بێت؛ ئاخر من داهێزراوم؛ توانای کارکردنم نەماوە! کاتی ئەوە نییە تا ژن بێنیت؟'

دایکم ئەم قسانەی بە نەرمە شەرمێکەوە دەکردو کە مەرامی دەرخست، چاوی لەبەر نا و داما. من لە بن زاری دایکم گەیشتم؛ دەیویست سارا بێنم. بیرم لە قسەکانی دایکم و لە ڕوخساری سارا خان کردەوە؛ لە جاران پتر شەیدا بووم تا ببیبێنم و ڕەنگە ئەگەر چاویشم پێی بکەوێت سوپاسی بکەم سەبارەت بەوەی کە لەسەردەمی دووری مندا، بۆ دایکی کردوومە. ئەو شەوەم بەسەر برد بیرم لە سارا و دایکم و گوندی زڕگوێز دەکردەوە؛ ژن‌و پیاوانی زڕگوێز، مزگەوتەکەی، کانییەکانی، حوجرەی فەقێیانی؛ زۆر ئامانجم بوو حوجرەیێکی گەورەترو پڕ موستەعید و سوختەی لێ بکەمەوە و بۆ خۆم دەرسییان پێبڵێم. ئەو شەوەی یێکەمی هاتنەوەم، شەوێکی گەشاوەی پڕ ئومێد و پڕ خۆشەویستی و پڕ ژیان بوو؛ دایکم و خەونەکانم ئەو شەوەیان بۆ ڕووناك کردمەوە! ماڵەکەمان سادە و ساکار بوو؛ لە ماڵی میرەکانی ئەم ناوە نەدەچوو، بەڵام خۆشتر بوو؛ پڕ لە خۆشەویستی بوو. هەر ئومێد بوو ڕاوی ئومێدێکی تازەی دەنا، تا یێکەم تیشکی خۆرەتاو هەڵیکرد! ئومێدی نوێتر هاتنە پێشەوە! ڕاستە درەنگ بوو، بەڵام هەر چوومە دیوەخانی میری؛ کوڕانی جاف لەوێ گرد ببوونەوە؛ ئاگردانی میری دەترووسکاوە؛ قاوە لەناو جەزوەکە هەڵدەچوو؛ کتڵییەکە بڵقی دەدا، چایە ئامادە بوو؛ باسی ئایندە و ئومێدەکان دەکران؛ میر محمد گوێی لەهەمووان ڕادەگرت. چەندێك لە دەرەوەی دیوەخانێ دەگەڵ خزمانی جاف گلم خوارد و چاك‌و چۆنیمان لە یێکتری کرد. جاف لە دیرزەمانەوە بە دووای زانینی تازەدا وێڵن؛ ئیتر پرسیار پرسیارەکانی پێش خۆی کۆن دەکردو پرسیاری نوێتر دەهاتنە پێش‌و دەکران

– "حەمە! ئەم هەموو ساڵە لە کوێ بووی؟" یەکێك پرسی.

"خۆت گەوجە مەکە!" کابرای تەنیشتە من‌وەڵامی داوە و گوتی: "لە حوجرەی فەقێیان بوو؛ دەیخوێند."

"دەباشـە دەی! ئـەرێ، ئیجـازەی مەلایـەتیت سـەند یـان هـەر ئـاوا هاتییەوە؟" هەر ئەو بە تەوسەوە پرسی.

بەڵێ!" وەڵامیم داوە، و جەختم کردەوە کە دوو ئیجازەی مەلایـەتیم بـە تـەواوی وەرگرتـووە و ئیجازەنامەکانیشـم لەلایـەنی دوو مـەلای گـەورەی حەلەب و هەولێر وەرگرتووە و چەندین مامۆستاش، کە ئامادەی ئاهەنگەکان بـوون، لەسـەر ڕێپـەڕەکانم نـاوی خۆیـان نووسـیوە و بەڕاسـتیان ناسـیووە، پاشان ئیجازەکانیان مۆر کردووە.

"پیرۆزە!" گەنجێك کە نەمدەناسی بە دەنگێکی بەرزتر لـەوانی دیکـە گوتی – "جا لێرە دەبیتە ئیمامو فێری خوێندنەوە و نووسینمان دەکـەیت؟" پرسـیارەکەی زۆر شـتی تێگەیانـدم! گەنجەکـە کەسـێکی وەك خـۆم بـوو! بلێسەیێکی پاشەڕۆژ بوو، پەیمانم دا هەموو زانستییەکانی خۆم خوێنـدوومن فێری ئەویان بکەمو پتریش!

"کاکـە، مـن لـە زرگـوێز قوتابخانـەیێك دەکەمـەوە و هـەر کەسـێك بیەوێت بخوێنێت، من فێری دەکەم قورئان بخوێنێتەوە و زانستییەکانی دیـنی ئیسلامیش دەڵێمەوە." وەڵامی کوڕەکەم داوە و چاوەڕێم کرد بزانم چ دەکـات. ئەویش لە خۆشیاندا، پێکەنی.

چەند کەسانێکی دیکە لە دەورماندا کۆبوونەوە و ماندوو نەبوونییان لێ کردم. هیتر هەبوون هاتن تا بزانن ئەو گردبوونەوەیە بۆ چ بوو! لە ئەنجامدا تێگەیشتن کە منداڵێکی جارانی ئەم دێیە، ماوەیێك بوو بزر ببوو و ئێستاکە وا هاتووەتەوە و جلی گۆڕیوە و بەرگی مەلایانی لەبەردایە و دەبێتە مەلای گوندەکەیان! ویستییان بزانن پاشی ئەو هەموو ساڵانە، منداڵەکەی گوندەکەیان چۆن گۆڕاوە و چۆن دەبێت! چەند خولەکێك لەناویاندا مامەوە، ئینجا بۆ ناو دیوەخانەکە چووم. میر هێشتا نەهاتبوو. ویستم بچم لە ماڵێ سەردانی بکەم. زەنگوڵە زەردەکەی سەردەرەی دەرگاکەیانم ڕاهەژاند و دەنگی داوە، بەڵام من چاوەڕێم نەکرد تا وەڵامم دەدرێتەوە و وە ژووری ماڵی ئاغەی جافان کەوتم! ویستم ئەرکی خۆم بەرانبەر بە میری جێبەجێ بکەم؛ بۆ من، هەر میر نەبوو، ئامۆزاشم بوو.

## دیمانەیێکی پێشبین نەکراو

لەبەر دەرگای ماڵی بەگزادە، تارمایی کچێکم بینی دەهات تا بزانێت کێیە لە دەرگەی دا و سۆراخێکی بکات. سەیری کچەکەم نەکرد؛ بەڵام سەلامم لێی کردو هەرکە کیژەکە گوێی لە دەنگم بوو، قیژاندی و گوتی:

"ئامۆزا! بە خێر هاتییەوە! بە خوا فرە خۆشە دیسانەکە چاومان پێت بکەوێتەوە. تا ئەم بەیانییە نەمزانی کە هاتیتەوە! ئەم بەیانییە زوو باوکم باسی هاتنەوەی تۆی بۆمان کرد، بەڵام نەیدەزانی کەی دێیەوە، هەر وتی دێتەوە. زۆر پێمان خۆش بوو! کەی گەیشتییە جێ؟" کچەکە پرسیاری لێ کردم. ئینجا منیش تەماشایم کرد، گەلەك ڕێك بوو؛ جوانییەکی بێ هاوتا بوو! وێنەی بە چاکی لە بیرم نەمابوو؛ بۆیێ بە پوختی نەمزانی پەریزادەکە کێبوو، ناچار پرسیم:

"تۆ کێی؟ نەڵێی من سارامە؟ ئای هاوار خودایە! ئەمە تۆی، سارا خان؟!!" بە هەموو واتای حەپەسانەوە پرسیارەکانی خوم لێی کردو سەرسامی خۆمم بۆی دەربڕی، ئەویش پەری ئاسا، گرژییەوە و بە نەرمی لێی پرسیم:

بەڕاست! ئامۆزا نامناسییەوە؟ من ئەم هێندە گۆڕاوم یان تۆ هێندە پەرمت سەندووە و منت لە بیر چۆتەوە؟"

"کچە ناسکەکەی عێلی جافان، فرە هەڵکشاوی و بوویتە بووك، هەی ماشاو الله!" سەرسڕمانی خۆمم پێی دەربڕی.

"ئامۆزا! خۆ تۆش وەك فەقێیە چکۆڵەکەی جارانی حوجرە و مزگەوتی دێی زڕگوێز نەماوی! ئەمێستاکە مەلا محمدی ئامۆزام گەنج و جهێڵ و بەرچاوە!" سارا وەڵامی دامەوە؛ قسەکانی سارا وەك قسەی هەموو کچە جافانی ئەم ناوە نەبوو! دەنگی پڕی متمانە بە خۆبوون بوو! قسەی زۆری لەگەڵدا کردم؛ ووشەکانی بە دڵ و داو هەڵدەبژاردن؛ ووشە بە ووشەی دەهۆنییەوە و تامێکی تایبەتی دەدانێ و وەك ئاواز لە قورگی دەردەچوون. تەنیا تاکە ووشەیێکی بەسەر زماندا نەهات کە واتای تایبەتی خۆی نەبێت؛ فرە ڕووناکبیر دەرکەوت.

"لە باوکمم بیست بوویتییە مەلا! پیرۆزە! شایستەی پتریشی! ئای ئەگەر دەزانی چەندە بەو مەلایەتییەتەوە شادمانم، ئامۆزا!" قسەکانی پڕ سۆز بوون، وەك ئاوێکی ڕوون بەسەر لێوەکانیدا شۆڕ دەبوونەوە؛ ووشەکانی شیعرێکی تازەجۆر بوون؛ پێشتر کەس ئەو قسانەی نەکردبوو، کەسیش ئەم جۆرە هەستە خاوێنەی بۆم دەرنەبڕیبوو.

"بەڵێ، سارا خان ئیجازەی مەلایەتیم وەرگرت و هاتمەوە تا خزمەت بکەمو گەلەك سوپاست دەکەم؛ خودا لەمنت نەستێنێ. سوپاس بۆ ئەو هەموو یارمەتییەی کە پێشکێشی دایکت کردوومە؛ گەلەك باسی تۆی بە چاکە بۆ کردم؛ چاکەکانت لەبەر چاو و لەبەر دڵ دەمێننەوە؛ خودا پاداشتت بداتەوە، ئامۆزا....!" ویستم قسەیێکی تریش بکەم، بەڵام بەسەر زمانمدا نەهات! بۆم نەکرا پێی بڵێم —

"... شیرینەکەم!" تا ئێستاش، ئەم وشەیەم لە دڵدا بە حەسرەت ماوەتەوە.

"شایانی نییە، ئامۆزا! دایکت هیچی لە دایکم هەڵنەباردووە! کە لە باوەشم دەگرێت، هەست بە گەرمی سۆزی دایکم دەکەم. سۆزی دایکت دایپۆشیووم! وادەزانم کە دایکی هەقی خۆمە!" زۆر بە دڵ هەستی خۆی بۆ دەربڕیم و پاشان باسی خوێندنی خۆی بۆ کردمو هێدی هێدی دوو سێ قسەی دەکردو هەنگاوێك بەرەو ژووریٚ دەبووینەوە؛ بابەتی نەخۆشی دایکی بۆ گێڕامەوە و لێی پرسیم ئایا دەزانم کە لەو کاتی دوورکەوتنەوەی من بۆ خوێندن، دایکی مردووە؛ ئیتر هەناسەیێکی قووڵی هەڵکێشا، تەمای بوو بگرییٚ، بەڵام من بابەتەکەیم لیٚ گۆڕی و پرسیم:

"قسەکردنت وەکوو هەموو خەڵکی نییە؛ دەڵێی خوێندەواریت هەیە؟" پرسیارەکەم وەك بارانێکی بە تاو بوو کە بەسەر خاکێکی ووشکدا دەبارێت؛ ڕوخساری سارا گۆڕا، دەتگوت مانگی چواردەیە و دەدەرەوشێتەوە، کە وەڵامی دامەوە و گوتی:

"کە قورئانم ختم کرد لە خوێندن نەچەرخامەوە؛ تا تەواو فێری نووسین و خوێندنەوە بووم." ئینجا بۆی ڕوون کردمەوە کە شیعرەکانی نالی و مەستوورەو بابە طاهری خوێندووەو هەندێکیانی لەبەر کردوونە و پاشان باسی گوڵستانی کردو وتی:

"تەواوی کتێبی گوڵستانی شێخی سەعدی شیرازیم خوێندووە و بە ڕەوانی و بە ڕەهایی قورئانی پیرۆز دەخوێنمەوە و چەند جاریش ختمم کردووەو لەبیرم نەکردووە چەند خەتمێك بۆ تۆ بکەم تا خودا هاریکارت بێت." ئەم قسانەی بۆ گێڕامەوە تا گەیشتینە بەر دەرگەی ژووری ماڵەوە؛ لەوێدا لێیم پرسی:

"هیچ شیعرێکی نالیت لەبەر کردووە؟" کە گوێی لە پرسینەکەم بوو، جەختی نەکردەوە کە ئا یان نا، بەڵکوو دەستی پێکرد جووتەوانەیێك لەبەردا بخوێنێتەوە و گوتی:

{هەتا تۆم ئاشنا بووی، ئاشنا بوو، ئەمێستا، موو بە موو، ئەغیارە بێ تۆ!}

{لە کن من با وجودی ناس و ئەجناس، کەسی تیدا نییە ئەم شارە، بێ تۆ!}

ئای لەم شۆخە چاو نەترسو زیرەك و بلیمەتە! ڕاستی و ڕەوانی ئەم کچە میرە واقی وڕ هێنام! هەستی خۆی هێندە بە زیرەکی دەربڕی کە سەرنجی ڕاکێشام و حەپەساندمی؛ وەك هیچ کچە کوردێکی دیکەی ئەم سەردەمە نەبوو کە پێشتر بینیبوویانم؛ ئەم شازادەیە زیرەك و بلیمەت و ڕاستو نەترسە؛ هاوشێوەی ئەم سارایە، ڕەنگە لەم سەردەمە، لە کوردستاندا، نەبێت! نەوێرام لێی بپرسم ئایا ئەم شیعرەی نالی بە مەبەستەوە خوێندەوە، یان هەر تەنیا ویستی زیرەکی خۆی نیشان بدات و بۆ ئەوە لە ئەزبەری کردووە چونکە ناسکترین دوو دێڕی شیعری کوردی بوون؛ ئەگەر مەبەستی من نەبووبێت، بۆچی ئەم دوو دێڕەی هەڵبژارد؟ ئەگەر مەبەستیشی منە، ئەی بۆچی ئەم هەستەی بۆم هەڵناڕێژێت؟ بابەتەکە زۆر لە مەیل دەچوو! منیش نەمتووانی ئەو مەیلە شی بکەمەوە! ئەو شۆخ و نازدارەی جافان ڕەگی لە ناخ دڵمدا کوتا! ناسك بوونو بەم دوو دێڕانە ئەم کچە جوانە تێیگەیاندم کە خوێندەوارێکی باشیش بوو؛ زیرەك بوو؛ ڕووناکبیر بوو! شیرین بوو؛ دڵبەرێکی نە درێژ و نە کورت بوو؛ سرووشتی، زەردەخەنەی، ددانە مرواریییەکانی، ڕوومەتە گوڵ ڕەنگەکەی، لە دنیادا تاك و بێ هاوتا بوون! سارا خاتوون شازادەیێکی تەواوی زیت و ڕەشید بوو! لێوەکانی دەتگوت

جووتە لێوی دەستکردی نەخشی نیگارکێشێکی شارەزای پارس بوون؛ پێشتر چاوی هێندە شینی ترووسکەداری گەش و زیرەکم نەدیوە؛ پڕ ڕیز و پڕتر بوون لە خۆشەویستی؛ سەرنجی ڕاکێشام؛ دڵی بردم؛ واملێهات وەك ئەوەی کە هەر لەمنداڵییەوە شەیدا و سووتاوی ئەم پەریزادە بم! 'دڵ ژ من بر، دڵ ژ من!' نەشیام چیتر قسەی دەگەڵدا بکەم؛ ناچار بە خۆمم گوت – "ئای زەمان! ئامۆزام گەورە بووە؛ لە شەکر شیرینترە؛ شەهدە؛ هاوشێوەی دروست نەبووە؛ ناسکە ئەم ئامۆزایەم باڵندەیێکی نەوازەیە و لە ناخ هێلانەکەی دڵم نیشتووە." وورێنەم کرد تا سارا وتی:

"ئامۆزا! لە دووری تۆ، زەمان باڵی لەمن گرتبوو! لە بیرتە، چەند ساڵە لێمان دووری؟ چەند ساڵ پێش ئێستا هاتییەوە؟ ساڵەکانی دووریت زۆر گران ڕەت دەبوون! زەمانی دابڕانت سەنگی بەسەر دڵمدا هەبوو؛ ڕۆژەکانی دووریت نە دەڕۆیشتن، نا!" لەگەڵ ئەم قسانەیدا، خەریك بوو سارا دەگریا؛ ناچار بۆ دڵدانەوەی پێیم ووت:

"لە بیرتە کە دووا جار یێکتریمان بینی؟ من سێ چوار ساڵ لە تۆ هەراشتر بووم؛ تۆ تەنیا یازدە ساڵان بووی." ویستم بابەتە سەرەکییەکەی لە بیر ببەمەوە.

"ئەی ئەمێستاکە؟" سارا قسەکانی پێبڕیم، "من ئەو کاتیش هەستم بە تۆ دەکرد؛ بۆیێ هەر چاوەڕێی هاتنەوەت بووم، تا هاتییەوە! لە دووری تۆ ژیان تاڵ بوو، ئامۆزا! چاوەڕوانی کردنی تۆ، بۆ من مردن بوو! بە خەیاڵیش نەدەگەیشتمە تۆ؛ هەستم وابوو کە ئیتر مەحاڵە بتبێنمەوە! ناتبێنمەوە؛ کەچی ئەمێستا ئەمە تۆ، خۆتی وا بە تەواوەتی لە پێش من ڕاوەستاوی و چاوەکانم ئاوی چاوەکانت دەخۆنەوە؛ هاتییەوە، بە خێر بێیتەوە؛ جافگەلت ڕووناك کردەوە." پاش ئەم هەمووو دووا خستنە، ئینجا هەردووکمان

هاتینەوە سەرەخۆ و داوای لێکردم تا سەلام لە محمد بەگی جاف بکەم؛ پاشا لەوێ دانیشتبوو. نەمزانی چی بکەمو چ بڵێم! پرسیارم نەما، سارا بێ قسە ڕاوەستاو سەیری کردمو زەردەخەنەیێك بەسەر ڕوومەتەکانیدا هات و ئاگری دڵی خۆشتر کردم، ئینجا سارا ئاماژەی بۆ لای باوکی کردو گوتی – "فەرموو، مەترسە! ئەمە باوکمە! کوڕ مامی خۆتە؛ بچۆ بۆ لای. باوە، مزگێنی! مەلا محمدم بۆ هێناوی." ئەمەی ووتو لە دیوارەکە سووڕاوە و وون بوو. کە سارا بزر بوو، ئینجا من هاتمەوە سەر دۆخی خۆمو وەبیرم هاتەوە کە ئەم کۆشك و تەلارە هی باوکم بوونو من منداڵیم لەناو ئەو ژوورانەدا ڕابواردووە، هەموویم وەبیر هاتنەوە، جا وەژووری کەوتمو چوومە کن پاشا تازەکەی جافان. سەلامم لێی کردو سەرم بۆی دانەواند. میریش وەخێرهاتنی کردمو داوای لێکردم تا بەدوایدا بڕۆمو چووە ژووری.

## میری تیرەی تیلەکۆی ئێلی جافان

لەدوورەوە دیتم میر محمدی جاف لەسەر کۆسپەی ماڵەکەیانەوە دانیشتبوو. پیاوێك بوو بە جەستە لەهەموو ئەو مرۆڤانە گەورەتر بوو تا ئەمرۆ بینیووبوویانم! کەللەسەرێکی زەبەلاح لە نێوانی هەردوو شانەکانیدا چەسپابوو. وا پێدەچوو ملی نەبێت! دوو چاوی سەوزی هەبوون، وەك دوو قلە مۆروو بوون کە یەکێك لە کەلێنی دیوارێکدا شاردبێتییەوە. کوڵمەکانی لە کوڵمی هیچ کام لەو جوتیار و شوان و ئەوانە نەدەچوو کە لە دەرەوەی دیوەخانەکەیدا دانیشتبوون؛ دیار بوو کە سەری کوڵمەکانی هەتاویان پێنەکەوتبوو؛ سپی بوون، لەبەر ڕووناهیدا، دەترووسکانەوە. ئەنگوچکەکانی بە دەوری باسکیدا لوول درابوون؛ فەقیيانەکەی گەورەو درێژ بوون. سەیری باڵندە ماڵییەکانی خۆی دەکرد. دانی بۆ فڕێ دەدان و ئەوانیش بە دەوریدا کۆ ببوونەوە. بەیانی باشم لێی کردو سەری خۆمم بۆی نەوی کرد، تا ڕێزی لێ بنێم. میریش بە گەرمی وەخێر هاتنی لێ کردمو داوای لێکردم تا لە دووایەوە بچم و خۆیشی بۆ ژوورەکە چوو وتی:

"پێمخۆش بوو ئیجازەی مەلایەتیت وەرگرت." پاشان ئاوەڕی لێ دامەوە و لەسەر دۆشەکەکەی لای سەرەوەی ژوورەکە دانیشت و ئاماژەشی بۆ من کرد تا لە خوارووی ئەو دابنیشم و وتی – "حەمە، دەڵێن بوویتە مەلایێکی گەلەك باش! شانازیت پێوە دەکەم!" ئینجا سەری خۆی بەرز کردەوە و سەیری بەرگەکەی کردمو گرژییەوە – "جوانە، لێت دێت!"

ئەمەی ووت و ئاکاری ڕوخساری گۆڕا و پرسی – "مەلا! بە تەمای لە کام لادێ دابنیشی و مەلایەتی بکەی؟" تفی قورگی خۆی قووت داوە، ئینجا بۆی ڕوون کردمەوە – "دەزانی، دەبێ لە دێیێك ببیتە مەلاو گوزەرانی خۆت ڕێك بخەی و نەهێڵی چاوت لە دەستی کەس بێت؛ کوڕە میر نابێت چاوی لە دەستان بێت، وایە؟" لێی پرسیم؛ بەڵام چاوەڕوانی وەڵامەکەی نەکردەو وتی – "لەم دەڤەرەدا، لادێ زۆرن مەلایان نییە! بەڵام بۆ خۆت باشترە لێرە دوور بکەویەوە؛ دەڵێن لە دەوروبەری کەرکووك و کفری و کەلار گەلێك گوندی کوردان هەنە بێ مەلانە و دەتوانێ لە یەکێك لەو گوندانە مەلایەتییێك بدۆزیەوە و لەوێدا لەنگەر بگریت و بگوزەرێی."

پێشنیازەکەی هەورەتریشقە بوو، هەستێکی نامۆی لە ناخ ناخمدا بەرپا کرد. سەرم سڕما، حەپەسام! بۆ ماوەیێك دەمم بەسترا! کە هاتمەوە سەرەخۆم، نەمویست بابەتەکە بتەقێنمەوە! تێگەیشتم کە میر محمد لە گەڕانەوەم بۆ گوندەکەی خۆمان دەترسێ و لە ناخەوە شلەژاوە و نایەوێ نەك بچمەوە ئەوێ، چجا ئەگەر ببمە مەلا لەو گوندە، جا با هەر لە ڕوخساری بە دیاری نەدا! لەوە دەترسا نەکا داوای دەسەڵاتی باوکم بکەمەوە و ڕێ لە میراتی ئەو بگرم. من زۆر لەو جودا بووم، بۆیێ ئەو لێم دەترسا؛ من مەلا بووم و قسەو ڕەفتاری تایبەتی خۆمم هەبوو، دەمزانی بە شەرعی خودا، شوێنە نا شەرعییەکەی لەق بکەمو بینێرمەوە ناو ئەو خانووەی تێیدا گەورە بووە. ئەمانە هەموویان مافی خۆم بوون، لە باوکمەوە بۆم مابوونەوە. کەس ئەو مافەی نییە ماڵی کەسانی دیکە داگیر بکات؛ کەچی ئەو دەستی بەسەر ماف و ماڵ و دەسەڵاتی شەرعی مندا گرتبوو.

پێش ئەوەی میر محمدی جاف ئەم قسانە بکاتو پێشنیازم بۆ بکات تا لە زرگوێز دوور بکەومەوە، من هەرگیز ئەم خەیاڵانەم بە هزردا نەهاتبوون!

ئەو بە خۆی ئەو هەستانەی منی چەخماخە دان! لەگەڵ ئەمەشدا، بۆی جەخت دەکەمەوە کە من هەرگیز چاوم لەو ماڵ و موڵکەی ئەو نییە و ناشبێت. من لەوە دڵنیام کە خوڵا بۆ ئەوە میر محمدی هێناوەتە دنیا، میر و ئاغە و دەسەڵاتدار بێتو منیشی بۆ ئەوە داهێناوە تا خواناس و ڕابەری هزری ئایینی ئەم جافگەلە هەژارە بم. من چاوم لە فەرمانداری نەبووەو نییە! محمد بەگی جاف بۆ ئەوە دروست بووە تا دەسەڵاتدار بێتو منیش پێشڕەو بم، جا با وا بێت؛ بەهەر دە پەنجە بۆی مۆر دەکەم! پشتی دەگرم! ڕێی بۆ ڕوون دەکەمەوە تا زوڵم نەکات و ببێتە فەرمانداڕێکی حەقپەرست.

سەبارەت بە ئارەزووی خۆشم؛ من دەمەوێت هاوگوندنشینەکانی خۆم فێری خوێندن و خوێندنەوە و نووسین بکەم؛ تا وەك مرۆڤ بژین و سەر بۆ کەس دانەنەوێنن. دەمویست فێریان بکەم چۆن دەتوانن چاك بن، سادە و ئارام و سەلامەت بژین. لەخەڵکەکەی خۆمان دەخوازم کە ڕاست بن، دادپەروەر بن، یەکسان بن. لەبەر چاووم ڕوونە کە دەتوانم سوود لە دەسەڵاتی ئایینی خۆم بۆ پێشخستنی ژیانی ئەم جافگەلە ببێنم. میر محمدی جاف پشتیوانم بێت، دەتوانین دادپەروەری لەناو جڤاکی جافایەتی بچەسپێنین، نەهێڵین هیچ کەس بندەست بکرێت، زوڵمی لێ بکرێت، فریو بدرێت. بەڵام، میر محمدی جاف منی لە قاوخی هزرە بەرزەفڕەکانم دەرکردو پرسی —

"پرسیارم لێت کرد؛ بەڵام هیچ وەڵامت نەدامەوە! بە تەمای بچیتە کامە لادێ؟ لادێیەکی نزیکی کەرکووك، یان شوێنێکی تر؟" دەیویست بە تەواوەتی لە کرۆکی پلانەکانم تێبگات.

"ئامۆزا! بەڕاستی، تا ئێستا ئەمەم بە خەیاڵدا نەهاتووەتەوە کە لە زرگوێز دوور برۆم!" زارم هیشك بوو، بۆ چۆڕێك ئاو خەریك بو بە ئاسمانێ هەڵگەڕێم، بەڵام دەبوو قسەکانم ڕوون بکەمەوە، جا وتم — "من ئێستا تەنیا

بەو مەبەستە هاتمە لای بەڕێزتان تا خۆشەویستی و ئیحترامتان بۆ نیشان بدەم." ئەمەم ووت و تێمگەیاند کە من سوپاسگوزاری دایکم و پاشا و خەڵکی گوندی زرگوێزم؛ "چونکە ئەگەر ئێوە هەموو نەبوونایە، مەحاڵ بوو من بتوانم خوێندنەکەم تەواو بکەمو ئیجازەی مەلایەتیوەربگرم." ئەمەم ووتو هەڵوەستەیێکم لە قسەکاندا کرد تا سەر لە نوێ بیر بکەمەوە و پەشێوییەکەم بشارمەوە، جا هاتمەوە قسە – "ئەم زانیارییانەی کە من فێریان بوومە و هێناومەتەوە، بە هاریکاری ئێوە بووە، سوپاس بۆ هەموو لایێکتان. میر، لە ڕاستیدا من بەو خەیاڵە هاتوومەتەوە کە خودا ناسی و خوێندن و نووسین لەم دێییە بەرپا بکەم؛ بۆیێ وا لێرەم تا پشتیوانی فەرمانداری تۆ بکەم، ڕێی خوداتان بۆ ڕەوشەن بکەمەوە." ئەمەم ووت هیچم نەما تا ڕاڤەی بکەم.

لەم دەمیدا، ئەوەم هاتەوە بیر کە ئەم پیاوە هێندەی لە باردا نەبووە بتوانی سەرێك لە دایکم بدات، کە ماموژنی بوو، هێندەشی لە باخەڵێدا نییە کە سەر دانەوێنێ و دان بە پلەی زانستی مندا بنێت و وەك ڕاوێژکاری ئایینی خۆی پەسندم بکات. ماومیێك بوو بێدەنگ بووم، ئەویش هیچ قسەی نەکرد. ویستم سوپاسی بکەمو لە ژوورەکەی دەرچم کەچی لە هیکڕا، وتی:

"ئەرێ، تۆ قەت منت بینیوە یان لەمنت بیستووە کە لە ڕێگەی ڕاستی خودا لامدابێت؟" بە توندی ئەم پرسیارەی لێکردم.

"خوا نەکات!" خێرا وتم ، "ئێوە براگەورەی ئێمەنە، منیش مەبەستم ئەوە نەبووە باسی هیچ کارێکی ناڕەوا بکەم! بەڵام، خۆ ئاشکرایە کە تۆ ئامۆزا و گەورەی منی، منیش تا مابم، شانبەشانی تۆ ڕادەوەستم و پشتیوانت دەبم، دەمەوێ لە گوناحت دوور بکەمەوە و ڕێگەی شەریعەتت

نیشان بدەم. منو تۆ، وێکڕا، ئەم دەڤەرە پێش دەبەین، تا دەبیتە ڕابەر و جا هەموو کوردستانییان چاومان لێدەکەن." جەختم لە ڕێبازی خۆم کردەوە.
محمـد پاشـای جـاف نـەختی هێـومر بـووەوە، داسـەکنا، هەناسـەیێکی قـووڵی هەڵکێشا؛ سەیری هەر چوار دەوری خۆی کرد، تـا دڵنیـا بێـت کـە کـەس لێـرە نەبووەو کەسیش گوێی لێمان نەبووە؛ بۆی ئاشکرا بـوو، تـەنیا هـەر خـۆی و من بووینو کەسی دیکە لەوێدا نەبوو، جا وتی:

"ئێمە لێرە، مەلای خۆمانمان هەیە؛ مەلایێکی باشمان هەیە! جا ئێمە مەلایێکی تازە مەلامان پێناوێت!" حەمە بـە تـووڕەیی قسـەکانی خـۆی کـردو بێ دەنگ بوو و لیکاوی خۆی قووت داوە، پاشان وتی – "بۆ تۆ وا پەسندە کە زڕگوێز بـەجێبێلی. مـن کەسـم نـاوێ یارمـەتیم بـدات." قسـەکانی پـتر لـە فەرمان دەچوون نەك پێشنیاز، ئینجا وەك شارەزایێك قسەی کردو ڕای وابـوو کە بچم لە گوندێك بگەڕێم مەلای لێنەبێتو لەوێ مەلایـەتی بکـەمو وتـی – "لێرە جێی تۆ نابێتـەوە؛ دێـی زڕگـوێز جێـی تـۆی لـێ نییـە. تێدەگـەی؟" لـە قسەکانیدا، زۆر تووڕە و توند خۆی نواند.

بڕیارەکەی میر لەبەرانبـەر مـن دای، بـە تـەواوەتی نـاڕەوا بـوو. سـەرم لێـی سـڕما؛ ئـاخر خـۆ مـن هـەر ئـەو هەنـدە نـەبووم کـە بـە هـۆی زانسـتە ئایینییەکەمەوە شایستەی مەلایەتی ئەم گونـدە بـووم، بـەڵکوو مـن شایسـتەی ئـەوەش بـووم کـە لـە شوێنی مـیر محمـدی جاف، دانیشـتبام و تـۆپ و کلیلـی میرایەتی بەدەستی من بووایە. ئاخر مـیر محمـد پـاش مردنـی بـاوکمو دووری مـن لـە زڕگـوێز سـەرینی میرایـەتی لـە ژێـر سـەری خـۆی دانـا. گوندەکـە بـە تەواوەتی موڵکی باوکم بوو؛ بەڵام ئەو زانستەی مـن هـەمبوو، ڕێـی لێگـرتم و نەیهێشـت دەودەوانـێ لەگـەڵ حەمـەی جافـدا بکـەم. ئەگـەر دەنگـم بکردبـا، ڕەنگبـوو ڕەنگیشـم لـە دەسـت بـدابا! گوتوویانـە ئەگـەر قسـەکردن زیـو بێـت،

بێدەنگی زێڕە؛ من لەگەڵ ئەم گۆبەندە دا نیم، کە تەنیا لەم کاتە ناسکەدا دەبێ ملکەچی بم.

"حەمە! بۆ خۆت لە لادێیەکی تر بگەڕێ؛ ئێرە شوێنی تۆ نییە و ناشبێتەوە!" وەك لەناوچەی هەولێر دەڵێن - میر لە بنی کودی دا.

"بەڵێ! میرم." نەرماتیم بۆ میری ئامۆزام نواند؛ ویستم ئەم سەردانییەم بەرهەمدار بێتو بریندار نەبێ!

میر هەستا و منیش بە دووایدا ڕۆیشتم تا دەرەوە؛ دڵم شکا بوو؛ بڕیارە چاوەڕوان نەکراوەکەی حەمە دنیای لەبەر چاوم تاریك کرد. ئەگەر ئەم ئامۆزایەم قایل نەبێت لەم گوندەدا بمێنم و بژیم، ئەرێ چۆن قایل دەبێت سارای کچی شوو بە من بکات؟؟! من لە نێوانی میرو هۆزی تیلەکۆی جافان لەلایێك و کچە خانمەکەی لەلایێکی ترەوە سەرگەردان ببووم. ئارەزووم بوو، لە ڕێی چوونە دەرەوەدا، دووبارە چاووم بە سارا خان بکەوێتەوە. بەڵام داخ! نەمدیتەوە؛ ڕۆیشتبوو، لەوێ نەمابوو!

هاتمەوە بۆ لای دایکم. بڕیارەکەی میر محمدم پێی ڕاگەیاند. ئەم ژنە خانەدان و هۆشمەندە بۆ ماوەیێك داما؛ قسەی بۆ نەهات! قسەی نەکرد، نەکا سەرچێغ بچێت و ئەنجامی خراپی هەبێت. پاشان زەردەخەنەیێکی حەکیمانەی بەسەر لێوەکانیدا هات. تەماشای کردم؛ دیار بوو دڵی سوار بوو! توانیم ناو مێشکی بخوێنمەوە؛ زانیم چی لە ناخدا شاردووەتەوە. خەمبارییەکەی هێندە دژوار بوو، هێندەی نەما بوو ئەو ژنە مەزنە خۆڕاگرە، بهاڕێت! بەڵام هێندە بە توانا بوو، زانیم کە دەتوانێت بەسەر ئەم شاخە ڕەقانەشدا زاڵ ببێت. خۆزگەم خواست وەك ئەو سەرەژنە دنیادیدە بوومایە و دڵم نەلەرزیبا! بینیم لە هیکەوە ڕوخساری گەشاوە و وتی:

"ڕۆڵە! میر محمد لە کورسییەکەی خۆی دەترسێت! هەر شتێکی بە ناهەق بەدەست کەسێك بکەوێت، ترسی لە دووادا دێت؛ چونکە هی ئەو نییە، دەبێ بیداتەوە خاوەنەکەی. حەمە لەوە دەترسی دەسەڵاتەکەی لێ بستێنییەوە! هەموو دیرۆکی ئەم خێڵە گەواهی ئەوەیە کە میریی هی ئەم حەمەیە نییە و بە شەرعی موڵکی باوکتە و دەبێت لەپاشی ئەو بۆ تۆ بێت." دایکم هەناسەی سوار بوو، ئامـاژەم بـۆی کـرد تـا هەڵوەستەیێك بکاتو هەناسەیێك بخواتەوە و لێوی خۆی تەڕ بکاتەوە.

"کوڕم! ئەو ناتوانێت تۆ لە ئامۆزایەکانت دوور بکاتەوە، ئەوان پشت و پەنای تۆن. بەڵام نایەوێت چاوی پێت بکەوێ، چونکە کە تۆ دەبینێت، یێکسەر وەبیری دێتەوە کە ئەو خۆی بەردەستەی باوکت بووە ئاوا بەردەستەی تۆش دەمێنێتەوە و تۆ فەرمانداری ئەویت." ئەمەی گوت تکای لێکردم تا بە ڕوویدا نەوەستمەوە و شوێنی پێ لەق نەکەم. "ڕۆڵە! ئارامبە! ڕقی لێ هەڵمەگرە! بۆی بسەلمێنە کە تۆ هی ئەوی؛ تۆ دوژمنی ئەو نیت! بەلگەی نیشان بدە کە تۆ دڵسۆزو پشتو پەنای دەسەڵاتەکەی ئەوی.

کوڕم! ئەگەر مل لەبەر ملی بنێی، هەردوو لاتان ناوەکانی خۆتان دەزرێنن، دوژمنانتان پێ خۆش دەبێت! لە ئەنجامدا، هەردووکتان دەسەڵات لە دەست دەدەن. ڕەنگە هۆزەکەتان لەناو ببەن و نەیهێلن!" ئەم هەموو ئامۆژگارییانەی کردم، ئینجا سەیرێکی کردمو وتی – "مەلا، دەسەڵات لەگەڵ تۆ ناگونجێ؛ زانست و دین هی تۆنە." هەناسەیێکی درێژی هەڵکێشاو فەرمووی – "جێگەی تۆ، ڕۆڵە، لە مزگەوتەو لە حوجرەی فەقێیانە.

ئـەو قەڵەمـەی تـۆ هەتـەو ئـەو شـەرعەی تـۆ دەیزانـی، گەلـەك لـە تفەنگ‌و خزمەتکارەکانی میری بەهێزترن. ئێوە هەردووکتان بـەهێزن، بـەڵام هێزەکانتـان لـە دوو ڕێگـەی جیـاوازەوەن؛ خـەڵکی لـەو دەترسـن، چـونکە خزمەتکار و داردەستی هەیەو زاڵمە؛ بەڵام پتر گوێڕایەڵی تۆن چونکە تۆ ژیر و داناو بلیمەتی و هەمیشە لایەنگری ئەوانی و خوداناسی. دەسەڵاتی ئەو فرە لە دەسەڵاتی تۆ جودایە؛ تۆ لەو بە هێزتری؛ زانا دەستی لەناو دەستی خودایە و لەو هێز وەردەگرێت و هێزەکەی عەقڵە، کوڕم!" دایکم وتی.

## گەڕان بەدوای ماڵو ژن

دوو ڕۆژان لە ماڵ لەگەڵ دایکم مامەوە و لەو دوو ڕۆژەشدا، سەردانی میریم دەکرد بێی ئەوەی باسی ئایندەی خۆمی لەگەڵدا بکەم. تەنیا وەك ئەرکێکی خزمانە بوو کە دەچوومە لای ئەو، ئەرکەکەم ڕادەپەڕاند و چیتر نەبوو. ڕۆژی سێیەمین بوو، کاتێك کە چوومە دیوەخانی میری، داوام لێی کرد تا ڕێگەم پێبدا، بچم بە دووای شوێنێکدا بگەڕێم کە لێیدا ببمە مەلاو باگم کرد.

"میر محمد! تکا دەکەم ڕێم پێبدەن تا بچم لە لادێیێك بگەڕێم، ئەگەر وەرم بگرن مەلایەتییان بۆ بکەم." بە نیگەرانییەوە قسەکانم کرد، جا وتم – "دەڕۆم، لە زڕگوێز دوور دەکەومەوە." ئەم ڕستەی دووایيم توانجێك بوو لە میرم دا. داخ! لای ئەو نە با بوو نە باران.

"زۆر باشە! بڕۆ، بۆ خۆت، لە مەلایەتییێك بگەڕێ. چەندە لە زڕگوێز دوورتر بیت، هێندە باشترە؛ بەڵام جێی خۆتم پێبڵێ." ئینجا هەڵوەستەیێکی کرد، پاشان بۆی ڕوونکردمەوە کە چاوەڕێ دەکات تا خۆم ئامادە دەکەم، "پێش لە زڕگوێز دەرچی، ئاگادارم بکەوە." وەك فەرمانێك قسەکانی خۆی کردو ئینجا وتی – "دڵنیا بووم لەوەی کە تۆ پیاوێکی ژیری و لە قسان تێدەگەی." ئەمەی ووت و خۆی لێك کێشایەوە و بە فیزەوە وتی – "ئومێد دەکەم خودا موەفەقت بکات، بەختت باش بێت، مەلا! لە بیر نەکەی، من

هەمیشە بۆ هاریکاریت لێرەوە ئامادەم." ئەم قسانەی بۆ یێکەم جار کردو وەبیری هێنامەوە کە هەر لەمنداڵییەوە و دووای مردنی باوکم، من لە زرگوێز هیچ ماڵێکی هەمیشەی خۆمم نەبووە، "خۆت دەزانی کە تۆ هەرگیز نە لە شوێنێك نە لە لادێیێك بەردەوام نیشتەجێ نەبووی؛ ماڵی ئەوانەی وەکوو تۆ یان مەدرسەی فەقێیان بووە یانیش ئەوێشیان وەدەست نەکەوتووە و لە مزگەوتان ژیاون." ئەم قسانەی لە خەنجەر تیژتر بوونو بەر لە گۆشت، دڵیان پارچە دەکردم.

"ڕاستە!" وەڵامیم داوەو هەستم کرد دەبێت تێبگەیەنم چ هەستێکم لەبەرانەبەر ئەو قسانەیدا هەبوو، جا وتم – "بەڵام، محمد، خۆ ئەگەر من قوتابخانە و مزگەتەکانم نەکردبایە ماڵی خۆم، دەبوو تا دەمرم هەر لێرە بمێنمەوە و بەسەرشۆڕی خزمەتی تۆ بکەم؛ چونکە پێ ناچێت لە بیرت بێت کە تۆ بەردەستەی باوکی من بووی." زۆر بە ڕژدی ئەم قسانەم کرد تا تیبگات لێی بێ منەتم و بچمە هەر گوندێك خەڵکەکەی دەرگام بۆ دەکەنەوە و مەلایەتیم ساز و ئامادەیە؛ ئینجا وتم – "ئەمێستاکەش خەڵکی موسوڵمان زۆرن کە ئامادەن خزمەتی منو دایکم بکەن؛ لە بیر مەکە کە منوەك تۆ نیمە؛ من زانامە و ڕێی ڕاستیان نیشان دەدەم و لە خراپە دووریان دەکەمەوە. خەڵکی ئەو لادێیانە بۆ ئەوە ڕیزم لێدەگرن، چونکە لە ڕاستی بابەتەکە دەگەن و دەزانن من هەر چاکەم بۆیان نەك لەبەرئەوە خزمەتم دەکەن چونکە دار و دەستەم هەیەو چاویان لێ زەق دەکەمەوە و ئازاریان دەدەم.

میر محمد، خوا لە ئایەتی ١١٢ لە سورەتی هود، فەرمانت پێدەکاتو دەڵێت – فَٱسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ. ڕاست بە وەك چۆن فەرمانت پێکراوە." ئەم قسانەم کردو دەرچوومە دەرەوە بێ ئەوەی خودا حافیزی لێبکەم، چوومەوە

لای دایکم تا بەر لە دەرچوونم خاترخاستنی لێبکەمو دەستەکانی ماچ بکەم. کە چوومەوە، بینیم سارا خان لەلای دایکم بوو. یارمەتی دەدا تا ناوماڵەکەی بۆ پاك بکاتەوە و کارەکەرەکەیشی خەریکی کۆڵکردن بوو، بەرگی خۆم و دایکمی دەشووشت.

"پووریێ!" سارا بانگی کرد – "پووریێ، مامۆستا هاتەوە." ئەمەی ووت، ئینجا ڕووی خۆی لەمن کردو وتی – "ئامۆزا، بەخێر بێیتەوە. ئامۆژنم ها لە ژوورەوەیە، زۆری پێناچێ دیتە لامان؛ تۆ دانیشە!" سارا قسەی دەکردو لەگەڵ قسەکانیدا، شێوانێکی پێوە دیار بوو، نەمزانی هۆیەکەی چیبوو!

"بەگزادە، تۆ چۆنی؟" لە سارام پرسیار کرد.

"تا تۆ شادمان بیت، من هەر باش دەبم." سارا وەڵامی دامەوە.

"سارا، بەڕاستی من هیچ شادمان نیمە!" وەڵامیم داوە.

"بۆ چی؟ چی بووە؟ باوکمت بینی؟" سارا پرسی.

"بەڵێ." ئەمەم ووت، ئیتر قسەم لە لا نەما تا بیکەم.

"پێم بێژە، ئامۆزا، چ لە نێوانتان ڕوویدا؟" سارا پرسی.

"میر محمد نایەوێت من لە زرگوێز بژیم!" ئەمەم ووت، ئیتر بۆ سارا خان ڕووداوەکانم ڕاڤە کردو بۆیم گێڕاوە، هەر چی لە نێوانی منو میری باوکی ڕوویدا هەموویم بۆ تەتڵەکردو وتم – "وا خۆم ساز دەدەم تا ئێرە جێ بێڵم و بچم لە گوندێك بگەڕێم کە مەلای لێنەبێتو فایل بن مەلا ڕابگرن!" زۆر بە دلگرانییەوە قسەکانم بۆ سارا کرد. کە سارا گوێی لە قسەکانم بوو، باوەڕی بە گوێی خۆی نەکردو یێکسەر دانیشت؛ چاوەکانی تژی ڕۆندك بوون. دڵۆپەکانی فرمێسکەکەی وەك مرواری بوون، ڕووناکییان

تێدا دەتروسکایەوە. هەردووك چاوەکانی بەهەردووك لەپی داخست. ماتو بێدەنگ داما!

دایکم تەماشای لای ئێمەی کرد، دیتی سارا وا خەریکە دەگری، هاتە پێشەوە و بەسەر سڕمانێکەوە پرسی– "هەی! ئەمە بۆ ئاوا دانیشتووە؟ بۆ چاوەکانی داپۆشیوە؟ بۆ گریاندووتە، کوڕم؟ چۆن دڵت هات و چۆن چاوت بەرایی دا، بیگریێنیت؟" ئەم پرسیارانەی کردو بە سارای ووت – "سارا! کیژم! بڵێ! مەلا محمد چی پێ وتی؟ بۆ ئاوا دنیای لێت تاریك کردووە؟" ئیتر هەناسەیێکی هەڵکێشا و چاوەڕێی وەڵامی سارای دەکرد تا قسەی بۆ بکات، جا ئەویش وتی:

"پووری! باوکم نایەوێ مەلا محمد لەم دێیە بمێنێتەوە و مەلایەتی بکات!" ئەم قسانەی کرد ئینجا دەستی لە چاوی کردەوە و بە ساردی سەیری منی کردو سەرلەبەری بابەتەکەی بۆ دایکم گێڕاوە؛ وتی – "پووری، تۆو خوا، مەهێڵە بڕوا، من قسە لەگەڵ باوکم دەکەم." سارا بە شێوەیێك لە دایکم پاڕاوە ئاگر لە هەناوی دەردچوو! ئینجا منیش ناچار بووم بڵێم –

"سارا! چارم ناچارە! پێویستە بڕۆم؛ چونکە پەیمانم بە میری باوکت داوە. دەبێ ڕیز لەو پەیمانەم بگرم." ئەمەم ووت و ئیتر بابەتەکەم بۆ سارام ڕوون کردەوە کە خۆی دەتوانێت بابەتەکە لەگەڵ باوکیدا تاوتوێ بکاتو تامی زاری لێ وەرگرێت و جەختم کردەوە کە – "هەرکاتێکیش تۆ ووشەیێکی باشت لە دەمی باوکت وەرگرت، ئەو کات من ئامادەم بگەڕێمەوە و بە قەدەر موویێك لە فەرمانەکانی ئەو لانەدەم، ئەگەر دژی شەریعەتی ئیسلام نەبن." بەم قسانەم بابەتەکەم بنبڕ کردو بۆ هەردووکیانم شی کردەوە، ئەنجا وتم – "ئێستاکە، دەبێ ئەو پەیمانەم بە جێ بگەیێنم کە بە میرم دابوو."

سارا هەندەی دایکم دڵتەنگ بوو. لەگەڵ هەندێشدا، یارمەتی دایکمی دا؛ کەوا و سەڵتە و فەقییانە و مەندیلەکەی بۆم خستە ناو پڕێسکەیەك و گرێیەکی توندیشی لێدا؛ نەکا لە ڕێگا بکرێتەوە و پۆشاکەکانم پیس ببن. هەردووکیان بوخچەکەیان بۆ ڕێك دەخستم و دەگریان. کوڵمە سوورەکانی دایکم زەرد هەڵگەڕابوون؛ پێدەچوو ئەم یەك دوو ڕۆژەی ڕابردن پەنجا ساڵ گەورەتر بووبێت! تەمەنی سەد ساڵ بێت! جا هێندەی نەمابوو لە ناخڕا ئاگرم تێبەربێت! بەڵام بە ناچاری دەستم لەملی دایکم کردو ویستم دڵی هێور بکەمەوەو وتم:

"دایە گیان! تۆ ئافرەتێکی خودان ئەزموونی؛ لەهەمووومان باشتر دەزانی کە ژیان دەریایێکی شەپۆلاوییە! ژیان ڕووبارێکی لێژی تیژڕۆیە! ئەوەی بیەوێ لەم ڕووبار و دەریایەدا دەربچێت، نابێ لەوە بترسێت ڕووت بێتەوە؛ دەبێ مل لە تاوی ئاوەکە بدات لە شەپۆلەکان دەربازی ببێت. ژیان ئەو دەریا و ئەم ڕووبارەیە، منیش خۆم بە مەلەزان دەزانم؛ سەردەکەوم ئینجا دەگەڕێمەوە؛ زڕگوێزماڵی باوکم بوو! زەردەخەنە و ناڵەی دایکم بوو! لە ئایندەشدا دەبێت هەر بۆ من بێتەوە." ئەم هەموو قسانەم بۆ دایکم کرد، ئینجا سەیری سارام کردو وتم – "سارا گیان! من هەمیشە سەیری ئاییندە دەکەم؛ چاوەڕێمە باوکت بە هەڵوێستی خۆیدا بچێتەوە و تێبگا کە کەس بۆ ئەو لەمن نزیکتر و دڵسۆزتر نییە و نابێت! هەر دەبێ ئەو ڕۆژە بێت کە بە خۆی بێت دەستی مەلا بگرێت و قایل بێت سارا لە مەلا محمد مارە بکات."

بەم قسانەم دڵی سارام خۆش کردو دڵی خۆیشم دایەوە و ئەویش دەستەکانی لەسەر ڕوخساری لادا و وەك ئاسمانی بەیانی کازیوەی دا و زەردەخەنەیێکی خۆش بەسەر لێوەکانییەوە نەقش بوو و گوتی:

"ئـامۆزا گیـــان!" لیکـی خـۆی قـووت داوە – "خـوا بکـات ئـەم تاکـە ئومێـدەم بـە دی بێـت!" جـا هەسـتم کـرد، خەریکـە دڵـی لـەناو سـێنەی دەردەپەڕێ!

منیش بوخچەکەم هەڵگرت، داهاتمەوە دەستی دایکمم ماچ کردو وتم:

"دایە، توخوا دڵی خۆت تەنگ مەکە و ئەرکی تۆ تەنیا ئـەوە بێـت کـە نزام بۆ بکەیتو لە خودا بپاڕێوە مانـدوو بوونەکـەم بـە فـیڕۆ نـەڕوا." ئینجا سەیرێکی ناو چاوی سارام کـرد؛ چاوەکانی وەك کـانی ئـاوی خۆشەویستییان لێ دەواری، تەمام بوو قسەکەم تەواو بکەم کە دایکم هاتە ناو و منیش ناچـار بێ دەنگ بووم تا بزانم ئەو ئافرەتە چ دەڵێ، ئـەمیش تەماشـای سـارای کـردو وتی:

"من دەزانم محمد لەبەر تۆ، زوو دەگەڕێتەوە؛ زوو دێتەوە، سارا کچـم، دڵی خۆت تـەنـگ مەکە؛ مەلا زوو دەگەڕێتەوە." دایکـم ئـەو قسانەی کـرد کـە من نەمزانی بیکەم. بە پەلە تاویدا بوخچـەکەو لـە دەسـتی وەرگـرتمو بـەرەو دەرگا چوو و پرسیاری لێ کردمو وتی:

" دەڵێی بە تەما نی بڕۆی؟"

"بـەڵێ، دایـە، دەڕۆم، ناچـارم بـڕۆم!" وەڵـامی دایکـم دایـەوەو بـەرەو دەرگای دەرەوە ڕۆیشتم.

تەماشام کرد دایکم توانـای ئـەوەی نـەما هەسـتێتە سـەر پێیـان تـاکوو بـەڕێم بکـات. سـارا بـە خێرایـی گەیشـتە دایکـم بـن هـەنگڵی گـرت و بـەرزی کردەوە و لە باوەشی گرت. لەگەڵ ئەمەشدا دایکم جامە ئاوێکی ڕوون و پـاکی بەدەستەوە بوو، نکوولی کـردو رادەسـتی سـارای نـەکرد. هەرکـە لـە دەروازەی ماڵی خۆمان دەرباز بوومو گەیشتمە سەر ڕێگا، بینـیم دایکـم جامـە ئاوەکـەی لە دوای مندا پرژاند و ئەو ناوەی تەڕ کردو نزای بۆ کردمو وتی:

" بەختت یار بێت؛ ڕێگاکەشت وەك ئەم ئاوە ڕوون بێت؛ خودات لەگەڵ، ڕۆڵە......!" زمانی دایکانەی گیرا و ئیتر قورگی ڕێی نەدا قسەی تر بکات؛ منیش بۆی دەرچووم، بەڵام هەستم زۆر سەیر بوو، زۆر تەنیا بووم، نە دڵم بەگەڵم کەوت نە هەستم هاورێم بوو و نە هۆشم لەو ڕێیە ڕێبەرم بوو.

ماڵەوەم جێهێشت؛ لە زڕگوێزی شوێنی منداڵیم دوور کەوتمەوە؛ هەستێکی سەیرە کە بە ناچاری هەواری خۆت بەجێ بهێڵیت! ڕووناکی و تاریکی تێکەڵ بوون! شار وەدەر کرام! ئومێدم هەبوو لە گوندێکی هاوسنووری زڕگوێز لەنگەر بگرم و بحەوێمەوە و بحەسێمەوە. ئەو لادێیەی نزیك گوندەکەی خۆمان مەلایان نەبوو. لەگەڵ ئێستای مندا دەگونجا. چووم بۆ دیوەخانی گوندەکە و جوامێرەکانیانم دیت؛ هەموو جافگەل بوون، نامۆیان تێدا نەبوو. وەك نەریتێك ویستم خۆیان پێبناسێنم، بەڵام هەندێکیان گوتیان ئێمە دەتناسین؛ ئەوانی دیکەش گوتیان کە ناوبانگیان بیستبووم. زۆریان هاوتەمەن و دۆستی باوکم بوون. پێمگوتن هاتوومە لە مەلایەتی دەگەڕێم.

کە ئەمەیان بیست، هەر زۆر لەلایانەوە خۆشبوو؛ بە ئاسانی لەگەڵ من ڕێککەوتن، بەو پێیە دەبوو من لە مزگەوتی گوندەکە هەموو ڕۆژێك و لەهەر پێنج فەرزەکەدا پێشنوێژیان بۆ بکەم؛ ئێوارەکانی پێنج شەممە و هەینی وەعز و ئامۆژگاری ئەو خەڵکە بکەم کە ئامادە دەبن، جا با یێك تاکە کەسیش بێت، دەبێ ئەرکی خۆم ڕاپەڕێنم. ڕۆژانی هەینیش پێویستە خوتبەیان بۆ بدەم. لەبەرانبەردا، گەورەپیاوانی دێیەکە دەبێ ژیانی من فەراهەم بکەن و زەکات سەرفیترەی ڕەمەزان بە تەنیا بە من بدەنو هیچ گوندنشینێکیش نابێت زەکات و سەرفیترە ژێراوژێر بە کەسی لاچەپ و نامۆ

بدات. هەر خێرێکیش هەبێت نابێ بێ قایلمەندی من بدرێتە کەسانی دەرەوەی ئەم لادێیە. خودا چاکی هێنا و سوپاسی خودا و خەڵکی دێیەکەم کردو وەفاداریشیانم گران قرساند.

نەریتو دۆستایەتی ناو خەڵکی ئەم ئاوایییە، هیچی لەوە هەڵنەباردبوو کە لە زرگوێز ئاشنایان بووم، ئەو نەریتو دۆستایەتییەی لەوێ هەبوو لێرەش هەمان شت دەبینم. وەرزێك لەو گوندە مامەوە. لەو ماوەیەدا دۆستایەتییەکی باشم لەگەڵ خەڵکی ئەو ئاواییيە پەیدا کرد. دڵنیا بووم کە ئەو گوندە لەگەڵ فیکر و بۆچوونی خۆم ئاشنا بوو. ڕەگێکی توندی ڕیز و دۆستایەتی و هاوخێلیم لەناو ئەو گوندنشینانەدا کوتا. خەڵکێکی فرە باش بوون، ڕیزێکی زۆر لە نیوانماندا لق و پۆپی خزمایەتی کرد. لەبەر ئەم دۆستایەتی و متمانەی نێوانمان، هەنگاوی دووەمم هاوێشت. بڕیارم دا جوامێرانی ئەم دێیە بنێرم تا خوازبێنی خاتوو سارام بۆ بکەن و بۆم بیخوازن. بەیانییێکی فرە خۆشم هەڵبژارد و بۆ سەردانی میر عەلی جاف برا گەورەی ئەم دێیە چووم. دوای بە خێر هێنانو ئەحوال پرسین، بە شەرمەوە وتم:

"میرم! دەتوانی چاکەییکم دەگەڵدا بکەی کە هەرگیز لە بنی دەرنەچم؟" قسەکەم کردو سەیری ڕوخساری میرم کرد؛ ئەویش زەردەخەنەییکی قشتی بەسەر ڕوویدا هات و دەستێکی بە سمێڵی داهێنا و وتی:

"بڵێ، مەلا! ئەوەی لەپێم بیگرێت بۆ تۆی دەڕنم." لە قسەکانی دیار بوو کە بۆ من زۆر ڕژد و دڵسۆز بوو.

"بەڵێ! بە خوا دەمەوێ سەردانێکی میر محمدی بکەم." بە نەرمی قسەکەم کردو ئاردەکەم بێشت و کەپەکەکم ڕێشت.

"جا بۆ ناچی؟" میر عەلی لێی پرسیم – "چ ڕێگرێك لە ڕێتدا هەیە. تا یارمەتیت بدەین و هەڵیگرین؟ بەڕاستی، ئێستا کاتێکی باشە بۆ دیداری ئەو پیاوە؛ لە مێژە سەردانیمان نەکردووە؛ بەڵام، مەلا، ئەو خواستەت بۆ وا کوتك و سنگی و لە ناکاوە؟ ویستت لەم سەردانییە چییە، تا بیزانین خۆمانی بۆ ساز بدەین." میر عەلی قسەی دەکردو سەیری ناو چاوانی دەکردم.

"گەرەکمە... نیوەکەی تری دینەکەم... تەواو بکەم!... دەمەوێ... ژن بێنم و حەزم لێیە خوازبێنی... سارا خانی میر محمدم بۆ بکەن." قسەکانم دەکردو لێوەکانم تەتەڵەیان دەکرد. کە میر عەلی گوێی لە قسەکانم بوو، ڕوخساری گەشاوە؛ پێی خۆش بوو.

"باشە! بە خوا کارێکی چاکە!"عەلی وتی و ئینجا بۆی ڕوون کردمەوە کە سبەی بەیانی زوو، پەیامێکی بۆ میر محمدی ڕەوان دەکات و وتی – "خەبەری پێدەدەم کە دەچین و سەردانی دەکەین و دەمانەوێ بزانین لە ماڵ دەبێت یان نا." پاش ئەم قسانەی هەڵوەستەیێکی کردو بیری کردەوە؛ پاشان سەری هەڵبڕی و وتی – "مامۆستا مەلا محمد، نامەوێ تۆ بۆ ئەم بابەتە لە گەڵماندا بیت." ئەو ئەم پێشنیازەی کردو منیش پەسندم کرد؛ چونکە من خۆم جۆرە شەرمێکم لە دڵدا هەبوو و نەمدەویست بە خۆم بۆ خوازبێنی سارا بچم؛ سوپاسیم کرد.

کە هاتمەوە ماڵەکەی خۆم، ئەو شەوە نەمتوانی بخەوم! خەیاڵ لەناو مێشکم لە خەیال غەرق دەبوو؛ دەبێ ئەم پەریزادە لەناو ماڵی خۆم و بە حەڵاڵی ببێنم؟ دەبێ ئەم ئافرەتە چۆن ژیانی خۆم دایکم بگۆڕێت؟ سارا لە دووای مردنی دایکی خۆی، تا ئێستاش بە دایکم دەڵێ - "دایە!" چەند جارێك لەبەر چاوی خۆمەوە گوتی – "وا دەزانم دایکم نەمردووە! ئەمە دایکمە!" دەبێ سارا چۆن منداڵەکانمان پەروەردە بکات؟ چۆن ئاگای لەمن

دەبێت؟ ئەو کچە میرە، لەم زەمانـەدا، خوێنـدەوارییێکی باشـی هەیـە؛ زۆر لـە خوێندنەکەی فێر بووەو خەڵکی دەوروپشتیشی درێغییان لە فێرکردنی سارا، نـەکردووە؛ دایکیشـم لـە پـەروەردە کردنـی ئـەو پـەریزادە هـەرگیز لالـووت نەبووە. هەر لە درێژەی ئەو خەیاڵانەدا بووم، فریشتەیێکی ناسکم هاتـە بـەر چاوان، وەك بەفری لووتکەی شاخەکان پۆشاکەکەی هـەمووی سـپی بـوو. لـە ئاسمانڕا بۆم دابەزی، زەردەخەنەیێکی بێهاوتای بەسەر لێوەکانیدا هات، ئەنجا لێی چوومە پێش‌و پێم ووت – "لەخۆم خەنی! تۆ شادمانیت بـۆ ماڵەکـەمان هێناوە!" لەبەرانبەر قەوارەی خەیاڵەکەم حەپەسام!

"منیش هێندەی تۆ کامـەرانم، خۆشەویسـترین ئـامۆزا!" خـەیاڵەکـەی سارا وتی:

منیش، هەر بە خەیاڵ، تـارای سـەر ڕوخساریم لادا! نیوچـەوانیم مـاچ کرد؛ ئەویش لە باوەشی گرتم! سەری لەسەر شانم دانا! چەنەگەی بە ملـەوە نووسا! منیش لاملێکی و چاوەکانیم ماچ کردو پێیم ووت:

"ئۆخەی ساراخان! ئەگـەر دەزانـی چـەند تـۆم خۆشـدەوێ!" بابەتەکـە لە خەیاڵ ترازابوو، هەستم دەکرد وا سارا لـە ئامێزمدایـە. سـەری بڵنـد کـرد، تەماشای ناو چاوانی کردم ئینجا گرژییەوە و وتی –

"من تۆم لەخۆم خۆشتر دەوێ؛ گیانەکـەم!" قسـەکانی سـیپارەی ئـەلف و بێ بوون، هاتنە بەرم. خەریك بوو لـە خۆشـیاندا بمـرم؛ دڵـم بـە زرۆکـەکی مابوو بوەستێت؛ نەوەستا؛ پتر خۆشم ویست. هەموو ئەو وشانەم لە بیر چوو کـە پێویسـتم بـوو هەسـتی ڕاسـتەقینەی خـۆم بـۆی دەربـبڕم، ناچـار هـاواری خـودام کـردو وتم – "ئـەی پـەروەردگار! ئایـا ڕێـم پێـدەدات تـا لێوەکـانی هەڵمژم؟ کۆشش دەکەم، خۆ من ترسنۆکێك نیم تا بترسـم؛ شـەرمیش ناکـەم، ئەم پەرییـە ئەڤینـداری خۆمـە و دەبێتـە حـەڵاڵی خـۆم! ئـەم سارایە دەبێتـە

هاوسـەری خـۆم؛ هاوپشـکی شـادی و ناخۆشـیم؛ سـاغی و نەسـاغیمان یێـك دەبێت؛ ئێمە هەردووکمان دەبینـە یێـك کـەس؛ نابێـت شـەرم لـە سـارا بکـەم؛ پێویسـتە لەهـەموو شـتێك یارمـەتی بـدەم. لـەو بـاوەڕەدام کـە هاوسـەرگیری هاوپشکیی ژینە؛ یان هەبە یان هەر مەبە! لەبەرە خۆمـەوە هەستابوومەوە و قسـەم لەگـەڵ خۆمـدا دەکـردو باسـی ژنو مێـردانم دەکـرد؛ چ پەیوەنـدییێك ئاوەهـا زوو بـە یێکـەوەیان دەبەسـتێتەوە؟ زاوا دەسـتگیرانەکەی نابینێـت تـا دەیگوازێتـەوە، بـەڵام هـەر بـە بـاس و خواسـەکەی شـەیدای لەنجـە و لار و شـەدەی خـوار و مەشـکە هەژانەکـەی دەبێـت؛ ئەمـە نهـێنی خودایـە، کـەس نـەبووە بزانێـت ئەمـە بـۆ ئاوایـە؟ ئـەم کـارە نهێنییەکـەی چییە! پاشـان بـە خۆمم ووت:

"سـەبارەت بـە خـۆم، هاوسـەرەکەم نابێتـە لەیستۆکی یـاری شـەوانەی ژنو مێرد؛ ئەویندارەکـەم نابێتـە ئـامێرێکی خزمـەتگوزاری سەفاسازی؛ ئـەو ژنە هەمان ئەو هەست و سۆزەی هەیە کە من هەیتم؛ وەك من، خۆشەویستی دڵـی خـۆی هەیـەو گەرەکییـەتی لـە باوەشـی ئـەو یارەیـدا، هەسـت بـە سـۆزی دڵداری بکات؛ ژن، پیاو ئاسا، دڵدارە و ڕقداریشـە؛ گـەورە دەبێـتو دەشمرێت. وەك خـۆم وایـە. ئـای خـودا هـاوار! ئـەو شـیلەیەی سـەر لێـوانی؛ لەهـەموو جۆرەکـانی شـیلەی ئـەم دنیایـە شـیرینترە؛ بـە دڵـی مـن، هـەنگوێنیش وەك تـەڕاتی لیکی یارەکـەم شـیرین نییـە! دەشـێت، لـە باوەشـی بکـەم؟ تـا ئیسـتا هەرگیز دەستم بە جەستەی سپی و لووسی سارا نەکەوتووە! ئامێزی مـن هـی ئەوە و باوەشی ساراش هـی خۆمـە. سـارا پادشـای دڵـی سووتاوی خۆمـە؛ سارا هەموو هەستی سووتاندوومە." لەپاش ئەم هەموو خەیاڵە پڵاوانـەدا، هەسـتم کـــردوا خەریکـــە لـــە نـــاخ جـــوانی ســـارادا دەتوێمـــەوە و پـــێم نـــەکرا زیندەخەونەکانم پەلبەست بکـەم تـا ئـەو دەمـەی گوێم لـە قاڕەقاڕی ئاژەڵان

بوو؛ ئینجا زانیم کە شەو زۆر بە شێنەیی و لەسەرەخۆ گوزەریوە و منیش هێشتاکە خەیاڵە پڵاوی فرەم مابوو!

ئەم بەیانییە وەك گزنگی ڕۆژانی پێشتر نەبوو؛ پاشان تێی گەیشتم کە ئەو بەهەشتەی ئەمشەو تێیدا ژیام، هەمووی بەهەشتی ئەندێشەسازی خۆم بوون! خەونی کەسێکی شەیدا بوو کە هێشتا لە گۆمی خەیاڵ دەرباز نەببوو. نەمتوانی دووبارە چاوەکانم بنووقێنمەوە، جا لە بن پێخەفەکەم دەرچووم، دەستنوێژم شووشت و بەرەو دیوەخانی عەلی بەگ چووم؛ ئەویش لەگەڵ دار و دەستەکەی خەریکبوون؛ چایە و قاوەیان سازدەدا؛ کە میر چاوی پێمکەوت، پێکەنی و وتی:

"مەلا محمد! ئەمشەو من لەبری تۆ نەنووستوومە؛ دەبێ تۆ حاڵت چۆن بووبێت؟" ئینجا سەیری کردم، بینیم بە توانجەوە سەیرم دەکات، پاشان هاتەوە قسە – "بەیانی بۆ نوێژ نەهاتی! دەڵێی ئەمشەو وەك خۆمئاسا، نەخەوتووی؟" ئیتر ڕاوەستاو چاوەڕێی وەڵامی منی دەکرد؛ ناچار بووم بڵێم:

"نازانم نووستم یان هەموو شەو بە ئاگا بووم! ئاگام لە کاتی بانگی سبەینان نەبووە! لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ اِلاّ بِاللّٰهِ! پاشا، لە حەیاتم هەرگیز شەوی وەك ئەمشەو درێژم نەدیتووە!" ئەمەم ووت و تەکانم بە خۆم دا تا لە شەرم دەربچم، ئینجا وتم – "میر عەلی، کەی دەچنە لای میری گەورە؟" ئەم پرسیارەم کردو نیازی خۆمم ئاشکرا کردو وتم – "ئاخر دەمەوێ ئەمڕۆ میر محمد ببینن نەك دووای بخەن بۆ ڕۆژانی دێن." قسەکەم تەواو بوو، نەبوو بینیم میر عەلی پێدەکەنێت؛ زانیم دەستێ لەناو ئاگر بێتوەك دەستی ناو ئاو نییە! جا وتی:

"مـیر محمـد، کـورد قسـەیێکی زۆر جوانیـان هەیـەو دەڵـێن — 'نانمـان لەسـەر ساج نەسـووتاوە!' منـیش هـیچ پەلـەم نییـە. تـا وەڵـامی مـیر محمـد وەرنەگرمـەوە، ناچـم." ئـیتر بێـدەنگ مـا. بـەڵام کـە زانـی مـن زۆر نیگـەرانم هەڵوێستی خۆی گۆڕی و وتی — "لە کاتی خۆیدا دەچم، دلگران مەبە، مـەلا!" میر دڵی دامەوە، منیش هەناسەم وەبەر هاتەوەو بە ڕاڕاییەوە وتم:

"بە دڵی خۆتان بکەن؛ چۆن دەزانن باشە وا بکەن." هەر ئەو هەنـدەم ووت و لە تەنیشت میر عەلی دانیشتم، ئەویش دڵنیا بوو کە چەندە داهێـزراو و دڵشکاو و پەستم. جا وتی:

"چیت لە خەیاڵدایە؟ ئایا ئێمە نامانەوێ تۆ شازادە بێنی و ژیانت لەم لادێیـەی ئێمـەدا ڕێکخـەی؟ دەبـێ نەمانـەوێت تـۆ بـە شـادمانی، لێـرەدا بـژی؟ مامۆستا! گوێت لەمن بێـتو ئـەم قسانەی کـە بۆتـۆ دەیانکـەم وەك گـوارە لـە گوێتیـان بکـە و لـە بـیرت بـن - ئێمـە پـڕ بـە دڵ پێمـان خۆشـە ئـەم کچـە بـە نسیبی تـۆ بێـت؛ ئـەمڕۆ نـەك سـبەی و پاشـتر، چونکە چـەند دووا بکـەوێت هێندە باجی پتری دەبێت." دڵم بە قسەکانی میر عەلی ئـاوی خـواردەوە. جـا، پێکەنیم و دڵنیا بووم کە میر خەمی ئێمەی لەبەردابوو و لە خۆشیاندا وتم:

"میر عەلی، ئێـوە بەڕاسـتی شـایانی ئـەوەن کـە هـەر مـیر بـن؛ چـونکە بایەخ بە گرفتەکانی هاوهۆزەکەتان دەدەن. خودا پاداشتتان بداتەوە." هێنـدە بە پەرۆشەوە قسەکانم دەکرد کە هاومەجلیسـەکانی مـیر علـی تێبـینی منیـان کرد. هەموو قاوەی بەیانیانمان وێکڕا خواردەوە، ئینجا مـیر عـەلی لـە هیکـڕا پێی وتم:

"دڵـی خـۆت سـوار مەکـە! هـەموو خـەرجی ژن گواسـتنەوەکەت لـە ئەستۆی خۆم دەبێت."

"گەلەك سوپاس، میر عەلی! خودا پاداشتت بداتەوە." وەڵامیم داوە.

دانـی ئێـواره بـوو؛ دیوەخانەکـە جمـەی لێوەدەهـات؛ جـێ بـە بـەر جێـداری نەدەکەوت! لە هیکرا، کابرایێك وە ژووری کەوت! لـە مـیر عـەلی چووە پـێش، منگـەمنگێکی لـە بنگـوێی مـیری کـرد. خەڵکەکـە هـەموویان ووشـت بـوون! دەیانویست بزانن چ بووە! چ قـەوماوە! پاش قسـەکانی کابرا لـەناو خەڵکەکـە دانیشت. میر عەلی دەنگی خۆی بڵند کوردو میوانەکەی وەخێـر هێنـا؛ ئینجا ڕووی لە گەڕەلاوژەی خەڵکەکە کردو وتـی – "کوڕینـە! حاخـام ئیسهاق، کـاك هۆمـەر، عـوزێر، حـاجی قـادر، کوێخـا زرار، هـەمووتان گوێتـان لێبێـت!" مـیر بەناو ئەو کەسانەی بانگ کرد، ئینجا قسەی خۆی تەواو کردو وتـی – "دەبـێ بچین بۆ زڕگوێز! پێمخۆشە، لەم سەفەرە، ئێوە هەموو لەگەڵمدا بێن." ئینجا جێی خۆی خۆشتر کردو ڕووی خۆی لەو کەسانە کـرد کـە نـاوی هێنـا بـوون و وتی – "بڕۆنـەوە بـۆ مـاڵ و خۆتـان سازدەن بـۆ سـبەی سـەر لـە بـەیانی زوو بچـین سـەردانێکی مـیر محمـدی جـاف بکـەین و خزمـانی زرغـوێزیش بەسـەر بکەینەوە. سبەی سەر لە زوو وەرنـەوە ئێـرە." مـیر علـی ئـەم قسانەی کـرد، هەستا و ڕۆیشت.

لەناو دیوەخـانێ غەڵبـە غـەڵب پەیـدا بـوو! هـەر کەسـە پـەلاری خـۆی هاوێشـت؛ یـەکێك وتـی – "ئـەوە بـۆیێ مـالی لەگـەڵ خۆیـدا دەبـات، چـونکە دەیەوێ ئەو ناکۆکییە ببڕێتەوە کە لەسەر پارچە زەوی لای جۆگـەی خـوارەوە پەیدایە! ئاخر بۆ ئەمە مالم دەبات!"

کەسـێکی تـر لـەولاوە هەڵێدایـە و وتـی – "نەخـێر! مـیر دەیـەوێ خزمایەتییەکـەی لەگـەڵ مـیر محمـدی نـوێ بکاتـەوە. مـیر عـەلی لەمێـژە سەردانی زڕگوێزی نەکردووەو ئەو سەردانییە پێویستە بکرێت!"

کابراییێکی تر خۆی تێهەڵقوتا و وتی – "نەتانزانی! ئیسهاقی مالم بۆیێ دەبات تا کێشەی زەوی چارە بکات، مالم قسەی لەلای هەردووکیان دەڕوا."

یەکێکی دیکە پرسی – "ئەی بۆ ناپرسن، لەسەر چی مامۆستا لەگەڵ خۆیدا نابات؟" هەموو مات بوون؛ نەیانزانی – " ئەوە نهێنییەکەیە!" کابرا دەردی دڵی بەم قسەیە دەربڕی و زمان لە دەمیدا نەما.

"وا چاکە دەست بۆ ئەو بابەتانە نەبەن؛ ئاخر ئەم سەفەرەیان هیچ پەیوەندی پێتانەوە نییە، ماڵتان نەڕمێ! ئەم هەموو بێنەو بەردەیەی ناوێت! کورد یێژن – ئەوەی ئەمڕۆ نهێنە، سبەی لەناو دەستێنە. دڵتان فرەوان بکەن و دەمتان داخەن و ئارام بن." پیرەمێردێك بە توندی ئەو قسانەی کردو هەمووی بێدەنگ کردن.

هەر ئەو پێنج جوامێرانەی میر علی دەستنیشانی کردن ڕۆژی پاشتر زوو هاتنەوە و لە دیوەخانێدا ئامادە بوون. هەموویان ساز و سوڵتان بوون. عوزێر لە پێشدا هاتەوە. هۆمەر لەپاشی ئەو گەیشتە دیوەخانەکە؛ ڕانك و چۆغەیێکی جوانی دەستکردی لەبەردا بوو. فەقییانەکەی لەهەردووك باسکی خۆی لوول دابوون. پێشتر ئەو پیاوەم بەم جۆرە پۆشاك و بەو خاوێنییەم نەدیتبوو! ڕەنگە ئەو پۆشاکەی لە کەسێکی هاوگوندەکە وەرگرتبێت! بەڵام خۆ ئەمە هیچ گرینگییەکی نییە، ئەگەر هی خۆی بێت یان لە کەسێکی تری خواستبێت! ئامانج لە بابەتەکە گرینگترە!

کوێخا زرار بە سواری گوێ درێژەکەیان ئامادە بوو. خەنجەرێکی دەبانی لەبەر پشتێنەکەی نابوو. کڵاوە بەدەست چندراوەکەی وێنەی قشتی باڵندەی لە دەوریدا کرابوو، زۆر نوێو جوان بوو؛ زرار جەمانەی لەسەر نەبوو؛ ڕەنگە هەر لەبەر هەندێ بووبێت تا کڵافە تازەکەی کوێخا بە

هەمووان نیشان بدات! وێنەی باڵندەکان هیچ یێکێکیان وەك ئەوی دیکەیان نەبوو! کوێخا زرار ڕاوەستاو وتی:

"کوڕینە! هەر ئێستاکە ئەم کڵاوە نوێیەم لەناو ئەو جل و بەرگانەدا دۆزییەوە کە لە باوکمەوە بۆم ماوەتەوە. کە باوکم مرد، هەموویانم لەناو جاغێك هەلگرت و ئێستا چووم دەرم هێنان و ئەوانەم لەناویاندا دۆزییەوە؛ ڕەحمەت لە مردووەکانتان بێت، فاتیحەیێکی بۆ هەدییە بکەن." هەموو ناو لەپی خۆیان بەرەو ئاسمان هەڵبڕی و دەستییان بە فاتیحە خوێندن کرد. یێك لە ئامادەبووەکان پێکەنی، ئینجا فاتیحەکەی بۆ قەبرەکە نارد؛ بەڵام کەس هیچی پێی نەووت و لە هۆی پێکەنینەکەی نەپرسی. کوێخا زرار تەسبیحێکی مۆروو گەلەك گەورەی لە دەسکی خەنجەرەکەی ئاڵاندبوو؛ تا خۆی پێ بنوێنێت، بەڵام وا نەبوو، دیمەکە فرە ئالۆز بوو. ڕەنگە مۆرووەکانی تەسبیحەکە تەنیا بۆ ئەوە باش بووبن کە درزێکی دەسکی خەنجەرەکەی زراریان شاردبووەوە!

حاجی قادر هاتەوە، کەشیدەیێکی زردی تازەی لەسەر کردبوو و پشتێنێکی هێشتا لەو زەردتری لە پشتی خۆی ئاڵاندبوو؛ بە هەمووانی دەووت ئەمە حاجییە و سەردانی مەککە و مەدینەی پیرۆزی کردووەو کابرایێکی دیندارە. زۆربەی خەڵکی ئەم لادێ و دەڤەرانەی ئێمە لەبەر هەژاری ناتوانن سەفەری حەج بکەن و تا دەمرن بەم مەرەقەوە دەمێننەوە. چوونە حەج مەرجی زۆری هەیە، وەك ئەوە نییە هەر بە هەوەس و بۆ کەیف و دیدار بچییە ئەوێ. ئەگەر دراوسێکەت برسی بێت یان قەردار بێت، حەجت دروست نابێت. پێویستە پێش چوونت بۆ حەج ئەو دراوسێیەت تێر بکەی و لە بن قەرد دەریبێنی، ئینجا بۆ ئەم حەجە بچێت. لەسەر ئەم مەرجانە من ڕایێکم هەیە کە هیچ کوردێك، ڕەنگە حەجی پەسند نەبێت،

چونکە دراوسێی برسییە؛ بۆ ماوەی ساڵێك تێری نەکردووە، ئینجا بۆ حەجەکە چوو بێت.

کە ئیسهاقی مالم، لە دووای هەموویاندا، گەڕاوە، یارمولکەیێکی گەورەی لەسەرینابوو، تەیلەسانێکی فرە بەرین و فرەوانیشی بە شانی خۆی دادابوو؛ دیار بوو کە هی خۆی نەبوو! مالم دوواییتی ئەو کەسانە بوو کە میر لێی خواستن تا لە گەڵیدا سەفەر بکەن. ئەمەیان جاری یێکەم بوو کە زەینی خۆمم دایێ ە بینیم، ڕیشی مالەکە بە تەواوەتی دەتگوت پەمۆی سپییە! پێش ئەم ئەرکەی کە میر عەلی پێی ڕاسپارد، ئەو پیاوە هەرگیز کەس بەم پۆشاکە ڕەشە نەیدیتووە! ڕێك بوو؛ هەر سەیریت بکردایە، خۆشت دەویست. ئایا ئەمە بە هۆی ئەوەوە بوو کە بۆ یارمەتی و پشتیوانیم سەر مەیدانی گرتبوو؟ نەخێر! چونکە ئەو پیرە مالە هەمیشە بەوەوە ناوی پەیدا کردبوو کە یارمەتی خەڵکی دەداو بێ پاداشت بۆیان ڕادەوەستا. ئەمجارەشیان دەچوو تۆمارێکی باشتر بۆ من بکات؛ دەچوو سارام بۆ بخوازێت!

هەموو ئەو خەڵکە لە پێش میر عەلیدا دەرکەوتن. ئەویش کە هاتەوە، ڕووی لە کوێخا زرار کردو پرسی – "دەڵێی بۆ شەڕ دەچیت؟"

هەموو بەقسەی میر حەپەسان! ئیسهاقی مالیش وتی – "ئەی جەنابت نەتگوت کە بۆ ئەوە دەچین تا کارێکی ڕەوا ڕاپبەڕێنین؟" مالم قسەکانی بە خێرایی تەواو کردو لیکاوی خۆی قووت داوە نەکا میر عەلی لەبەر چاوی ئەوانی تردا، قسەیێکی پێ بڵێت. بەڵام پێش ئەوەی میر دەمی بکاتەوە، کوێخا زرار وتی – "من بۆ پاراستنی خۆمان ئەم خەنجەرەم هەلگرتووە!" ئینجا هەڵوەستەیێکی کرد تا بزانێت میر چ دەڵێ، کە میر قسەی نەکرد، هەر خۆی وتی – "تۆ چت پێدەکرێت، ئەگەر ڕێگر لە ڕێ، پەلاماریان داین؟ چەك هەلگرە، خراپەت لێ دوور دەبێتەوە!"

"دەی! بڵێ بزانم تۆ بۆت دەکرێت زۆرانبازی دەگەڵ دزاندا بکەیت؟" مالم بە زەردەخەنەیێکەوە وتی — "میر! ئەی چیت دەگوت ئەگەر لەبری ئەم خەنجەرە، قەمەیێك یان شمشێرێکی بە تەکییەوە بایە؟"

میر عەلی دەودەوانەکەی ڕاگرت؛ وەڵامی هیچیانی نەداوە، پاشتر، هەر بۆ پێکەنین، وتی — "ئێستا دڵنیاین کە ڕێگر پەلامارمان نادەن!" ئیتر هەموویان دایانە قاقای پێکەنین، ئینجا میر پرسی — "هەموو ساز و ئامادەن تا، پەنا بە خوا هیممەت بکەین و بڕۆین؟ من هێشتا ئامادە نیم؛ چاوەڕێ بن، توخوا!" ئیتر بزر بوو.

"کەی ئەمە حاڵە، عەلۆ! دەبێت سەرقافڵە پێش هەمووان ئامادە و تەیار بێت." ئیسهاقی مالم ئەمەی ووت، بەڵام میر عەلی گوێی لەم قسانەی دوایی مالمەکە نەبوو. ڕۆییبوو! کە میر عەلی بزر بوو، ئیتر هەمووان دەستیان بە منگەمنگ کرد. کەسیان نەوێرا کە زاتی ئەوە بکات و وەك مالمەکە دەنگی خۆی هەڵبڕێت. لەناو جافاندا، کەس زاتی ئەوەی نەکردووە دەنگ بەسەر میردا هەڵبڕێت، ئەم دەسەڵاتە ئەوپەڕ بوو و هەموو کەسێك نەیبوو! مالم لەبەرئەوە توانی دەنگی هەڵبڕی چونکە خۆی جێی ڕیزی هەمووان بوو؛ پیاوێکی خوێندەواری هەردەم ئامادە بوو تا خزمەتی خەڵکی بکات. سەرکردەی ئایینی دەبوو ئاوا بێت، خزمەت بکات، ئینجا دەنگ هەڵبڕێت، نەك هەر دەنگی هەبێت و ڕەنگی بزرکا بێت.

زۆری نەبرد کە میر عەلی هاتەوە. سواری ئەسپێکی ڕەسەن ببوو. ئەسپەکە زینێکی دەستکردی نوێی لەسەر پشتی بوو؛ بە دڵوداو نیگاری لەسەر کرابوو کە سەربردەی پاڵەوانییەتی باوکی میر عەلییان دەگێڕاوە، تا لە بیر نەچن. میر کەوانێکی لە پێش خۆی دانابوو. تیرەکانیشی بە ملی خۆیەوە کردبوو کە لەناو هەگبەیێك ئاخنرابوون.

"میرزا عەلی!" کابرایێك بانگی میری کرد.

"چییە؟" ئەویش وەڵامی داوە.

هەگبەی تیرەکان بە تەنگەی ئەسپەکەوە بکە؛ بۆ تۆ گرانن و شانت خوار دەکەنەوە." کابرایەکە داوای لە میر عەلی کردو ئەویش بەقسەی کابرای کردو سوارەکان ڕۆیشتن؛ بەڵام ئیسهاقی مالم دەوی هەر ڕانەوەستا و وتی — "ئەوەیە کورد! هەر دەتوانی بۆ گەورەکان پان بکاتەوە و ناوێری قسەیێکیان پێبڵێت، ئەگەر راستو لەبەرژەوەندی هەمووواندا بێت."

## بەس چاوەڕێیە

جوامێرەکان ڕۆیشتن؛ لەگەڵ هەر هەنگاوێکی ئەسپەکان دەیانهاوێشت دڵم لێی دەدا. داخەکەم! من لە گەڵیاندا نیم! بەڵام سەیرە! خۆ من لەناو کاروانەکەدا نیم، ئەی بۆچی دڵم ئاوا کوتەی دێت و ناهێڵێ بحەسێمەوە؟ ئایا ئەمە دڵدارییە، یان بێ متمانەیییە، یانیش هەر ترسە و چیتر نییە؟! هەستم لەگەڵ عەقڵ و لەگەڵ ئارەزووەمدا تێکەڵی یەکتر بوون؛ توانای هزرکێشیم نەما؛ خەریکبوو لە هۆشی خۆم دەچووم و دەبووارمەوە!

نێردراوەکان لە شاخەکەی سەر ڕێگاکە نزیک بوونەوە، هەر هەنگاوێك لەمن دوور دەکەوتنەوە، هەمان هەنگاو لەو شاخە نزیك دەبوونەوە کە گوندەکەم و دایکم و سارا خانی لێم دەشاردنەوە! ئەسپەکەی میر عەلی لە پێشێدا دەڕۆیشت و هەر هەنگاوێك دوور دەکەوتەوە، کەمێك لە تیرەکانی بزر دەکردو ئەوانی تریش بە دووایانەوە بوون. ئەو سەکۆیەی من لەسەریەوە ڕاوەستا بووم، هێندە بەرز نەبوو کە ڕێم بدات ئەو سوارانە، تا دەچنە ناو زڕگوێز، هەر لەبەر چاوم بن‌و لێم وون نەبن! ئەو شاخەی لە ڕێی زڕگوێزدایە، لەمن بە تەمەنترە و لەوەتای وەبیرم دێت، ئەو شاخە هەمیشە قەشەنگ دیار بووە، ئەمجارە نەبێت؛ ئەمجارە پەردەی بەسەر جوانی کەژاوەی ئەو سوارانە داداوە. ئومێدم کرد ئەو شاخە، لەو دەمە، لەوێدا نەبووایە! بوارم نەما چیتر تەماشایان بکەم‌و بیانبێنم! ئەم شاخە، چۆن پێشتر هەردووك گوندی لە یەکتری جودا کردبووەوە و پەنای دابوون،

ئـەمجارەش سـوارەکانی لـەمن جـودا کـردەوە. دڵـم تونـدتر لـە جاران لێیـدا؛ خورپەی دەهات!

تا پاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژی چاوەڕێ بووم: لەبـەر خۆمـەوە دەستم بـر منگەمنگ – "ئەو پیاوانە درەنگییان داهێنـا،" وا بـە خەیاڵمدا هات کـە ئـەو کات دەیانویست هەموو شتێك ببڕنـەوە و نـەخت و مـارەیی سارا دیـار بکـەن؛ بـەڵام پێشـتر، دەبـوو مـیر محمـدی بـاوکی سـارا، قایـل بکـەن! دەبـێ هـەموو داخوازییەکانی مـیری تیلـەکۆ فەراهـەم بێـت، ئینجا سارا مـارە بکـەن. پلانـی گواستنەوەی سارا ڕێك دەخەن. دوایین شت کە تێکەولێکەی لەسـەردا دەکـەن، مۆر کردنی مارەیی نامەکەیە. من میر عەلی جاف باش دەناسم؛ ئەم پیاوە تـا هـەموو شـتێك نەبڕێتـەوە، ناحەسـێتەوە! بـە تایبـەتیش ئەوەیـە کـە خـۆی خەرجی ئەم زەماوەند و ژن گواستنەوەیە، لە ئەستۆ دەگرێـت. خـۆی، لەبـەر چاوی هەمووان، ئەم پەیمانەی دا. وا هاتە خەیاڵم کە، وەك کورد دەڵێن، 'ئـەو دۆیە ئاوێکی زۆری دەوێ!'

زۆر دووا کـەوتن؛ ڕەنگـە لەبەرئـەوە بـوو بـێ: کـە وێستبێتیان مـیر محمدی جاف قایل بکەن تا سارا بە شوو بدات. دەبێ قایلشی بکەن تـا مـن بـە زاوای خۆی پەسند بکات و نەشهێڵن وەژێر قەرد بکەوم. کاکە! خـۆ ژن هێنـان گاڵتەنییـە! چونکە مـیر محمـد خـۆی پیـاوێکی هـەبوو بـوو، بێگومـان ئاسـتی خواستەکانیشـی بڵنـد دەبێت. ئـەو چـەند جوامێرەی بـۆ مـن ئـەو ئەرکـەیان خستە سەر شانی خۆیـان و ئـەو ماندووبوونەشیان کـرد، وورد و درشـتی مـن شارەزان دەزانن 'هەویرەکە من چەندێك ئاوی گەرەکە.'

"میرمـان خـۆش بێـت، خـۆ تـۆ لـە ئێمـە باشـتر مـەلا محمـدی جـاف دەناسی." ڕەنگە میر عەلی ئاوا قسە لەگـەڵ مـیر محمـدی بکات پێـی بڵێـت – "ئەو مەلایەی ئێستا هەیە، زۆر منداڵ بوو کە باوکی فەرمانی خـودای بـەجێ

گەیاند، لەگەڵ ئەمەشدا جێی خۆی لە هەورازی ئەو خەڵکە کردووەتەوە و خەڵك گوێ لەو پتر دەگرن نەك لە ئاغە. جا ئەگەر ئێوە قایل ببن کە کچەکەی خۆتان بە ئێمە بدەن، ئێمە گەورە دەکەن و خۆشتان دەزانن کە مەلا محمدی جاف هەورازی دیوەخان و میحرابی مزگەوتی بە زیرەکی خۆی بۆ خۆی گرتووەتەوە." میر عەلی بەو مرازەوە ئەم قسانە دەکات تا میر محمدی جاف قایل بکات من بە زاوای خۆی پەسند بکات. بەم قسانە لەسەر بابەتەکە پێکدێن و ڕێك دەکەون و دەست دەخەنە ناو دەستی یێکتر و بابەتەکە دەبڕنەوە و سارا مارە دەکەن؛ پیرۆزە!

میری تیلەکۆ جوامێرێکی زیرەکە و بایەخ بە زانست و بە زانا و ئەدیب و هونەرمەندان دەدات. هەرگیز دیوەخانەکەی بێ زانا و نووسەر و گەورە پیاو و چاوەشان نەبووە. ناکرێ میر محمد بەرپەرچی ئەم خوازبێنییە بداتەوە! ئاخر من گەورە پیاو و جوامێرانی جافانم ناردووە بۆ ئەم خوازبێنییە و خۆ شوێنی خۆیشم وەك مەلایێکی زانا لەهیچیان کەمتر نییە، ئەگەر هەورازتر نەبم! سەرباری ئەمەش، میر کچەکەی خۆی فرە خۆش گەرەکە و دەشزانی کە هەردووکمان مەیلی یێکتریمان لە دڵدا هەس و ئەم هاوسەرگیرییە، لەهەموو ناچەی ئەم جافگەلە، دەبێتە نموونەی کامەرانی و هەموو دەبێ شانازی پێیەوە بکەن. وا هاتە خەیاڵم کە قسەی گەلەك خۆش، لەگەڵ خۆیاندا، بۆ ئەم ناوە دێننەوە.

سەرباری ئەوەی کە هەموو ڕۆژەکە لەسەر سەکۆی مزگەوت بە پێوە ڕاوەستا بووم، بەڵام هیچ هەستێکم بە ماندوو بوون نەکرد! ئاگام لەوەش نەمابوو کە هەموو خەڵکەکە بە گومانەوە سەیری منیان دەکرد، بێی ئەوەی کە بزانن چ باسە و چ هەرایە یان لەمن بپرسن. ئەو خەڵکەی لەسەر سەکووەکە ڕاکشا بوون، ئەوانەی دامەیان دەکردو ئەوانەش کە هەر خەریکی

تەسبیحەکانیان بوون و هیچیان وەدەست نەدەکەوت، هەموو لە سەیری من حەپەسابوون؛ ئاگام لێیان نەبوو تا هەموو بە یێکەوە پێکەنین و پیاوێکیان بانگی لێ کردم و پرسی - "ئەرێ ماموستا! ئەمە تۆ بۆ وا هەراسانی؟ بۆ دانانیشی؟ ئەو سەفەرەیان چ پەیوەندی بە تۆوە هەیە؟"

وەڵامی ئەو پرسیارەم نەداوە، تەنیا زەردەخەنەیێکی ساردم بەسەر لێواندا هات و قسەیێکی ماموستاییێکی خۆمم وەبیر هاتەوە کە فەرمووی - "تا بەرهەمت نەبێت، بابەتەکە ئاشکرا مەکە!" لەناو جڤاتێکی ئاوا بچووکیشدا، لە قازانجی خۆم بوو ئەگەر نهێنییەکە بپارێزم. دەگوترێ کە باشتر وایە بابەتی ژن هێنان و شووکردن، تا تەواو نەبێت، ئاشکرا نەکرێت. دەڵێن بە هۆی ئەوەیە تا بابەتەکە وەبەر چاو و زار نەکەوێت؛ بەڵام من دەڵێم - لەبەرئەوەیە تا کەس هەوڵ نەدا کارەکە تێک بدات و ناوبانگی یێک لە زاوا یان لە بووکەکە بشێوێنێت؛ هەر بۆ ئەوەی نێلێ ژنهێنانەکە تەواو ببێت؛ ئاخر هەندێك کەس هەن تەنیا بۆ ئەوەی ناویان بێتە ناو ناوان، دەچن کانی گوندی پیس دەکەن! بێگومان، هەموو کچێك تا شوودەکات و هەموو کوڕێکیش، تا ژن دێنێ، خەڵکی زۆر بە تەمایانن، چ جا ئەگەر کیژەکە کچی میر و ئەوینداری مەلای لادێیەك بێت! ئەم هەموو بینە و بگرەو بەردەیە، هزریان ئاوەژوو کردبوومەوە و هەر چاوەڕێ بووم تا ئێوارەیێکی درەنگ، کە سەرکەکان لە پشت شاخەکەڕا وەدەر کەوتن! هەناسەیێکی خۆشم هاتەوە بەر. بێ ئاگاداری خۆم، ئەهایەکم کردو پاشان وتم:

"ئەها! ئەوەتان! هاتنەوە." بە دەنگی بەرزەوە قسەکانم کرد.

"دەڵێی زۆر چاوەڕێیانت کردووە؟" کەسێك پرسیاری کرد.

"شێخ حەمە، وەپێش سوخەن نەکەوە؛ ئەوەی ئێستا لەناو دڵان بێ، سبەی لەسەر زمانانیش دەبێ!" یەکێکی تر پەلارێکی تێگرتم.

"مەلا، ئارامت بێت، تا دەگەنە جێ و قسەکان دەگێڕنەوە؛ ئینجا لێیان تێدەگەین و دەزانین چ باسە و چ هەرایە،" پاشان هەر ئەو قسەزانە، بە هەموو ئامادەبووانی ئەوێی ووت – "زەوی هەموو جارێك بەرهەمی لێ نادروێتەوە، جا با هەر وەردیش بووبێتو سالی پێشتر جووت نەکرابێت." کابرا لەمنگەمنگ نەوەستابوو کەچی پاش کەمێك، وتی – "ئاشا! بێستە تا دەگەنە جێ، پاشان گوێمان لێیان دەبیو خراری خۆیان هەڵدەرێژنو چ هەبێ دەیێژن."

مێشکم هیچی بۆ وەرنەدەگیرا! لە داهاتوو نیگەران بووم. هەرچەندە سوارەکان زۆریان نەمابوو تا دادەبەزن، بەڵام وا دەهاتە بەر چاووم کە لە شوێنی خۆیاندا چەقی بوون. پاش تەمەنێك لە چاوەڕوانی و دڵە ڕاوکێی خۆمدا، ئینجا جوامێرەکان قۆناخیان گرت. دیار بوو قسەی ئەوان، خۆشیان پێنەبوو! بەڵام من ژیلەمۆی هیوام هەر مابوو.

چاوەڕێ بوومو دڵی خۆمم داوە و گوتم زۆر شەکەتن، ئینجا ماندوو نەبوونم لێ کردن و پرسیم – "بڵێن! چیتان بەدەستەوەیە؟"

بەڵام کەسێکیان زمانی نەگێڕا، دەتگوت زمانیان لە دەمدا نییە! تەنیا میر عەلی وتی – "مەلا محمد، وەرە." ئیتر بێ هیچ قسەیێك چووە ژووری دیوەخانەکە و منیش بە دووایدا چووم و لەپاشی منیش هەر پێنج پیاوەکەی ئەندامانی نێردراوەکە، بە دووامدا وەژووری کەوتن. بەڵام میر عەلی داوای لەهەموویان کرد کە لە دەرێ چاوەڕێ بنو پێی ووتن:

"گەرەکمە بە تەنیا دەگەڵ مەلا محمدی چەند قسەیێك بکەم."

هەموویان گەڕانەوە؛ منو ئەو، خۆی، لە ژووری ماینەوە. هێشتا میر هیچی نە ووتبوو، کە دەرییەکە واڵا کراوە و ماڵە ئیسهاق خۆی خزاندە ناو دیوەخانەکە و بە ژووری کەوت. میر بەرهەڵستی نەکرد، زانیم هەر لەبەر

تەمەنەکەی بوو ئەو ڕیزەی لێنا و پێی وتم - "مەلا حەمە! ڕەنگە بۆ ئەم خوازبێنییە پێویست بکات چەند جارێکی تریش سەردانی میری بکەینەوە؛ ئەم جارە میر محمدمان، بە تەواوەتی، پێ قایل نەکرا." هەڵوەستەیێکی کرد، هەناسەیێکی هەڵکێشا و سەری خۆی بادا و وتی - "بە لای کەمییەوە، دەبێ جارێکی تریش سەردانی بکەین‌و ئەم داخوازییەی لێ بکەینەوە؛ دەبێ تۆش دان بە خۆتدا بگری؛ چاوەڕێ بە تا بزانین میری گەورە چۆن بڕیاری خۆی دەدات." میر عەلی زۆر جەختی لەسەر قسەکانی کردەوە و بە چاکی ووشەکانی خۆی هەڵدەبژاردن.

"مەلا!" مام ئیسهاق وتی - "بێ ئومێد مەبە؛ دنیا بە ئومێد خوراوە! پەنا بە خوا، ئەم سەر سەختە قایل دەکەین." ئیتر بە درێژی باسەکەی بۆ کردم‌و لە کۆتاییدا، وتی - "پیاو بە کارەکانییەوە ناو دەردەکات؛ کەس بە قسەکانی نابێتە پیاو و کەسیش بە قسان ناشکێت."

"ببوورە، قسەکانت پێ دەبڕم." وتم - "من لەپاش خودا هیچ کەس پشتیوانم نییە، ئەگەر ئێوە نەبن."

"وا مەڵێ، مەلا." مالەکە وتی:

"بەرژەوەندییە جیاوازەکان هەمیشە لە گلمتێکدا کۆ دەبنەوە، ئێمەیش لەو گلمتە دەگەڕێین تا بزانین لە کام خاڵ بەرژەوەندییەکانی میر محمد لەگەڵ بەرژەوەندی تۆ یێکتر دەگرنەوەو لە وێڕا بۆی شۆڕ دەبینەوە." میر عەلی وتی.

"کەس نییە هەر بۆ خۆی بژی!" مالەکە وتی - "ڕاوێژکردن باشە تا بەرزی و نزمییەکانی خۆمان بناسین و ئامۆژگارییەکان بە هەند هەڵبگرین. مەلا، چاوەڕێ بە!"

## فەرمانی شاروەردەری و دەستگیرانی

چەند ڕۆژێک لە دووای گەڕانەوەی میر عەلی و هاوڕێیەکانی لە گوندی زرگوێز، حوسێ، خزمەتچی بەردەستی میر محمد، هات بۆ ئەوەی چاوی بە من بکەوێت. منیش، هەر لە مزگەوت، بە گەرمی وەخێر هاتنیم کردو لە میحرابەکە دوورم خستەوە و لە مزگەوتم بردە دەرێ، ئینجا ئامـاژەم بۆ جەلحەیێکی پڕ ئاوی سارد کردو وتم – "فەرموو، قومێك ئاو بخۆوە. تۆ لە دوورەوە هاتی، نابێت ئەگەر تێنووت نەبێت، فەرموو، فەرموو."

"خودا پاداشتتان بداتەوە." ئەم خزمەتکارە هەر لە زووەوە لەبەر دەستی محمد بەگی جاف ئیشی کردووەو جێی متمانەی ئەو میرییە و ڕێز و جوولەی بە تەواوی لە کەسێکی میهرەبان‌و شارەزاو قسەزان دەچێت. حوسێ جەلحەکەی بەدەمی خۆیەوە کردو ئاوەکەی نۆش کردو سوپاسی منی کردو هەر کۆخە کۆخی بوو؛ دیار بوو کابرا شتێکی لە دڵدا هەبوو، دەیویست بیدرکێنێت و نەیدەزانی لە کوێوە دەست بە قسەکان بکات. زۆر بەڕێزەوە سەیری دەکردم؛ زمانی لەبەرانبەری مندا نەدەگەڕا!

"دەی حوسێ! دەڵێی قسەیێکت بۆ هێناووم؟" هەر ویستم زاری بکەمەوە تا قسەیێك بکات!

حوسێ تفی خۆی قووت داوە و وتی – "گەورەم، مامۆستا! بەگزادە! زۆر بە داخەوەم ناچارم بە بەڕێزتان بێژم کە دەبێ ئەم لادێیە جێبهێڵی! لێرە بڕۆ!" حوسێ زۆری نەمابوو لەگەڵ ئەم ڕستەیەدا بخنکێت، بۆیێ

هەڵوەستەیێکی کرد، جا دەنگی بۆ هاتەوەو وتی – "میری تیلەکۆ ئەم فەرمانەی بە من دا تا بۆ تۆی بێنم؛ ئەم خواستە میر بۆ تۆی ناردووە، نابێ لەم گوندە بمێنییەوە؛ دەبێ بڕۆی!"

کە لە هۆی ئەو فەرمانەی میر محمدیم پرسی، لە وەڵامەکەی سەرم سڕما؛ چونکە هیچ هۆیێکی نەبوو. ئەوەی من تێیگەیشتم ئەوەبوو کە میری گەورەی جافان بە میر عەلی و هاوڕێکانی ڕاگەیاندووە نەهێڵن من چیتر لە گوندەکەیان بمێنمەوە؛ بەڵام ئەوان شەرمیان بە خۆ بوو ئەم فەرمانەی میر محمدیم پێڕابگەیێنن، جا میر خۆی ئەو خزمەتکارە تایبەتەی خۆی ناردووە تا فەرمانی "دەبێ لێرە بڕۆم" جێبەجێ بکەم!

- "تێدەگەم" بە حوسێم ووت و ئیتر، تا ماوەیێك، توانای بیرکردنەوەم نەماو کپ بووم‌و پاشان تەماشایێکی خزمەتکارەکەی حەمەم کردو وتم – "وا تێدەگەم کە حەمە نایهەوێت من لە نزیك گوندی زڕگوێز بژیم." حوسێ هەستی لەخۆی بڕیبوو؛ دیار بوو داخی لە دڵدا بوو، بەڵام کوچك لە ئاگر گەرمتر نابێت! جا وتم:

"حوسێ، لە میری بگەیێنە کە من مرۆڤێکی خوایی و دیندارم، هیچ کارم بە سیاسەت و حوکمدارییەوە نییە." ڕاوەستام تا هەناسەیێك بدەم، ئینجا وتم – "بە میری بێژە عیلم و کەسایەتی خۆم و خزمایەتیمان، زۆر هاریکاری ئەو دەبن نەك نەیاری." ئەوەشم بۆی ڕوون کردەوە کە من نابمە تەگەرە لە ڕێی ئەودا، بەڵکوو هەمیشە ئامۆژا و پشتیوانی ئەوم، ئەگەر کەس نەمێنی، من دووا کەس دەبم خۆی لەسەر بە کوشت بدەم؛ وتم – "بەو زانین‌و تایبەتمەندییانەی کە هەیتم، وا دەکەم خەڵکی پتر ڕێز لە میری بگرن و باشتر بەقسەی بکەن." ڕاوەستام، هەناسەیێکی درێژم دا، ئینجا وتم – "وا دەکەم ئەو لادێییانە هەموویان بەپێی شرعی خودا ملکەچی بن‌و هەموو

خێرێك کە بۆیان بێت لە میرەوە دێت و تێیان دەگەیێنم کە میر براگەورەیە و موسوڵمانی باشیش خۆی دەداتە پەنای میر و ئەویش دەیانپارێزێت."

گەرەکم بوو ئەو خزمەتکارە لەمن تێبگات و هەست و خواستی ڕاستی من بۆ میر محمد بباتەوە، بەشکوو خودا بکاتو میر دڵی نەرم دەبێت ئەم خواستەی لە بیر دەکات؛ چونکە ئەمە بێگومان ڕەوا نییە و خوداش قەبووڵی ناکات. حوسێ گەڕاوە. منیش لەناو گێژەنی خواستی خۆم و فەرمانی میر محمدیدا هەراسان ببووم. لەو دەمەدا هەستم کرد گەرەکمە دایکم ببینم و گوێ لە ئامۆژگارییەکانی ڕابگرم؛ ئیتر خۆم تەیار دا و بە دووای حوسێدا چووم. گوندی میر عەلیم جێهێشتو بە کەسیشم نەووت! ڕووم لە زڕگوێز کرد، گەیشتمە ماڵەکەی خۆمان و دەستی دایکمم ماچ کردو تەواوی سەربردەکەم بۆی گێڕاوە، وەك خۆی، نە هیچم بەسەرییەوە نا، لە لێیشم کورت کردەوە.

- "دەزانم، کوڕم! میر نەگەرەکییەتی تۆ لەیرە بمێنیتەوە و لە زڕگوێز نزیك بیتەوە، دەزانی بۆچ؟ کوڕم!" دایکم پرسی. لەم دەمودەستە فرە پێویستم بوو بۆچوونی دایکم بزانم و لە هزریشی تێبگەم.

"بۆچی؟ من چیم لەو ئامۆزایەم کردووە؟ بۆ ئەو هێندە لەبەرانبەرمدا، دڵ ڕەقە؟" پرسیار لەسەر زمانم خۆی لە پرسیاری پاش خۆی گیر دەکردو نەدەبڕانەوە!

"ڕۆڵە!" دایکم پێی وتم – "لە ئاییندا هاتووە کە ئەو 'لە خوا ناترسێ.' لەبەر ئەم هۆیەش، دەبێ لە تۆ بترسی. ئەم ترسەش دوو هۆی هەیە، تۆ وەکوو محمدی نی؛ تۆ مەلایەکی چاکی، ئەو، لە چاو تۆوە، مەیلەو نەخوێندەوارە! لەمەش دڵنیایە کە 'بەو زانستەی تۆ فووڵاییەکان وەدەر دەکەون و خوناو لە ئاسمانەوە دەکەوێت.'" دیسان وتی – "میر تۆ وەك

ئەژدیها دەبینێت، لەلای میر تۆ ئەو ئەرژەنگەی کە دەتوانی بە ئاسانی لە تەلان هەڵیدەیە خوارەوە و نەیهێڵی! میر هەرگیز ناتوانێت خۆی لە بن باری ترسەکەی ئازاد بکات؛ جا ناچارت دەکات لەم دەڤەرە دەربچیت." دایکم هەڵوەستەیێکی کردو هەناسەیێکی خواردەوە و فەرمووی – "کە میر محمد خۆی لەگەڵ تۆ بەراورد دەکات، خۆی فرە بێبەها دەبینێت؛ تۆش بەو زانست و ڕاستی و دروستی و خواناسیەتەوە، ئەو لە سێبەر دەخەیت و لەناو ئەم جافگەلە بێ بەها و بێ سوود دەیهێڵییەوە، جا کوڕگەلی چاونەترسی جافان، لە دژی هەڵدەستنەوە و ڕادەپەڕن و بە دووای تۆ دەکەون.

کوڕم، سەرباری ئەمەش، کە تۆ دەگەشێیتەوە، ئیتر وەك ئەوە دەبێت کە باوکت بژیێتەوە و بێتەوە ناویان و ئەوانیش کە ئەمە ببێنن، لە محمد ڕاست دەبنەوە؛ لێی یاخی دەبن. ئەم جافگە لەهیچیان لەم میر محمد نەدیتووە تا بیگێڕنەوە و باوکیشت لە تۆوە دەبینن و هەمان کارەکانی باوکت لە تۆ ڕەچاو دەکەن. ئەگەر میر لەسەر کورسی دەربکرێت، هیچی نییە تا بۆی بمێنێتەوە و کەس بە دووایدا ناچێت و دەبڕێتەوە." دایکم سەر لەبەری بابەت و ترسی میر محمدی بۆ شی کردمەوە و ئیتر پێشبینیم دەکرد دایکم هیچی تر نەڵێت و بواری ئەوەم بۆ بهێڵێتەوە کە نەختێك بیر بکەمەوە و قسەیێکم هەبێت، بەڵام وا نەبوو! دەستی بە ئاخاوتن کردەوە و منیش نەمویست قسەبڕی پێبکەم، جا وتی –"ڕۆڵە، من هەموو میرەکانی جافان دەناسم و ئەمەشیان لەهەمووان باشتر دەناسم؛ میر محمدی جاف هێندەی گورگێك زیرەکە، بڕیارەکانی ئەمڕۆی، بەپێی پێویست، لە سبەی دەگۆڕێن. ئامادەیە جەرگی خۆی ببڕێت ئەگەر بزانێت ڕێی لێ دەگرێت؛ دەسەڵات لەلای میری هەموو شتێکە و هەموو شت و هەموو کەسێکی قوربان دەکات.

دلڕەقی بناغەی دەسەڵاتەکەیەتی، لە ڕێی لادە." دایکم لەگەڵ قسەکانیدا خەریکبوو بگرییێت، منیش ناچار بووم قسەی بۆ بکەم؛

"دایە!" وتم – "ئەم تایبەتمەندییانەی تۆ باسیان دەکەی، هەموویان چاوەڕوانکراوە لە دەسەڵاتدارانی ئەم دەڤەرە. منیش خۆم بە ئەو بەراورد ناکەم و ڕووبەڕووشی نابمەوە؛ بە هەموو تواناکانمەوە، پشتیوانی لێدەکەم؛ ئامۆزامە، لەوە پتر دەبێتە چی؟ گەرەکمە قەناعەتی پێ بێنم کە دەبمە پشتیوانی و بە گەورەی خۆم پەسندی دەکەم و لە شوێن باوکم دەیپارێزم. تێی دەگەیێنم، ئەگەر ئێمە، لەناو خۆماندا، لەسەر شتێك ڕێك نەکەوین، بێپەنا و بێهێز دەبین و ئەمەش جافگەلەکەمان لاواز و بێ دەسەڵات دەکات؛ دەبێ یێك بین، تا بەهێز بین." ویستی خۆمم بۆی ڕوون کردەوە.

"ڕاست دەکەی، کوڕم!" دایکم وتی – "بەڵام ڕاستییەکان ئەوە دەسەلێنن کە ئەم پیاوە فرە ڕقی لێتە و پتریش ترسی لێتە. بڕۆ لێرە دووركەوە و بچۆ ئەو شوێنەی میر، لەوێ، دەستی ناتگاتێ. تۆ سەوادت هەیەو دانای؛ جا لەهەر کوێ بیت، جێت دەبێتەوە و دەتووانی یارمەتی خەڵکی بدەیت. لە بیرت بی‌و لە بیرت نەچێ کە تۆ ڕاژەگوزەری ئەم خەڵکەی، پەیوەندی باشت لەگەڵیان دەبێت. دەتوانی بە ئاسانی دڵیان بۆ خۆت ببیەت و گوێڕایەڵت بن. تۆ هیچ پێویستیت بەم میرەی ئێرە نییە، بەڵکوو، ئەگەر ئەو عاقڵ بێت، ئەوا ئەو موحتاجی تۆیە؛ پیویستی بە هاوکاری و زانست و پشتیوانی تۆیە. بڕۆ، میر محمدی جاف شایستەی ئەوە نییە تۆ لە بن دەستی ئەودا بیت. لە زڕگوێز دەرچە. دوور بکەوە. مەلا، لەبیر بێت کە ژیری لە سۆز کارامەتر و باڵاترە." دایکم هەرچەندە لە قسە کردنەکەیدا، پتر لە دانایێك دەچوو، بەڵام هێشتا قوڕگی پڕ نزگرە بوو؛ ئەگەر دانی بە خۆیدا

نەگرتبا، وەك منداڵێك دەگریا. من تا ئەم خولەکە، هەرگیز قسەی دایکمم نەشکاندووە، بەڵام وا دیارە ئەوین خەریکە لە ڕێم لادەدا!

ویستم بابەتە لەگەڵ دایکم تەتەڵە بکەمو وتم – "دایە! هەر ئێستا وا دەچمە دیوەخان و میر محمد دەبینم و قسەی دەگەڵدا دەکەم." هەناسەیێکم خواردەوە و پێداچووم و وتم – "دایە، لە بیرت نەچێ، محمد ئامۆزامە؛ واتا کوڕی مامەمە! من خۆشم گەرەکە، جا ڕای لێم بێت یان نەبێت، ئومێد دەکەم بتوانم قایلی بکەم تا سارام پێبدات و بە زاوای خۆی قەبووڵم بکات." بە ڕژدی ئەم قسانەم لەگەڵ دایکم کرد.

"کوڕم! ئاگات لە خۆت بێت؛ خۆت لە تووڕەیی دەسەڵاتداران دوور بگرە. زۆر ڕیزی لێبگرە. هەرچی دەبێت بلا ببێت، بەڵام لە بیر مەکە، میر محمدی جاف ئامۆزای هەفتە، باوکتان برا بوون." دایکم هەموو شتێکی بۆ ڕوون کردمەوە و منیش دەستیم ماچ کرد.

"دایە!" وتم – "مەهێلە دڵت هیچ بکات، خۆ من چەند ساڵە پیازم نەچاندووە، تا نەزانم چۆن ڕەفتار لەگەڵ کەسایەتییەکی وەك ئامۆزا و میری خۆم دەکەم." پاشان بەرەو دیوەخانی میری ئامۆزام وەڕێکەوتم. دیسان، دایکم بەردەرگەی ماڵەکەی ئاوڕێژکردو دیار بوو لێوەکانیشی هەر خەریکی نزا بوون؛ نزای دایکێکی باشی بۆ دەکردم.

چوومە دیوەخانی میری و لەوێ چاوم بە خودی میر محمدی جاف کەوت؛ سڵاوم لێی کرد؛ تەوقەم لەگەڵیدا کرد، وەك ئەوەی هیچ لە نێوانماندا نەبێت. ئەویش، هێندە بە گەرمی بە خێر هاتنی کردم، کە چاوەڕوان نەکرابوو، خەریکبوو بشێوێم و بیرم کردەوە دەبێت حوسێ قسەی ناڕاستی بۆ هێنابم؟ لەگین بوو لەگەڵ خۆمدا ئاشت ببمەوە، جا زۆر بە شێنەیی و بەنەرمییەوە قسەم کردو وتم:

"ئامۆزا، پێیان وتم  ئێوە فەرمانتان داوە کە دەبێ من لەم دەڤەرەی جافایەتی دوور بکەومەوە!" بە حەپەساوی قسەکەم کردو وتم – "میرم! بەڕاستی، تا ئەم چرکەیەش باوەڕم نەکردووە کە تۆ ئەم جۆرە فەرمانە ناڕەوایە دەربکەیت، ئەمە لەناو و دەنگی تۆ ناشێت و ناوەشێتەوە؛ تۆ، لەبەر چاوی من، فرە لەم جۆرە فەرمانانە دووریت و نابێت ئەم چەشنە قسانە چیتر بەناوی تۆوە بکرێن و دەبێ ڕێیان لێبگیرێت، چونکە ئەم فەرمانانە نەك هەر لە دژی بەرژەوەندی خۆتە، بەڵکوو ناوی خێڵی جاف و عەدالەتی میرەکانیشی دەشێوێنێت؛ هەر بۆیێ هاتم سەرەدانییێکتان بکەمو زۆریش پێم خۆش دەبێت ڕاستی و دروستی ئەم فەرمانە لە دەمی خۆتەوە ببیستم، چونکە من لەو باوەڕەدا نیمە تۆ ئەم خواستە لە کوڕە مامی خۆت بکەیت! ئاخر سەیرە، ئەم خواستە لە دەزگای ڕەوابەندی و عەدالەتی تۆ دەربچێت! من هێشتا باوەڕ ناکەم ئەمە فەرمانی تۆ بێت!" بەم هەموو قسانەم هێشتا دڵم ئاوی نەخواردبووەوە و تەما بووم هێشتا بڵێم، بەڵام میر محمد قاچی خستە سەر قاچ و سەیری ناو چاوی کردم. ئینجا وتی:

"ئامۆزا! ئەم قسانەی بیستووتە فەرمانی خۆمن؛ من لەم فەرمانەدا، هیچ ڕاڕا نیمە و لەو باوەڕەدامە، دوو سەر لەناو مەنجەڵێکدا ناکوڵێن! جا وا باشترە بۆ تۆ، دوور بکەویتەوە؛ زرگوێز چیتر هی تۆ نییە. بێگومان دوورکەوتنەوەی تۆ لێرە، بۆ منیش باشترە؛ سەرم کەمتر شلۆق دەبێت. لێرە دوور بە؛ تا بتوانی پشت بە خۆت ببەستیت و یارمەتی منت نەوێت." میر محمدی جاف ئەم هەموو قسە ڕەق و بێ بنەوانەی کردو پشووی نەدا.

"ئەم فەرمانانەت بە ڕاست، ئامۆزا!؟" دەمم بەش بووەوە؛ چاووم زەق بووەوە، کە ئەم قسەیەم کرد؛ نەختێك دانم بە خۆمدا گرت، هێواشم لێکردو پاشان وتم – "باشترین مامۆستای من ئەو ژیانەیە کە تەنیا خۆم

ژیاوم؛ فرە دەرسم لەم ژینە وەرگرتووە؛ دەزانم چۆن خۆم بژیێنم، دەشزانم چۆن ڕێ بە خەڵکی نیشان بدەمو هاریکاریام بم، خەڵك پتر پێویستی بە منە لەوەی کە من پێویستیم بە خەڵك بێت. دەمەوێ لە گوندەکەی خۆمان نزیك بژیم؛ ئاخر ئەمە ماڵی خۆمە! زرگوێز ئەو گوندەیە باوکم تێیدا ژیاوە و هەر لێرەش مردووە و گۆڕەکەشی شاهیدی حاڵە. من پشتیوانی تۆم؛ هەردەم ئامادەم تێنی پشتت بم. بانگم بکە و من ئامادەم. من مەلامە و شەرعو قانوونم خوێندووە و دەزانم چۆن بێ لادان لە شەرعی خودا، پشتت بگرم، من لە زۆر خراپە دەرت دەچوێنم، ئامۆزا!" تا دڵنیام کردەوە، قورگم گیرا، بەڵام لەلای ئەو نە با بوو نە باران!

"مەلا محمد،" ئەو وتی – "ئەم قسانەی تۆ ڕاستن، بەڵام لەلای من بێ بایەخن! ڕاستە باوکت لێرە ژیا و لێرە مردو تۆش لێرە هاتییە دنیا و مشەوەشت کرد؛ بەڵام باوکت ڕۆیشت؛ نان ئەو نانە ئێستا لە خوانە؛ ئەو وا، لەبەر دەستی خودایە، تۆش هەرگیز لێرە نەژیاوی و خەونەکانت لێرە نەدیوە و خەونت بە زرگوێز نەبینیوە!" ئەم قسانەی زۆر بە ڕشتی دەکردو پاش دەودەوانێییێکی دوور و درێژ تێیگەیشتم کە میر محمدی جاف لە مەلاییێکی بێدەسەڵاتی وەك من، نەك هەر دەترسێت، بەڵکوو زەندەقی ڕژاوە و وتی – "تۆ گەرەکتە دەسەڵاتی باوکت وەرگریتەوە! دەسەڵاتدار، لە دووای مردنی مامم، گۆڕا و تۆ ناتوانیت دەسەڵاتەکەی میری باوکت وەرگریەوە؛ تۆ دۆڕای!" هەرگیز کەس هێندە بێڕێزییەی لەبەرانبەر مندا نەکردووە؛ بێزم لەخۆم بووەوە کە هاتوومەتە ئێرە و دەمەوێ ئەم کەسە قایل بکەم؛ ئای عیشق! یا خوا نەمێنیت! بەڵام سیاسەت هەڵکشان و داکشانە، با ئەمجارەش داکشێم، تا بزانم لەو سیاسییە نەفام و نەزانە چی وەدەست دێنم!

"میری گەورە!" وتم – "من لەهەمموو مافێکی خۆم لە دەسەڵات و موڵك ماڵی زڕگوێز خۆش دەبم، و بۆ تۆیان دێڵمەوە." ڕاوەستام تا نەختێك ئارام بوومەوە، ئینجا وتم – "من ئەو پیاوە نیم بە دووای دەسەڵاتدا بگەڕێم، دەسەڵات ئەرکێکی قورسە و ئەگەر دەسەڵاتدار ڕەوا کارنەکات شەرمەزاری خودا و خەڵکی دەبێت، ئەمە بە من ناکرێت." پاشان مەرامی ڕەوای خۆمم بۆی ئاشکرا کردو زمانم تەتەڵەی لێنەکرد کە وتم – "تاکە مەرامی من ساراخانی ئامۆزامە، بۆ خوازبینی ئەو هاتوومە لاتان و ئومێد دەکەم لاساری لە خواستەکەم نەکەن." قسە نەما بیکەم؛ زمانم گیرا.

میر محمد هەڵوەستەی لێنەکردو بێ بیرکردنەوە، نکووڵی لە داخوازییەکەی من کردو داوای لێکردم هەرچی زووە گوندەکە بەجێبێڵم و خۆم ڕاگیر نەکەم، دەنا هەڵوێستی توندی لەبەرانبەرمدا دەبێت.

بە دڵ شکاوی خاترم لێی خواست و هاتمەوە ماڵی خۆمان؛ باسەکەم بۆ دایکم گێڕاوە. دایکم بەسەری سپییەوە ناڵاندی، پاشان دەستی لەسەر شانم داناو سەنگی خۆی خستە سەر شانم تا پشتی ڤیت کردەوە؛ ئینجا پەنجەکانی بەناو پرچم داهێنا و بە شێنەیی و بە دەنگێکی نەرمەوە وتی – "ڕۆڵە، خەمی لێ مەخۆ! من بۆ دووا جار، سەردانی میری دەکەم و سارای لێ دەخوازم و دڵنیای دەکەمەوە کە تۆ لە دەڤەری جافایەتی دوور دەکەوییەوە و پێی ناوێ ئەویش دڵی خۆی سەخڵەت بکات." دایکم ماندوو بوو، پێویستی کرد هەناسەی وەبەر بێتەوە و بارێك هەوای هەڵمژی، ئینجا وتی – "کوڕم! ناگەڕێمەوە ئەگەر قایلی نەکەم و قسەی میرت بۆ نەهێنم." دایکم زۆر بە متمانەوە قسەکانی کردو لە ماڵەوە دەرچوو.

پتر لە سێ کاژێر چاوەڕێی هاتنەوەی ڕەعنا خانی دایکم بووم. وامزانی سێ مانگە بە ڤاق گیراوم! بەگزادە هاتەوە. سەرم سڕما! دایکم فرە

پیرتر لە جاران دیارکەوت. ئەمە دایکی منە! ئەی بۆ ئاوا گۆڕاوە؟ چەندین ساڵ لەخۆی گەورەتر دەرکەوت! بێ ئومێدیم لە ڕوخسارە پاکەکەیدا خوێندەوە! ویستم جامێك ئاوی بۆ بێنم، بەڵام دیار بوو پەلەی دەکردو خێرا وتی:

"ڕۆڵە، نەچوومە ماڵێ میری، بەڵکوو لەبری ماڵەوەی، بۆ دیوەخانەکەی باوکت چووم!" هەناسەیێکی قووڵی هەڵکێشا و دانیشت، بەڵام نەحەساوە، بەڵکوو یێکسەر هەستاوە و بە قورگی پڕ لە گریانەوە، وتی – "میری تیلەکۆم بینی، خەڵکێکی زۆر لە دیوەخانەکەی باوکتدا بوون." دیسان هەڵوەستەیێکی کرد تا هەناسە بدات – "چووم لەو شوێنە دانیشتم کە جێی باوکی خوالێخۆشبووت بوو. ڕاست لەو جێیە دانیشتم کە باوکت لێی دادەنیشت و پیاو ماقوولی هۆزەکەش لە دەوری کۆ دەبوونەوە. سەلامم لەهەمووان کرد، ئامادەبووان هەموو بۆ ڕیز لێنانم هەستانەوە و دانەنیشتنەوە تا من دانیشتم." دایکم کە قسەی دەکرد بە ئاستەم هەناسەی دەدا، "میریش وەك هەمووان لەبەرم هەستا، وتی:

"هەی! بەخێر هاتی، پووری؛ کارێکی چاکت کرد لێرە دانیشتی؛ ئەمە تەختەکەی مامەمە، باوکی مەلا محمدی." دڵنیای کردمەوە.

ئینجا منیش وتم – "ئێرە تەنیا لە تۆ دەوەشێتەوە، میرم." جا ویستی سوپاسم بکات لەبری ئەم ئاماژەیەم، بەڵام من بە شێوەیکی نامۆ، ئاماژەم بۆی کرد تا بێدەنگ بێتو قسە نەکات. حەپەسا، جوولەی نەما! هەرگیز خۆی لەم گۆشە تەنگەدا نەبینیبوو! لە هەڵوێستێکی ئاوا تەنگ نەکەوتووە و ئەزموونی نییە بزانێ چ بکاتو چ بڵێت! هەستامە پێوە و لێی چوومە پێشو هەندەی نەما بوو بە ورگی بکەوم کە ڕاوەستام. ئامادەبووانی دیوەخانەکە، دەملەقوچ مابوونەوە و چاوەڕێی جوولەی پاشتریان دەکرد تا

بزانن چ دەبێت. بەڵێ، ڕۆڵە، ڕوو بە ڕووی میر محمدی جاف وەستام و چەقیم. لە ڕاهی تۆ، ڕۆڵە، چەفیەی سەر سەری خۆم لادا. ئامادەبووان دەمیان بەسترا و چاویان لە مۆڵەق ما. دۆخەکە هێندە سەخت بوو وای لەهەمووان کرد کە بڵێی برووسك لێی داون! ئینجا ئەم قژە سپییەی خۆمم پەخش و بڵاو کرد.

" نا! دایە! نا!" قیژاندم.

"گەورە میری جافان، من بۆ ئەوە هاتووم داخوازییێکم لێت هەیە." بە محمدم ووت. میری جافان لە گەورەیی کارەساتەکە ودمی گرت و لەبەر دەستم، داهاتەوە؛ پاشان سەری خۆی بڵند کردو جەمانەکەی سەری خۆی کردەوە و سەرە ڕووتەکەی وەدەر خست و جەمەدانەکەی خۆی بەسەر سەرم دادا، قژە سپییەکەی داپۆشیم و هاواری لێ هەستا و گوتی –

"پووری! خواستەکەی تۆ بۆ من فەرمانە و جێبەجێ دەکرێت." ئینجا ویستی جەمەدانییەکەی لەسەر سەرم ڕێکبخات؛ من نەمهێشت، ناچار بە شێنەیی داوای لێکردم تا سەری خۆم داپۆشمەوە – "توخوا! پیرێ، قژت داپۆشەوە." جا داهاتەوەو دەستی ماچ کردم.

"میر!" وتم – "ئەم پرچە داناپۆشمەوە، با هەموو خورتێکی جافان ببینن!" ئاخێکم هەڵکێشا، پاشان وتم – "ئەم زوڵفەم هەر ئاوا دەمێنێتەوە تا گەورەی جافان خواستەکەم جێبەجێ نەکات دایناپۆشمەوە و با هەرچی هەیەو نییە، بزانن هاوسەری میری جافان زۆرداری لێکراوە؛ زۆردارەکەش میرە تازەکەی جافانە!" ئەمجا دەستم هەڵبڕی و پەنجەکانم بۆ میری درێژ کردو وتم – "میر محمد، مەلا محمدی بەگی جاف بە ئامۆزا، ئینجا بە کوڕی خۆتی پەسند بکە و منیش قژم دەشارمەوە؛ قژی ئامۆژنەکەت هەر وا ڕووت دەمێنێتەوە تا ئەو دەمەی پەیمانم پێدەدەی سارای کیژت بدەیە محمدی

کورِم." خواستەکەی خۆمم تێگەیاندن و ئاپۆرەی خەڵکەکەی ناو دیوەخان، دەمیان گیرا بوو؛ وەك ئەوەی کە عارەب دەڵێن (کأن علي رؤوسهم الطیر – وەك ئەوەبوون کە باڵندە لەسەر سەریان نیشتبێت)

"دایکە!" براگەورەوتی – "تۆ ئەمر دەکەیت، تۆ چت دەوێ ئەووت بۆ دەبێت، بەڵام خۆ منیش باوکی سارام؛ مەرج و خواستی خۆمم هەیە. هەموو باوکێك بەر لەوەی قایل ببێت کچەکەی بە شوو بدات، دەبێ دڵنیا بێت کە خواستی خۆی و کچەکەی فەراهەم ببن!" میر ئاشکرا و بێ پێچ و پەنا و زۆر پیاو دەرکەوت.

"میرم!" وتم – "ئەمەیان مافی رەوای خۆتانە،" ئینجا هەڵوەستەیێکم کردو هەناسەیێکی دڵنەوایيم هەڵکێشا و وتم – "فەرمانی جەنابتان چییە؟ فەرموو بخوازە و ئێمە 'ملمان لە موو باریکترە' لەبەرانبەر فەرمانەکانت."

"پورێ، جارێ قژی خۆت داپۆشە، سەرپۆشەکەت لەسەر دانێوە." میر لێی خواستم. ئینجا وتی – "دەمەوێ حەمە ببێنم."

"مافی خۆتە، رۆڵە، هەر ئێستا بچمەوە ماڵێ، مەلا محمد دەنێرمە لاتان." وەڵامی میرم داوە.

"دەی سەرپۆشەکەت داپۆشە، پوورەکەم." میر دیسان لێی خواستم.

"سوپاس میر، هەر ئێستا دەچمەوە و نایێڵم لە بەیانی ڕەت بدا، مەلا محمد لای تۆ دەبێت." ئەم قسانەم کردو وتم "'ئاسن سارده کوت ناکرێت'، هەموو خواستەکانت سەر سەر و سەر چاوانمانە." بەم قسانەی دایکم و بە پەیمانەکەی میری زۆر متمانەم هاتەوە بەر؛ گەیشتنە ئەم بڕیارە و پەیمانەکەی میر عەلی وەبیرم هاتەوە، کە ووتبووی – "مە لا محمد، هەموو خەرجی زەماوەندەکەت ئەرکی خۆمە." ئیتر جاجمەکەم بەسەر سەرمدا هەڵکێشا و خەونم بە بەیانییەوە دیت.

## دیداری میری

بەیانی پاشتر، بێ ئەوەی پشتەملی خۆم بخورێنم، زوو، هەستام و لە ماڵ دەرچووم و ڕاستەوخۆ بەرەو دیوەخانی گوندی چووم. میر محمد لەوێ نەبوو. ئیتر بەرەو ماڵیان شۆڕ بوومەوە و لە دەروازەی ماڵیان چوومە ژوورەوە و گەیشتمە باخی ماڵەکەیان. لەبەر دەگا ڕاوەستا بوو، ساراش لە تەنیشتییەوە بوو. هەرکە منی بینی، سارا زەردەخەنەیێکی گوڵئاسای بەسەر لێوەکانیدا هات. خونچەکان گەشانەوە، ئاسمان گەردی لێ نەما، شنەی با لە بەیانیانی پێشتر فێنکتر بوو. باڵندەکان دەنگیان لە جاران خۆشتر بوو. ماڵی میری لە جاران ڕووناکتر بوو. پڕ ئەمێد بوو!

"بڕۆ ژوورێ." میر فەرمانی بە سارای دا. ساراش بێ ئەوەی دەمی بجوولێت، لەو دیوی دەرگاوە لێم بزر بوو.

بەیانی باشم لە میر محمدی جاف کرد. ئەویش بە گەرمی وەڵامی دامەوە و داوای لێکردم دا بچینە ژوورەوە و خۆیشی بە پێشم کەوت بۆ دیوەخانی ماڵیان، چوو. کە چووینە ژوورێ، بینیم سارا لەناوەندی وەتاغەکە ڕاوەستابوو. چاوی لە دەمی باوکی بڕیبوو. هەستی خۆی ڕاگرتبوو تا بزانێت چ ووشەیێك لە نێوانی ئەم دوو لێوانە دەردەچنە دەرەوە و گوێمان لێیان دەبن. بەپێچەوانەی نەریتی کوردەواری، میری هۆزی تیلەکۆی خێڵی جافان نە خۆی دانیشت و نە لەمنی خواست تا دانیشم. بەدەستی ئاماژەی بۆ سارا کردو وتی:

"ئەمە سارایە."

"دەیناسم، ئامۆزا! پێش ماوەیێك كورتە قسەكردنێكیش لە نێوانماندا هەبووە." میرم دڵنیا كردەوە.

"پێیت ووتووە دەتەوێ بیخوازی و بیهێنیت؟" میر لێی پرسیم.

"بەڵێ، ئەمە ئەوپەڕ ئاواتمە، ئامۆزا، ناشمەوێ قسە بكەم نەكرابێت، بەڵێ لە سارام گەیاند كە ئاواتمە بیخوازم و شەرمەفمەند دەبم ئەگەر قایل بێت شووم پێبكات." ئەمە یێكەمجار بوو لەگەڵ ئاخاوتنەكەم زمانم پەركەمی گرت و قسەكانی باش بۆ نەدەهات.

"خوا ئاگادارت بێت!" میر وتی – "بەڵام دەبێ ئاگات لەوە بێت كە مارەیی سارا فرە زۆرو فرە گرانە، سارا گرانبەهایە." قسەكانی دووپات كردەوەو وتی – "ڕەنگە تۆ ئەو مارەییەت پێ نەدرێت!"

"من چاووم لەوەیە ئامۆزای میر بارم گران نەكات و منیش دووا چیلكە داری باخەكەمان دەفرۆشم بۆتانی دێنم." وتم:

"محمد، جیاوازییەكە ئا لێرەوە دەست پێدەكاتو پەیدا دەبێت." محمدی جاف وتی – "نەتبیستووە، دەڵێن 'برا برایە و كیسە جودایە!'" ئەو پەندەی وەبیر هێنامەوە تا وەبیرم بێنێتەوە كە لەگەڵ مندا یێك ناگرینەوە و دەبێ مارەیی سارا بدەم.

"من ڕوحی خۆم بە مارەیی پێشكێشی سارا خان دەكەم. ڕۆحی خۆم؛ لەمە پتر هەیە؟!" بە ڕژدییەوە ئەم هەستەی خۆمم دەربڕی، ئینجا وتم – "سەرباری باخەكەشمان، هەر پارچە زەوییێكی لە میراتی باوكم بۆمان ماوەتەوە، هەمووی پێشكێش دەكەم،" پاشتر هەر بۆ دڵنیا كردنەوەی وتم – "هەموو زانست و ژیری خۆم بۆ خزمەت و پێشفەچوونی ئەو تەرخان دەكەم، ئامۆزا!"

"هیچێك لەم قسانەت بە پۆلێك لێت ناکڕم!" یێکسەر وەڵامی دامەوە، ئینجا وتی – "کە من مردم، هەمووی بۆ خۆت دێتەوە."

"ئامۆزا!" بە خێرایی وتم تا سەرنجی بێنمەوە و دڵنیای بکەمەوە کە – " تەمەن درێژ دەبی، إن شاو الله، بە دوور و درێژی و راستو ڕەوانی دەنووسم کە هیچ مافێکم بەو موڵکانەوە نامێنێت و ئەوەی بۆ من بێت دەیبەخشمە منداڵەکانی تۆ جگە لە سارا؛ نابێت هیچ وەربگرێت."

"نا!" میر بە توندی وتی – "مارەییەکەی چەند پارچە زەوییێك نییە!" میر جەختی کردەوە.

"ئەی دەبێ چی بێت؟" پرسیم.

میری جافان گوێی لە پرسیارەکەم بوو؛ ئیتر هەناسەیێکی درێژی هەڵکێشا؛ سەیری ناو چاوانی کردم. پاشان پشتی لەمن کردو سەیری سارای کردو وتی – "ئەم خاتوونەی کچم، لەهەموو زەوی‌و زار باخ و بێستانی ئەم دەڤەرە بەهادارترە!" زۆر بە ڕژدی قسەی دەکرد، پشووییێکی دا و گوتی – "مارەیی سارا خانی کچم، بەرخم، جوانووێکە!"

"جوانووی چی، میرم؟" پرسیم – "باسی چی دەکەی؟"

"گوێت لێبێ،" میر بە توندی قسەی بۆ دەکردمو وتی – "تۆ لەم ئاواییە نەبووی؛ تۆ لە مەدرسەی فەقێیان دەتخوێند؛ خۆت فێر دەکردو ئاگات لێرە نەبوو کاتێك کە شەڕەنگێزانی ئەو عارەبە خێلەکییانەی عەشیرەتی ئال عوبێد، لەم چۆلەوانییانەی ناوچەی عوزەیم، غەزوەیان بۆ سەر موڵك و ماڵ و دەخڵ و دان و گوندی ئێمە، لە نزیك کفری، هێنا!" هەڵوەستەیێکی کردو هەناسەیێکی پڕ ئاخی هەڵکێشا.

"جا پەلاماری ئەو خێلەکییانە چ پەیوەندی بە خوازبێنی سارادا هەیە؟" پرسیم.

میر دەستی بە سمبێڵی خۆی داهێنا و قومێک ئاوی خواردەوە و دانیشت و سەرینێکی خستە بن ئەنیشکی و پاشان بە نەرمییەوە، وتی — "ئەوەی خواردیان ئەوا خواردیان، ئەوەی شکاندیان و تێکیاندا، بە بێ سوودی بۆ ئێمەیان جێهێشت ئەویتریشیان بە تاڵاند برد."

"ئامۆزا، خۆ من ئەو تاڵانەم نەبردووە و نە دزیوە و نە ئاگاشم لێی بووە!" بە توندی وتم .

میر خەمبار دیار بوو و لە خەمان هەناسەی لەبەر بڕابوو، پاشان بە سۆزەوە وتی — "ئەسپەکەی منیان بە تاڵان برد؛ ئەسپە شێی منیان بە تاڵان برد! نەتبیست؟" لێی پرسیم.

"نە بەخوا! ئەوەی من بیستم ئەوە بوو کە جوانوێکی ئێمەیان بردووە، نەك هی ئێوە!" وتم:

"هی تۆ یان هی من، جیاوازی نییە، ئێستا هی منە، بچۆ ئەو ئەسپەم بۆ بێنەوە، ئینجا ئەگەر توانیت بیهێنییەوە، ئەوە مارەیی سارا دەبێت و لەبەرانبەرتدا، ملم لە موو باریکتر دەبێت." میر زۆر ڕاست دیار بوو.

کە سارا گوێی لە خواستەکەی باوکی بوو، هاواری کردو گریا و گوتی — "نا، باوە، نا! بۆ مردن دەینێری؟" پاشان قیژاندی وتی — "ئامۆزای خۆت بۆم مردن مەنێرە! باوە، ئەو عارەبانە بێ بەزەیین؛ دەیکوژن!"

"دەنگت ببڕە!" میر بە سارای ووت و ئەویش بە خورتی توانی نزگرەکەی نەختێك نزمتر بکاتەوە.

منیش، بەسەر سڕمانێکەوە تەماشاییێکی سارام کردو وتم — "بەڵێ، ئەمر دەکەی، میر. پەیمان بێت ئەو ئەسپەت بۆ بگەڕێنمەوە!" میرم دڵنیا کردو سەیرێکی سارام کردو قەشەنگترین زەردەخەنەم بۆی پێشکێش کردو بۆ ماڵێ هاتمەوە.

هەرکە قەنتەرەی دەرگەی ماڵێمانم کردەوە، دایکمم دیت، لەسەر سەکۆی بەردەرگا، لەلای ژوورەوە دانیشتبوو؛ چاوەڕێم بوو و هەر کە منی بینیی، یێکسەر پرسیاری دیداری منو میری کردو وتی – "مزگێنیت پێیە؟! میر، بۆ تۆ، چ خەبەری خۆشی پێبوو؟" بە پڕ بە دڵ پرسی.

منیش هەقایەتی خۆم و میر محمدم بۆی گێڕاوە. کە گوێی لە خواستی میری بوو، ویستی هەستێتەوە، بەڵام پێی نەکرا و خۆی بە دیوارە نزیکەکەی لای خۆی گرت، ئینجا هەستا و ڕاوەستا. قسەکانم فرە بە توندی کاریان تێی کرد، خەریکبووم بڵێم ئەم پیرە بەگزادەیە خەریکە هاوزینگ دەدات! هەوڵم دا هێوری بکەمەوە، بەڵام وا دیار بوو توانای بەسەر ویستی خۆیدا نەما! نەیتوانی لە دەقی بابەتەکە، تێبگات. دانیشتەوە، هەستاوە، دیسان دانیشتەوە؛ هەردوو لەپی خستە سەر چاوەکانی و جوولەی لێبڕا! بێ ئەوەی بیر بکاتەوە، هاواری لێهەستا و وتی – "نا، نا! کورم، تۆ لەم پلانە فێزەوەنە ناگەی!" دانیشتەوە؛ کەوتە سەر چینچك، هەستاوە! ئینجا پرسیاری لێ کردمو وتی – "دەزانی بۆ دەخوازێ بچی؟ بۆچی لەم هەموو ماڵی دنیایە داوای ئەو جووانووە دەکات؟ ئەگەر پیاوە با خۆی بچێت بیهێنێتەوە، تۆ بە کوشت نەدا!"

"نا! بۆ دەکوژرێم؟" پرسیم.

"میر فەرمانی کوشتنی تۆی دەرکردووەو دەشیەوێ تۆ خۆت فەرمانە پیسەکەی ڕاپەڕێنیت!" ئەم قسانەی لەگەڵ نرکە توندەکانی ناو سێنەی تێکەڵی یێکتری ببوون، لەسەرەتادا وامزانی هەست بەوە ناکات کە چ دەڵێت، تا ئەو کاتەی دەنگی هەڵبڕی و وتی – "دەبێ تۆی خوێندەوار لە بنج و بنەوانی قسەکانی محمدی بگەیت؛ کورم، لە ڕاهی خودا، نەکەی بچی، ئەم

سەفەرە مەکە، ئەو ئەسپەشت نەوێ، حەمە چ دەکات؟ سارا لە کۆتاییدا هەر نسیبی خۆتە.

ئەو ئەعرابە خێڵەکییانە خودا ناناسن؛ ئەوەتا لەسەرەتای ئایەتی ٩٧ی سورەتی التوبە لە قورئان، خودا باسیان دەکات دەڵێت – ' ٱلْأَعْرَابُ أَشَدُّ كُفْرًا وَنِفَاقًا –ئەعرابەکان لەوانی تر کافرتر و دووڕووترن'." هەناسەیێکی توندی هەڵکێشا و وتی – "ڕۆڵە! لە ڕاهی خودا بکە و مەچۆ! ئەوانەی تۆیان بۆ ناویان دەنێرن، لە کوشتن بترازێ هیچی دیکە نازانن." دایکم بەم شێوەزارەی لێم پاڕاوە و ئەسرین بەناو لۆچەکانی سەر کولمە سوور هەڵگەڕاوەکەیدا دەچۆڕایەوە و هەر بە دەنگە پڕ گریانەکەیەوە، دیسان هاتەوە ئاخاوتن و وتی  "بەرخم! ئەو خەڵکەی لەو بیابانانەدا دەژین، لە پەلاماردانی خەڵکی بێدەسەڵات بترازێ، هیچی تر نازانن؛ هەر دەمانێکی بزانن ئێمە لاواز و دووبەرەی نارێکین، ئەوان دێن ئێمەمانان تاڵان دەکەن، دەمانکوژنو زەوییەکانمان داگیر دەکەنو خاوەنەکانیان دەردەکەن! ڕۆڵە! شەیتان دێت دەرس لەلای ئەوان دەخوێنێت!" خانمی جافان بە زمانێکی پاراو و بە دڵێکی شکاو و بە ورەیێکی داڕماو کۆششی دەکرد قایلم بکات تا بۆ ناو عارەبان نەچم؛ بەڵام لێدانی دڵ و قسەی لابەلا هەرگیز وەکوو یێکتر نابن! دایکم بنی زمانی دەخوێندمەوە، دەیزانی حەیرانم بۆ کێیە و نیشانەم لە چی گرتووە و وەرچەرخانەوەم مەحاڵە، بەڵام هەر وەبیری هێنامەوە کە ئەگەر ئەو عارەبانە بزانن من بۆ هێنانەوەی ئەم جوانووە ڕووم لە خێوەتگەی ئەوان کردووە، "بێگومان، ڕۆڵە، پارچە پارچەت دەکەنو دەرخواردی دڕندەکانی ئەو بیابانەت دەدەن!" قسەکانی دایکم بە دووا نەدەهاتن.

هەستم کرد دڵی دەیکوتا؛ وەك ئەوەی بوو ئەوا لەبەرچاوی ئەودا هەڵواسراوم؛ شمشێری ئەو عارەبانە خەریکە کەرت و پارچەم دەکات. جا ناچار بووم هەوڵ بدەم هێوری بکەمەوە و زەردەخەنەیێکم لەسەر لێوەکانم دروست کرد، لەوەتی هەمە زەردەخەنەی بەم ئەستەمەم بۆ نەهاتووە؛ ئینجا ئایەتی ٩٢ی لە سورەتی ئالی عیمرانم بۆی خوێندەوە کە دەفەموێت – "لَن تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا مِمَّا تُحِبُّون، وَمَا تُنفِقُوا مِن شَيْءٍ فَإِنَّ اللَّهَ بِهِ عَلِيمٌ – وەبیرم هێناوە کە – کرۆکی چاکەتان دەست ناکەوێت ئەگەر ئەوەی لەلاتان بەهادارەو خۆشەویستە، نەیبەخشن." کە ئەمەم خوێندەوە، ئیتر دایکم دەمی داخراو چیتر قسەی بۆ نەکرا، بەڵام هەر تا ماوەیێکی کورت بوو؛ پاشان دڵی دایك ئۆقرەی لێهەستا و فەرمووی:

"بە گوێی شەیتان مەکە، ڕۆڵە! مەهێڵە ئەم کارەساتە ڕاتهەژێنێت! جێ پێی خۆت خۆشکە ئینجا شەقاو بهاوێ. ئەم جافگەلە فرە کچی خاسیان هەس!" ئەمەیان دووا ئامۆژگاری دایکم بوو، ئیتر خۆم بۆ ئەنجامدانی ئەم سەرشێتییەی کە ڕەنگە ژیانم سەر و بن بکات، ساز و ئامادە کردو دوودڵیم بە لاوە نا و بڕیاری چوونم دا؛ چونکە دڵنیا بووم کە ناتوانم بەم ئامانجەم بگەم ئەگەر خۆم بەخت نەکەم! ئاخر دەڵێن مرۆڤ هەر جارێك دەژی؛ جا با بە پیاوەتی بژی و بۆ بەدەستهێنانی ئامانجی گەورە، قوربانی بدات؛ با گەورەش بێت. هەر ئەو بڕیارە بوو کە بەیانی پاشتر خۆری بە من ئاگادار کردەوە و هەستام و دەستی دایکمم ماچ کردو ئەویش دەستی لەسەر نیوچەوانم داناو هەندێ نزای بۆ کردمو ئایتولکورسی بۆ خوێندمو ئیتر سەرم بۆ ناو عارەبان هەڵگرت و دەرچووم، بەڵام هەر گوێم لێبوو کە دایکم لە خودا دەپاڕاوە و دەیگوت – "خواد بتپارێزێت؛ بە سەلامەتی بۆ هەمووان بگەڕێیەوە!"

من ئاواتم دەستنیشان و دیار بوو. دەبێ ئەم جووانووە بێنمەوە و ڕادەستی ڕێزدار میر محمدی بکەمەوە و ئەویش هەروەك پەیمانی داوە، دەبێت بە زاوای خۆی قەبوولم بکاتو سارا خانم پێشکێش بکات. ئاخر پیاو لە زمانیەوە بەند دەکرێت؛ بەڵام ڕەنگە و ئەگەریشە، لەم سەرشێتییەدا، تێبچم و هەرگیز بە ئاواتە ناسکەکەم، نەگەم! بەڵێ! ئەمە ژیانە، بۆ ئەوەی بە ئاوات بگەیت، دەبێت خۆتی بۆ ماندوو بکەیت. هیچ شتێك لەبەر چاووم ڕوون نەبوو کە بە مرادم دەگەم؛ بەڵام نەدەبوو کۆششی بۆ نەکەم و بە تەمای خودای لێیبگەڕێم؛ ئاخر خودای مەزن لە کەسی نەویستووە بە تەمای زاتی خودا واز لە ئیش و کارەکان بێنێت و تیلاکی لێ خوار بکاتو پاڵبداتەوە تا خودا کارەکانی بۆ فەراهەم دەکاتو ئەویش بێتو بە ئاسانی بەرهەمەکەی قووت بدات، بەڵکوو خودا پێمان دەڵێت مرۆڤ تەنیا ئەوەی دەست دەکەوێت کە بۆی دەگەڕێ! منیش وا بۆ ئەوە دەگەڕێم - سارا بەدەستم بکەوێت!

دوور کەوتمەوە بەڵام وێنای دایکم هەر لەناو مێشکم دەستی هەڵدەبڕی و سەیری ئاسمانی دەکردو لێوی دەجوولانەوە! جا وتم - "دایە! تکات لێدەکەم بەسە! هێندە خۆت نیگەران مەکە و ئەو هێندە ئاوەش بە گۆڕێ وەرمەکە و بە فیڕۆی مەدە؛ حەرامە ئاو بە فیڕۆ بدەیت و لەبەر خۆمەوە گوتم - "هەر جارەکی تۆ ئەم هێندە ئاوە بەو گۆڕە وەردەکەی بەو ئومێدەی ئیشەکەم بۆ ڕەها بێت، هەموو پلانەکانم سەر و بن دەبن‌و هیچیان تا ئێستا، لەبەر خاتری ئاوە ڕژاوەکانت، وەدی نەهاتووە!" بەڵام نە من ئەوم لێ دیار بوو نە ئەویش گوێی لە هوڕێنەکانی من بوو. ئیتر وەبیرم هاتەوە کە دووا جار گوتی - "خودا هاریکارت بێت."

## بنەگەی شەیتانی

گوندی ئەڤیندارەکەم بەجێهێشتو بە تاقی تەنیا ڕێی بیابانەکانی عوزمیمم گرت؛ ڕێگایێکی بێ شوێنەوار و پڕ لە تۆز و با و گەردەلوڵ بوو؛ پێت هەڵدەگرت، یێکسەر بە تەوژمی ئەو تۆز و بایەی ئەم ناوە، جێ پێیەکەم پڕ زیخ دەبووەوە و شوێنەکەی نەدەما تا شوێن هەلگرێك، پاشتر سوودی لێ وەربگرێت. وەك ئەوەی کە هەرگیز کەس بەم ناوەدا نەهابێت، وا بوو!

ئەو ناوە هیچی لێ نەبوو؛ ئەگەر دێمکەی ئاوەکەم نەبووایە، ڕەنگ بوو هەر ڕۆژێك بمتوانیبا بژیم و بە ڕێدا بڕۆم. لەو ڕێیە تاك و تەنیایەدا خۆم وەك عەلائەدین هاتە بەرچاو، کە لە چیرۆکی ئەلف لەیلە و لەیلە باسی دەکرێت، ئاخر زمانە عارەبییەکەی ئەو ئەفسانانە، هەر ئەوەتا عارەبییە، ئەگینا تا بڵێی بە زمانێکی عارەبی شڕ و شەپڕێو نووسراوەتە. لەگەڵ ئەمەشدا، ئومێدم خواست چرایەکەی عەلائەدینم بەدەستەوە با و لەپی خۆمم لێی بخشاندبایە و جنۆکەکەی ناوی وەدەر کەوتبا و بیگوتبا – "شُبێك، لُبێك، عبدٌ بێن ئیدێك! – چیتە! لە خزمەتتم، بەندەیێکم و لەبەر دەستتم!" ئیتر داوام لێی دەکرد بچێت و جوانووە ئەسپەکەم بۆ بهێنێتەوە.
ئای لەم هوڕێنەیە! بیابان ئاوای لێکردم! لەهەموو ژیانم هێندە گێڵانە بیرم نەکردووەتەوە؛ شتێك وەدەست بێنم بێی ئەوەی بۆی ماندوو ببم! نەبووە، مەگەر حەرام بێت!

دەبێ لەو جنۆکە گەورەیەی ناو ئەو چرایە گەورەتر بم؛ دەبێ تێبکۆشم تا ئەو پەڕ ئاواتی مەزنم بەدەست بێنم. ئیتر مێشکی خۆمم ڕاگرت؛ مێشکم مەیی! مەیاندم، نەمهێشت هیچ بیرۆکەیێکی تر پێیدا هەڵبگەڕێت. تەنیا سەیری ڕێی خۆمم دەکرد. شوێنی هەندێ پێی حوشتر و درندە، لێرەو لەوێ‌و جێ پێی مرۆڤی پێخاوسیش وەدەر دەکەوتن. ناوە ناوەش کەسێکم دەبینی دەهات یان دەچوو؛ سوار بوو یان بە پێ دەڕۆیشت. هەر کێم دەبینی پرسیاری خێوەتگە و دەڤەری ئال عوبێدم لێی دەکرد. کەسیان نەیگوت نازانم لەکام دەڤەرە؛ بەڵام هەر یێکە و بەرەو ئاستێکی دەناردم. ئەوەش ڕەنگە خەتای ئەوان کەسان نەبووبێت؛ چونکە ئال عوبێد گەڕیدە بوون. لەوەڕ لە کوێ هەبا، ئەوان دەچوونە ئەوێ. ناوە ناوەش کە لەڕێی کۆچ و هاتن و چوونیان، دەگەیشتنە بنەگەی خێلێکی تر، ئەگەر بیانزانیبا لەخۆیان بێهێزترن؛ مەگەر خودا بە هانای ئەو هەژارانەوە هاتبا، ئەگینا ئەوەی دەیانکوشت و لەناویان دەبرد و ئەوەی لە ماڵ و دارایی هەیانبا، هەموویان بە تاڵان دەبرد، تەنانەت کچ و ژنەکانیشیان بە کەنیزە دەبرد و دەیانفرۆشتنەوە. دوو ڕۆژ بوو لەو دەڤەرە وەك دێوانە دەگەڕام، تا لە کۆتاییدا بە ئاواتم گەیشتم و کەسێك ئاراستەی ڕاستی خێوەتگەی ئال عوبێدی کردم، کاتێك پێی گوتم – "ئێمە دوێنێ لەو ناوە دەگەڵیاندا بووین!" کابرایێکی ڕەشتاڵەی موو سیسی پێ پەتی، جوامێرانە، پێی وتم .

بەرەو خێوەتگەی عەشیرەتەکە شۆڕ بوومەوە. ڕۆژی پاشتر گەیشتمە ناو ڕەشماڵەکان. بەیانی زوو بوو. ڕاستەوخۆ ڕووم لە گەورەترین ڕەشماڵ کرد؛ چونکە لەبەر نوێیەتی و گەورەیی ڕەشماڵەکە، بە دیوانی شێخەکەیانم زانی. دوو پاسەوان ڕێیان لێگرتم! هەر یەکێکیان شمشێرێکی بە لاتەنیشتەوە

بوو. سەلامم لێیان کرد. بەڵام ئەوان بەر لەوەی وەڵامی سەلامی خودای بدەنەوە، منیان پشکنی، پاشان وەڵامەکەیان دامەوە.

"غەریبێك هاتووە! ئاوارەیەك ڕێی بزر کردووە!" یەکێکیان هاواری لێهەستا.

"ئاوارە و ڕوو لە عەشیرەتی ئێمە بکات! سەر چاوان! بە خێر هاتی! بە خێر هاتی!" دەنگێکی گڕ لەناو خێوەتەکەوە هات؛ زۆر بە گەرمی و پیاوانە، بە خێری هێنام. یاساوڵەکان ڕێگەیام بۆ چۆڵ کردم. کابرایێکی بە تەمەنی، تەنگە زلی، عەقال و چەفیەی سەری هەردووك نوێ بوون، لە ڕەشماڵەکە، دەرکەوت. لوتی لە ڕوخسارییەوە دوور کەوتبووەوە، وەك دەنووکی سیسارك بوو. چاوەکانی پتر لە چاوی باز دەچوون نەك هی پیاوێك بن. سمێڵی بەسەر هەردوو لای لێویدا شۆڕ ببووەوە، وەك ئەوەی دوو دەسکە کەرەووزی لە دەو نابێتو بەهەردوو لالێویدا داکشابوون،و لێوەکانیشی کەفیان گرتبوو. زۆر ڕیزی لێنام و دووبارە و سێبارە، بەخێر هاتنی کردم.

ئەم بە خێر هێنانە و ئەم ڕوو گەشییەی هانی دام تا مەبەستی ئەم سەفەرەی خۆمی بۆ ئاشکرا بکەم. جا پێش هەر قسەیێك خۆمم بە شێخی ناساند و بە عارەبییێکی فەسیح، نەك ئەو عارەبییە جلفییەی ئەو عەشیرەتانە قسەی پێدەکەن، وتم – "من مەلا محمدی جافم، بەم زووانە ئیجازەی مەلایەتیم وەرگرتووە و لەناو ئەم خێڵە عارەبییانە، لە شوێنێك دەگەڕێم، تا مەلایەتی تێدا بکەم. بۆیێش ئەم قسانە دەکەم چونکە بەو ئومێدەوە هاتوومە ئێرە، تا لەناو عەشیرەتی ئێوە ئەم مەلایەتییەم وەدەست بکەوێت."

هەر لە قسەکانم بوومەوە، شێخ ڕاستەوخۆ پرسیارێکی لێکردم و وتی – "تۆ کوردی؟" پرسیارەکە هێندە سەیر و نابەجێ بوو، وەك بەرد بەسەرمدا کەوت.

"ئا! جا ئەمە چ عەیبی هەیە، ئەگەر کورد بم؟" پرسیارەکەم وەك ئاگر لە دەمم پڕژا.

کابرا دایە قاقای پێکەنینێکی گاڵتەجاڕی و لەسەر تا بن تەماشای هەموو جەستەی کردم؛ ئینجا چاوەکانی لێ زەق کردمەوە؛ وەك ئەوەی بیەوێت ئاگرم تێبەربدات و بمسوتینێت؛ پاشان لچی خۆی شۆڕ کردەوە و سەیری هەردووك لای ڕاستو چەپی خۆی کردو ملی خۆی درێژ کردەوە و دەستی چەپی بۆ ڕەوانە کردم و وتی – "تۆ خۆت کوردی! عارەبی ئێمە نازانی و دەشتەوێ دەرسی دینی عارەبی، بە عارەب بڵێی؟ سەیرە!" ئیتر دەستی پێکرد، توانجی شڕ و بێ بنج و بنەوانی ئاراستە دەکردم. پاشان هەڵوەستەیێکی کردو پرسی – "تۆ عارەب نی، وایە؟"

"مەبەستت چییە، شێخ؟" پرسیم.

"تۆ کوردی، وانییە؟" دیسان پرسیارەکەی کردەوە.

"بەڵێ، وایە، شێخ!" وەڵامیم داوە.

"لە کوێوە هاتووی؟" پرسیاری کرد.

"لە گوندی زڕگوێز هاتوومە، گوندەکەمان نزیکی هەڵەبجەیە." وەڵامەکەم لە دڵی ئەو گران بوو.

"ئەرێ، ئایا پەسندە کابرایێکی ناعەرەب، لەو دوورەڕا، بێتو لێرە، لەناو عارەبان، دینی عارەبی فێری عارەب بکات؟ ئەمە لە کوێ بووە؟!" شێخ ئەم توانجانەی هەبوو؛ منیش هەستم کرد کە ئەم نەخوێندەوارە گاڵتە بە خۆی دەکات نەك بە من.

"شـێخ!" بـاگم کـرد تـا نەهێڵـ چـیتر بڵـێ و پێیـدا چـووم – "ئـەو عارەبییـەی مـن خوێندوومـە، ئـەو نـەحو و سـەرف و بەلاغـەت و قورئـانو حەدیس و شەرعەی من خوێندوومە و دەیانزانم، ئێوە هەتا مـردن ڕێـی پـێ نابەن." جەختم لە زانستەکانی خۆم کـردەوە، کـە خوێنـدوومنو بەڕاسـتیش دەیانزانم.

ئیتر شێخ نیزەیێکی توندی دامێ و پەندێکی عارەبیوەبیر هێنامـەوەو وتـی – "لە گەڕەکی ئاودێران، ئاو مەفرۆشە! کوردیلە! ئێمەی عارەب خـاوەنی دیـنی ئیسـلامین. کـارێکی نارێکـە کەسـێکی غـەیری عـارەب بێـتو ڕێساکانی عارەبیمان فێر بکات! ئێمە لە ئێوە چاکترین – وَأَنِّي فَضَّلْتُكُمْ عَلَي ٱلْعٰلَمِين."

لێرەوە، کار لە کار تـرازا، نەمهێشـت شـێخ بـە دڵـی خـۆی قسـە بکـاتو ناوی ئایەت لە ووتەیێك بنێ کە ئایەت نەبێت، جا وتم – "شێخ! ئەمـەی تـۆ ووتت ئایەتە، وەك ئەوەی تۆ خوێندتـەوە وا نییـە! ئـەم ئایەتـە سـەبارەت بـە عارەبیش نەهاتووە، بەڵکوو ئەمە سەبارەت بە جوولەکە هاتووە و دەفـەرمێت – "يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اذْكُرُوا نِعْمَتِيَ الَّتِي أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَنِّي فَضَّلْتُكُمْ عَلَي الْعَالَمِينَ.

ئەمە ئایـەتی ٤٧ی سورەتی البقرەیـە و بـە جوولـەکان دەڵێـت – ئـەی نـەوەی ئیسرائیلی، ئەو چاکەیەتان لە بیر بێت کە لـە گـەڵ ئێوەمـدا کـردووەو ئێـوەم لەهـەموو خـەڵکی پەسـندتر کـردووە." بـەم شـێوەیە دوو کـێلم بـە بـەردێك پەڕاند؛ یێکەم شێخم بە نەزان خستە ڕوو و دووەم زانایەتی خـۆمم بـۆ شـێخ و دەستەکەی پەسند کرد، پاشان وتم – "شێخ! هەموو ئایینەکان لـە خـوداوە هاتوونە و هی خودانە و کەس مـاڤی بەسـەریاندا نییـە و نابێـت؛ دینـەکان بـۆ هەموو ئینسانێکن و هی هیچ نەتەوە و باوەڕ و شێخ و ئاغایێك نینە!"

ئەم قسانەم شێخی لێ تووڕی کـردمو قیڕانـدی – "ئـەوە لەبەرانبـەری گەورەی خۆت ڕادەوەستی، کوردە؟!!" لەگەڵ قسەکردنیدا، وەك شـەیتان خـۆی

نواند و پێیدا چوو — "ئێمە مزگەوتەکانمان بۆ ئێوە بەجێهێشتووە؛ مزگەت هی ئێمە نییە و نابێت‌و منیش مەلاییێکم ناوێت بێت‌و لێرە خەڵکەکەم لێ گاڵ بدات و هاریان بکات!" و ئینجا فەرمانی پێدام هەرچی زووە لەناو ئەو خێوەتانەیان دەر بچم و نەمێنم.

"زۆر باشە، شێخ." وتم — "دەکرێ ڕۆژێک یان دوو ڕۆژ میوانی بەڕێزتان دەبم و پاشان بە خواتان دەسپێرم."

کە ئەم قسانەم کرد، شێخ گومانێکی زۆری لە لا پەیدا بوو؛ دەستی دا گۆچانەکەی و لە زەوی کوتا. پاش چەند جارێک گۆپاڵ لە زەوی کوتینەکەی، سەری هەڵبڕی‌و وتی — "گومانم هەیە تۆ، لەم دەڤەرەی ئێمەدا، لە مەلایەتی بگەڕێی! تۆ ئامانجێکت هەیەو بە دوایدا وێڵێت! بڵێ وا نییە؟" پرسی و نەشیهێشت وەڵامەکەی بدەمەوە کە وتی — "ئەگەر تۆ پێم نەبێژی بە دووای چیدا وێڵی، من پێت دەڵێم داوەکەت بۆ چ دانایتەوە و گوێت لێ بێت — ئەمە پەیمانە دەیدەم — من ئامادەم هاریکاریت بکەم تا بە ئامانجەکەت دەگەیت. بەڵام من تاکە مەرجێکم هەیە؛ ڕاست بە! ئەگەر نا، وات لێدەکەم ئاوات بخوازی کە بۆ سەر ئەم زەوییە نەهاتبای! بڵێ چی تۆی بۆ ئەم دەڤەرەی ئێمە هێنا؟ ووتت خەڵکی زڕگوێزی، وا نییە؟" پرسی و دووپاتی کردەوە.

لەو دەمیدا دڵنیا بووم هەڵەم کرد؛ نەدەبوو باسی گوندەکەمانی بۆ بکەم‌و پێی بڵێم من خەڵکی زڕگوێزم! بەڵام چونکە من زۆرم سەبارەت بە عارەب و نەریتەکانیان خوێندووەتەوە و دەزانم چەند ڕاستن چەند پابەندی پەیمانەکانیانن و ڕێز لە قسەکانی خۆیان دەگرن، بڕیارم دا کە هەموو ڕاستییەکی بۆ بدرکێنم! ناچار بووم متمانە بە شێخ عناد ئال عوبەید، سەرۆک عەشیرەتی ئال عوبەید، بکەم؛ زۆر کەس باسی ڕاستی پەیمانەکانی ئەم شێخەی کردووەو لە باسی دڵڕەقی و نەبووردەییش هەر بێهاوتا لەو ناوە

وەستاوە. بەڵام هەر ڕاست بووم و وتم - "بەڵێ، شێخ! من لە زڕگوێزەوە هاتووم؛ بە دوای ئەسپێکدا وێڵم، ئەو ئەسپەش، ئێوە لەمیانی گەڕان لە لەوەڕ بۆ ئاژەڵەکانتان، هاتنە نزیک دەڤەری زڕگوێز، لەناو جافان، چەند مانگێک لەوێدا مانەوە و پێش ئەوەی بگەڕێنەوە، پیاوەکانت دەستیان بە تاڵان و دزی کردو ئەم جووانووەش یێک لەو ماڵاتانە بوو کە کەوتە بەر دەستتان و هێناتان. ئومێدمە بە جوامێری خۆت بمدەیتەوە تا بیبەم وەك مارەیی بۆ سارا خانی ئەویندارەکەم بە باوکی ببەخشم؛ پێش ئەوەی ئەسپەکە بکەوێتە بەر دەستی ئێوە و بۆ ئێرەی بێنن، لە بنەڕەتدا هی ئێمە بوو."

تا ئەم قسانەم هەموو کرد، شێخ عناد ئال عوبێد فزەی لە زارییەوە نەهات. وەك بت لە شوێنی خۆی مەیی. وا هەستم کرد کە کفرم بە ئیمانی ئەو کردبێت؛ ڕومەتەکانی سوور داگەڕان. لێوەکانی دەلەرزین. هەموو جەستەی، تێکڕا، دەهەژاوە. وەك پنجە گیایێك بوو بای ئەم بیابانە لێی بدات. گۆچانەکەی بەدەستی ڕاستەوە گرتبوو، بۆیێ تا هێزی تێدا بوو، بەدەستی چەپی، شەقێکی لە ڕوومەتی لای ڕاستم دا؛ مەندیلەکەم، هێمای ئایینە پاکەکەم، کەوتە سەر زەوی.

داهاتمەوە تا مەندیلەکەم هەلگرمەوە، بەڵام دارودەستەکەی، بەو دوو پاسەوانەشیەوە، کە پێشتر ڕێیان لێ گرتبووم، نەیانهێلا مەندیلەکەم هەلگرمەوە! لەهەموو لایێکەوە شەق و زللە و شاپ و لەقە، بۆم هاتن. کەسێك نەبوو لەناویان نەختێك بەزەیی بە مندا بێتەوە و نەهێڵێت ئاوا بەم شێوەیە گەلەکۆم لێبکەن! شێخ ئەوەی بەدەمی دادەهات نەیدەگێڕاوە؛ جنێو نەما نەیلێت و بە منی نەدات؛ هەندێك جنێوی ئاوای پێدام کە تا ئەم چرکەیە، بە گوێمدا نەهاتبوون!

لـە کۆتاییـدا، ڕەخنـەی لـەو عارەبانـە گـرت کـە جـاری پێکـەم، کوردستانیان داگیر کردبوو و کوردیـان ناچار کردبوو ئایینەکەیان بگۆڕن و ئیسلام پەسـند بکـەن و وتـی – "ئەگـەر ئـەوان مرۆڤـی ڕشـید و نـەترس بوونایە، دەبوو هەموو ئەو مندالە جنۆکانە لەناو ببەن و نەهێڵن ئەمڕۆ بێن و داوای ئەسپ لە گەورەکانیان بکەنـەوە!" ئـەو هـەر خـەریك بـوو قسەکانی خۆی دەکردو دووبارەی نەدەکردنەوە، لەو کاتیشدا خزمـەتکارەکانی دەسـتیان لێم نەدەپاراست؛ ئیتر بوورامەوە و لە هۆش خۆم چووم! نـازانم چـەند سعات دارکارییـان کردبـووم‌و ناشـزانم چـەندە ئەشـکەنجەیان دابـووم‌و چـەندیش بێهۆش لەو ناوە کەوتبووم؛ بەڵام، کە چاوم هـەڵێنا، سـەیر ئـەوە بـوو منیـان سندم کردبوو. لە ژێر ڕەشماڵێك فڕێ درابووم؛ ژوورەکەی هەموو بە کا و بـە قەسەڵ داپۆشرابوو. هـەوڵم دا وەبـیرم بێتـەوە و بـزانم چیم بەسـەر هـاتووە! یێکسـەر نـەمتوانی هـەموو شـتێك یـاد بکەمـەوە! ژانـە سـەرم هـەبوو! ویسـتم سـەرم بجوولێنمـەوە؛ نـەمتوانی چـونکە ژانەکـەی فـرە تیـژ بـوو. ئـەرێ چـی قەوماوە؟ هەموو جەستەم وەك دارێکی وشکی لێهاتبوو؛ دەمارەکانی هـەر دوو لا کەلەکـەم وەك چـیلکەدار ڕاوەسـتابوون. چـیتر بـیرم نـەکردەوە و بیرەوەرییـەکانی خـۆمم ڕاگـرت. پاشـان هەسـتم کـرد کـە ئـال عوبەیـد منیـان بەند کردووە.

چـاوم هـەڵێنا؛ بـاوەڕم بـە چـاوەکانی خـۆم نـەکرد! ئـەوەی مـن دیـتم نـەدەبوو ڕاسـت بێـت! ئەسـپە بـە تاڵـان براوەکـەی، نیشـانی سـارا خـان، لـە قولینچـکەکەی ئـەولای ڕەشماڵەکـە، بەسـترابووەوە. نـۆ مـانگ پـتر بـوو ئـەم جوانـووەم نـە دیتبوو! ئـەو دەمـی سـەردانی زرگوێزم دەکـرد، بـردم بـۆ سـەر کانییەکەی هەورازی گونـدی‌و لـەوێ ئـاوم دا و هێنامـەوە و لـەناو تەویلەکـەی ماڵی خۆمان بەستامەوە؛ پاشتر، لە پایزەکەی، ئەم عارەبانەی شـێخ عنـاد، بـە

تالان بردبوویان. جووانووەکە ئەو جاری نەیهێشت سواری پشتی ببم؛ چونکە هێشتا پشتی نەکرابوو. ئەو کات زانیم هێشتا فرە بچووکە و تەمەنی لە ساڵێک کەمترە و بۆ سواری ناشێت!

"ئۆی! خودای گەورە!" بێ ئەوەی هەست بە هیچ بکەم، قیژاندم. هەوڵم دا بۆ لای ئەسپەکەم بچم؛ بەڵام قاچی چەپم بە دووامدا نەهات. وامزانی شکابوو، بەس ژانەکەی هی شکان نەبوو! جا دەستم برد تا بزانم چی بەسەردا هاتووە. کە دەستم گەیشتە هەورازی گۆزینگم، پەنجەکانم بە ئاسنێك کەوتن دەوری قاچی دابووم. ئاسنەکە زنجیرێکی لێ بەسترابوو و زنجیرەکەش بە تۆپێکی ئاسنەوە لکابوو؛ لەورە زانیم کە سندم کرابووم. لەبەرانبەری ئەسپەکەم منیان بەستابووەوە، تا پتر خەفەت بخۆم! لەبەرە خۆمەوە وتم – "ئەمانە ئەو ئەعرابانەن کە لە ئایەتی ٩٧ لە سورەتی التوبەدا، قورئان باسیان دەکاتو دەفەرمی – 'ٱلۡأَعۡرَابُ أَشَدُّ كُفۡرًا وَنِفَاقًا وَأَجۡدَرُ أَلَّا يَعۡلَمُواْ حُدُودَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ.' واتا – بەدەوییەکان کافرتر و دووڕووترن و باشترە ئەو سنوورانە نەزانن کە خودا بۆ پەیامبەری ناردووەتە خوارەوە و خودا زانا و دانایە." ئەم ئایەتەم، لەم دەمە، وەك هورێنە، لەبەرە خۆمەوە خوێندمەوە!

ئەستەم بوو ئەو سندمە لە قاچم داکەلێنم! وەك دیل بەسترابوومەوە. بەڵام هێشتا نەمتوانی ئەو سۆزە خامۆش بکەم کە لە ناخەوە بۆ جوانووەکەم هەڵیدا؛ جا تۆپە ئاسنەکەم بە دوای خۆمدا خشاند تا گەیشتمە دۆستە دیرینەکەم. کە بۆنی کردم، سەری خۆی ڕاشەقاند و تێیگەیاندم کە دەمناسێتەوە. لوتی بەسەرمدا هێنا و بۆنی کردمو حیلاندی! وەبیری هاتمەوە؛ لە بیریەتی کە جارێکیان ئاووم داوە. هەرکە حیلەی ئەسپەکە ئەو ناوەی تەنی، پاسەوانە عارەبەکان چوار دەوریان گرتین!

یەکیان بە هەموو توانا خۆیەوە شاپێکی لێدام و وتی – "لەم جوانووە دوور بە، هەی سەگی پیس، لێی دوور بە، با پیس نەبێت!" ئیتر جنێو جنێوی بە دوای خۆیدا ڕادەکێشا و زنجیرەی قسە ناشیرینەکانی نەپسانەوە تا لەقەیێکی تری لە هەناسەم گیر کردو دیسانەکە بوورامەوە و ئاگام لەخۆم نەما! کە بۆ جاری دووەمین، چاووم هەڵێنا، بینیم ئەسپەکە پاسەوانی لێدەکردم. هەوڵمدا، سەرم بڵندکەم؛ بەڵام وەك ئەوە بوو کە کەندوویك ئارد لەسەر سەرمدا بێت؛ سەرم بڵند نەبوو! ناچار، چاوەڕێ بووم تا بە تەواوەتی هاتمەوە هۆشی خۆم و چاوم کردەوە. زانیم فرە ئەشکەنجە درابووم؛ سندمەکە باوەشی لە قاچم دابوو، وەك دایکێك بوو منداڵەکەی لێ وون بووبێت و پاش ماوەیێکی زۆر دۆزیبێتییەوە؛ دەبێ هێندە غەریبی منی کردبێت! خۆ ئەم سندمە ماڵ وێرانە، پێشتر منی نەدیتبوو! دەتگوت گەرەکی بوو لە نزیك ئەسپەکە بمبەستێتەوە تا لێی دوور نەکەومەوە! گرانی خۆم هاوێشتە سەر هەردوو قۆڵەکانم، جا توانیم هەستمەوە و لە شوێنی خۆمەوە دانیشم. بیرم لە بار و دۆخی ئێستای خۆم کردەوە؛ خودایە هاوار! هەموو شتێك تێکەڵ و پێکەڵ بووەو سەرم گێژە، تاساوم! ئایا دەبێ منیش کار و بار و ئامانجی خۆم بەگوێرەی ئەم گۆڕانەی ڕوویداە بگۆڕم؟ بەڵێ، دەبیوا بکەم! بردنەوەی ئەسپەکە ئیتر ئەوپەڕ ئاواتم نەماوە! چۆن دەکرێ ئەسپەکە ئازاد بکەم، کەچی من خۆم ئازادیو ویست و دەسەڵاتم لێ زەوتکراوە و خۆیشم بندەست کراوم! من لەم بارەدا نیمە بتوانم بڕیار لە ئایندەی خۆم بدەم، چجا لە هی ئەسپەکەم! جا بڕیارم دا بەپێی پێویست ئامانجی خۆم بگۆڕم و وەدەستهێنانەوەی ئازادییەکەم خستە سەرووی هەموو ئاواتێکەوە! مرۆڤ ئەگەر ئازاد نەبێت، کۆیلەیە!

"هیچ مرۆڤێك وەك مرۆ نامینێت ئەگەر ئازادی لێ زەوت بکرێت."

لەبەرە خۆمەوە وتم و بڕیارم دا ڕێبازی کاری پێشینەم بگۆڕم؛ ئازاد بم ئینجا ئەسپەکە وەرگرمەوە! بەڵام بە بێ هیچ گومانێك ئازادی لەبەرایی هەموو کارێك دەبێت. ئەمە دوو بڕیار بوو، دام؛ هەستم کرد حەسامەوە؛ سەیری ئەم لا و ئەو لای خۆمم کرد، دیتم ئامانێکی پڕ شلە لە دووری شەقاوێك لێمەوە داندرابوو. هەرکە خواردنەکەم دیت، هەستم بە برسییەتییەکی زۆر کرد. دەستی خۆمم ڕەوان کردو قاپەکەم هێنا و هەموویم بە یێك فڕ خواردەوە. پاشان لە تامەکەی، زانیم شلە ساوار بوو و باش لێندرابوو، یان لەبەر برسییەتی ئەو هێندە خۆش هاتە ناو دەمم! هەرگیز پێشتر خواردنی هێندە خۆشم نەخواردبوو! دیار بوو برسییەتی شێتی کردبووم. خۆ تەنیا تیلکە نانێکیش دەتوانێت مرۆ لە مردن ڕزگار بکات.

ئەو سندمەی لە پێی من بوو، هاوشێوەی سندمەکەی قاچی پێشەوەی ئەسپەکەم بوو، لێ سەد دەر سەد نەبوو؛ کەچی منو ئەسپەکە سەد لە سەد هاوشێوەی یێکتر بووین! هەردووکمان ئازاد نەبووینو دیل و بندەست بووین. بەڵام سندمەکان پێچەوانەی هەردووکمان بوون؛ ئێمە شەیدای ئازادی بووین؛ سندمەکان ئازادییان لە ئێمە سەندبوو و کۆتبەندیان کردبووین؛ ئازادی ئێمەیان قۆرخ کردبوو؛ ئێمە بەند بووین. ویستی شێخیشیان لە بەندکردنی ئێمەدا، ڕەها و فەراهەم کردبوو! سەرباری ئەمەش، دوو بابەتی منو ئەسپەکەم لە یێکتر جودا بوون، ئەسپەکەیان بە تاڵان بۆ ئێرە هێنابوو؛ من بەپێی خۆم، هاوتبوومە ناو ئەم داوە و لێی گیرم ببووم!

وا پێدەچوو ئەسپەکە لە هەڵوێستی من تێگەیشتبێت؛ چونکە کە قسەم بۆ خۆم دەکرد، ئەویش هەر دەلووشی و هەندێ جاریك دەیحیلاند!

دەبێ ئەو برادەراتییە کۆنەی سەردەمانی جوانوویّتی لە بیر مابێت؟ ئەو سەردەمی هێشتا جوانووەکەم پشتی نەکرابوو و منیش هێشتا هەر فەقێی حوجرەکان بووم. هەر چۆنێك بێت، ئەوا هاوڕێیەتییەکەمان زیندوو بووەتەوە و لە جارانیش باشترە؛ بەڵێ شتی زۆری ژیانی هەردووکمان، هاوبەشە.

هەردووکمان لە هەمان گوند هاتبووینە ئەم دنیایە؛ منداڵیمان لەهەر هەمان گوند بوو؛ هەناسەمان بای یێك دەڤەری هەڵکێشاوە؛ لە هەمان کانی ئاومان خواردووەتەوە؛ تەنیا جیاوازی نێوانمان ئەوە بوو کە من بە کۆتك ئاوم دەخواردەوە، بەڵام ئەو ملی بۆ ناو کانییەکە درێژ دەکرد؛ ئەو ئاوەی ئەو ڕاستەوخۆ لە کانییەکە دەیخواردەوە، لەو ئاوەی من دەمخواردەوە خاوێنتر بوو؛ چونکە نە چڵکی کوندە و نە تۆزی کۆتکەکە و نە قرێژی دەستی کەسی پێوە نەنووسا بوو! هێشتا پەیوەندی منو ئەو ئەسپە ڕەسەنە لە ئەمانە هەموو پترە؛ ئێمە هەردووکمان دیلی دەستی شێخێکی عارەبانین، جوولەمان سنووردار کراوە و هەردووکیشمان لە بن هەمان ڕەشماڵدا دەژین و ڕەنگە ئەسپەکەش، وەك من، بە ئاواتەوە بێت، ڕۆژێك بۆ زێدی خۆی بگەڕێتەوە!

هەر جارەکی ئەسپەکە لوتی خۆی بە من دادەهێناو بۆنی دەکردم، من لە جاران خۆشترم دەویست. زۆر جاران بۆنی دەکردم، بە زمان و بە لوتی جەستەی دەسڕیمەوە؛ بەڵام هەرگیز بۆ جارێکیش بێزاری لە بۆنی ناخۆشی جەستەم نەکردو بێزی لێ نەکردم. منیش قامکم لەسەری ئەسپەکەم گیر دەکردو لە باوەشم دەگرت؛ ئەویش دەبۆرژا و لەسەر لا تەنیشتێکی پاڵدەکەوت! جا دەمزانی دەیەویست بخەوێت، ئیتر وەبیرم هاتەوە کە منیش خەوم دەهات، دایکم چیرۆکی مشك و پێشکەی بۆ دەگێڕامەوە تا خەوم

لێدەکەوت. مێشوولەکە خۆی ڕازاندەوە و ناوی خۆی گۆڕی و بانگت نەکردبا (نازێ) وەڵامی کەسی نەدەداوە و بە فیزەوە چووە (شاری شوو کردن)؛ ئای کە خۆش بوو! چەندین جاران گوێم لێی دەبوو هەندە پتر دەمویست دایکم دووبارەی بکاتەوە، ئیتر ئەویش هەر جارە و بە چەشنێك بۆی دگێڕامەوە کە لە جاری پێشتر خۆشتر بوو! لەو هەقایەتەی دایکم فێر بووم کە هەموو کەسێك دەبێت کەم و زۆر هاوکار و هاریکاری دۆست برادەرو ناسیارەکانی بێتو نابێت خۆی ئومێدبڕ بکات. هەندێ جاران ئەو چیرۆکەم بۆ ئەسپەکە دەگێڕاوە، بەو نیازەی کە بزانێت من ئاگام لێیەتی و گەرەکمە هەست بە تەنیایی نەکات و بێزار نەبێتو بحەسێتەوە و بخەوێت. ئەسپەکە گوێی لێ ڕادەگرتم. سەری بۆ هەقایەتەکانم دەلەقاندەوە. دەبێ لەم چیرۆکانەم تێگەیشتبێت؟ جارێکیان، بەڕاستی هەستم پێکرد کە خەریك بوو دەگریا، لێم پاڕاوە تا سندمەکەی لە پێ بکەمەوە و پڕماندی — (ئازادم بکە! هاوڕێ! ئازادم بکە!) وەك مرۆڤ قسەی کرد — (ئازاری ئەم زیندانە خەریکە کانی و جۆباری زڕگوێزم لە بیر دەباتەوە!)

منیش لێم پرسی —"ئەرێ، هاوڕێ! دەبێ ئەو ڕۆژە بێت لەم زیندانە ئازاد ببین و دەربچین؟ ئەسپە شێ، ئایا ئەم ئاواتەمان بەدی دێت."

کە ئەسپە ڕەسەنەکە گوێی لەم قسانەم بوو، چاوەکانی، وەك بڵێی، تژی ڕۆندك بوون، ڕوخساریشی گرژ داگەڕا و منیش ئەمەم وەك هێمایێك وەرگرت کە جەختی خواستەکەی من دەکاتەوە و ڕژدە لە یارمەتیدانم. جا هەردووکمان، لە دڵڕا، ئومێدمان بە یێکتر پەیدا بوو، ئاخر هێشتا دڵی هەردوولامان هەر ترپەیان دەهات و هەر زیندوو بووین! بۆیێ دەڵێم زیندووبووین چونکە ئومێدمان هەبوو!

"هاوڕێ، بزانە!" سەرنجی ئەسپەکەم بۆ خەیاڵی خۆم ڕاکێشا و وتم – "بەیانییەکی زوو لە خەو ڕادەبم، پەقرەجێك ئاوی ساردی کانیاوەکەی زرگوێزت بۆ دێنم؛ لە بیرتە؟ ئەو ئاوە فێنکترین و پاکترین ئاوی سەر ڕووی ئەم زەمینە بوو، ئێمە دەمانخواردەوە؟ ئاوەکەت بۆ دێنم و لە پێشت دایدەنێم و فیکە فیکت بۆ دەکەم تا بیخۆیتەوە! کە تێنوێتییەکەت شکا، سەرت بەرز دەکەیەوە و بە توندی ڕایدەشەقێنی تا هەموو دڵۆپە ئاوەکان لە سمێڵت دەبنەوە. پاشان سەیری ناو چاوەکانم دەکەی، تەماشاکردنەکەت هێمایێکی سوپاسگوزارییە پێشکێشی منی دەکەیت. ئەسپی ڕەسەن بە بایەخەوە سەرنجی ئەو کەسە دەدات کە یارمەتی داوە. بەڵام ئەوەی من بۆتۆی دەکەم هیچ بۆ ئەوە نییە سوپاسم بکەی؛ هاوڕێیەتیت بۆ من ئەوپەڕی سوپاسە." هەڵوەستەیێکم لە قسەکان کردو پشووێکم خواردەوە. ئینجا بە نۆرە، نۆرەی ئەسپەکە بوو باسی دڵی خۆیم بۆ بگێڕێتەوە.

"ئەهاهە!" ئەسپەکە حیلاندی – "بۆ ئەمانەم بە بیر دێنییەوە کە بۆ منت کردوونە؟" ئەسپەکە چاوەکانی خۆی داخستن و وتی – "ئایا بۆ هەموو ئەو شوێنانەی بۆیان دەڕۆیشتی، من لەگەڵت نەدەهاتم و هاوڕێیەتیم نەدەکردی؟ هاوڕێکەت بووم؛ بەڵام خۆ نەمدەهێشت سواری پشتم ببی! ها، ها! لەم دنیایەدا هیچ شتێك بە خۆڕایی نییە؛ ژیان بریتییە لە دان و وەرگرتن. هەرگیز ئەوەم بە بیر مەهێنەوە کە بۆ منت کردووە، مەلا!" ئەو قسانەی ئەسپەکە کردیانی سیوادیان بردم. هەستم کرد ماندوو و شەکەتم، ئیتر کپ بووم و بەناو هەناوی خۆمەوە داهاتمەوە.

"ئای لەم شەرمەزارییە!" ئینجا هەڵوەستەیێکم کردو ڤیت بوومەوەو وتم - "پەیمانت دەدەمێ ئازادت بکەم. دەزانی بۆ مکوڕم کە ئازادت بکەم؟" پرسیم و هەر خۆم وەڵامم داوە و وتم - "ئازادی تۆ مارەیی ئەڤیندارەکەمە! بەڵێ، ئازادی تۆ یێکسانە بە ژینی سارا و ژیانی خۆم و هەر دەبێ بیبەمەوە؛ دەبێ سارا خانی پەریزادەکەم لەسەر تەختی دڵم دابنیشێت، ئینجا دەحەسێمەوە!"

## ئەو دەنگەی لە ڕێیەندەکان دەربازبوو

یێکەم شەوی ناو ڕەشماڵە زیندانەکەی بیابان، نە دەبڕاوە؛ درێژ بوو، ڕاکشا! کازیوەش وەك پێشان نەبوو؛ درەنگ هەناسەی بە زەوی دا! هێندە هێواش بوو، وامزانی ئیتر جارێکی دیکە نایێتەوە! خەو چاوەکانی دەترووکاندم، بەڵام نەیدەهێشت بخەوێت. بۆرژام! گوێم لە دایکم بوو، لایلایەی بۆ دەلاواندمەوە! ماندوێتیم لە یاد نەما! نەختێك هوشیار بوومەوە.

بەیانی دا؛ مۆزیقاییێکی ڕەسەنی بێهاوتا بوو! قارەی مەڕ و قیرەی مریشك و بۆڕەی مانگا و جریوەی باڵندەکان خەونی زرگوێزیان بۆ دەگێڕامەوە! تەنیا دەنگی کەسەکان وەك مرۆیەکانی ئێمە نەبوو! ژیانم فانتازیاییێکی شێواو بوو؛ لە دوێنێوە دەستی پێکردبوو و ئەمرۆش هەر دەنگی دەداوە! ئاوازی بەیانی بوو؛ بەڵام وەك ئەوەی لای ئێمە خۆش‌و بە پێز نەبوو؛ خڕەی قورگی وشتر و (یەوەل – یەوەل)و وەلەکە عارەبان، دنیایان لەمن هەژاند.

ئیتر خەیاڵە پڵاوەکانم سڕانەوە و بۆ ناو دەستەی خێلە ڕەسەنەکەی ئەعرابەکان هاتمەوە؛ ڕاستییەکی تاڵ بوو! لەم دەمەدا غەریبی قیقەی بۆقەکانی لێواری جۆگەی زرگوێزم کرد؛ لەوێ زیقەی باڵندەکان وەك ئەوانەی ئێرە نەبوو؛ لەوێ دەنگەکان تێکەڵی یێکتری دەبوون‌و ئاوازێکی ئاسمانییان پەیدا دەکرد کە مرۆڤی دەژیاندەوە. هەستم کرد ئەم بیابانە لەو

بەهەشتەی زڕگوێزی دابڕاندووم؛ تەنیا هەر غەریبی نقەی بۆق و بوغەی کۆتر و گارەی مریشك و قاڕەی بەرخ و حەپەی سەگ و گیزەی ڕەشەبایەکەی ناکەم، بەڵکوو من شەیدای پاك و خاوێنی سەر تا پای ئەو مۆزیقا خواوەندانەی ئەو گوندەم! هەستم کرد بیابان منی لەو جوانییە دوور نەخستووەتەوە؛ بەڵکوو شێخەکەی ئەم ناوە، بەربەستی لە پێش گەڕانەوەم چەسپاندووە و ئەو هەموو هات و نەهات و بێنەو بەردەیە هی من نەبووەو نییە!

بەربەستەکان گەورە بوون؛ ئەوەتا منیان لە زیندان گیر کردووە؛ بەربەستەکان وەك ئەوان بەربەستانەی زڕگوێزەکەمان نەبوون! بۆنی ئەو تۆزبەندانەی ئێرە نا وەك بۆنی گوڵستانی خۆمان بوو! خۆزگەم خواست ئاوام بەسەریدا نەهاتبا! دەنگی بە یێکتر کەوتنی لچکەکانی دەری خێوەتەکە، هەرچەندە ئومێدێکی ئازادبوونیان پێدەبەخشیم، بەڵام هێشتا هەر وەك دەنگی لێکخشانی شمشێرەکان بوو و وا پێدەچوو لە ناخ گۆشتی سەر ئێسقانەکانم شتر دەبوون!

خودا ئەو دڵەی بە من نەداوە ڕقی لە کەس ببێتەوە؛ بەڵام ئێستا هەست دەکەم ڕق و کینە خەریکن لەناو مێشکمدا ترووسکە دەدەن! بەڵێ ڕقم لە سندم و ئەم خێوەتە بوو کە منیان گەمارۆ دابوو و نەیاندەهێشت تێر سەیری ڕووناکی ئەم دنیایە بکەم! هەردووکیان ئازادییان لێ پەردەپۆش کردبووم! ڕۆژان ڕۆژیان بە دووادا هاتن و حەفتە کڵاوی لەسەری حەفتەی پاش خۆی کردو نەبڕانەوە و مانگی دووەمیش بێ فەرمان وەرگرتن، خۆی خزاندە ناو ڕەشماڵە زیندانەکەم! هەر ڕۆژێك لەناو ئەم زیندانەدا ڕەت دەبوو، پتر ورەی دادڕماندم؛ هیچ شتێك لەم دەور و پشتەم تامی نەما؛ تەنانەت دڵداریش، وەك پێشان، تامەزرۆیی نەمابوو! زەمان مۆری لە باوەڕ

دام؛ ناچاری کردم شتی وا بکەم پێشتر هەرگیز نەمکردبوو. خۆمم ناچار کرد ببمە هاوڕێی پاسەوانی خێوەتەکەمان! بوومە دۆستی نزیکی ئەو ئافرەتەی کە خزمەتی منو ئەسپەکەی دەکردین و وامکرد هەموویان بوونە هاوڕێم! هێندە کاریگەریم لەسەر ئەو کەسایەتییە هەژارانە هەبوو، تا گەیشتە ئەو ڕادەیەی گوێیان لە ڕێنماییەکانم دەگرتو متمانەیان پێکردم! فێری نوێژم کردن! جارێکیان یاساوڵەکە لێی پرسیم:

"شیخ، إنت ما تکرهني؟ واتا – شێخ، ئایا ڕقت لەمن نابێتەوە؟" پاش پرسیارەکەی سەری خۆی نەوی کرد.

"خودا ڕەحمی بە من کردووە؛ من ڕقم لە کەس نابێتەوە،" ئەم وەڵامەی کابرای پاسەوانم دایەوە و تێیم گەیاند کە ڕق لێبوونەوە شێرپەنجەیێکە بەزەیی مرۆڤ دەتوێنێتەوە و لەناوی دەبات.

"ئاخر، ئاخر، ئەوەتا من زیندانیم کردووی؛ ڕێم لێت گرتووە و ئازادیم لێت زەوت کردووە!" کابرا بە شەرمەوە گوتی:

"برا! تۆ بەرفەرمانی شێخ عنادی،" بۆیم ڕوون کردەوە.

"أی والله صدگت! – ئا، بەخوا ڕاست دەکەی!" پاسەوانەکەم وتی.

"ئەگەر تۆش ئەم فەرمانە جێبەجێ نەکەی، خۆ کەسێکی دیکە هەر دێت و ئینجا خودا خۆی دەزانێت چۆن پیاوێك دەبێتو چۆن بەرزەوتم دەکات! هەڵسوکەوتی تۆ لەگەڵ من، جوامێرانەیە و ڕیز لە بار و زانیاری من دەگریت؛ خودا پاداشتی چاکت بداتەوە!" کە ئەم کابرایە گوێی لە قسەکانی من بوو، خەریکبوو دەستی بۆ سندمەکەم ببات ئازادم بکات؛ بەڵام، لە ناخی ئەم پاسەوانە، ئەرك لە ڕیز باشتر چەسپا بوو؛ ئیتر کارەکەی نەکرد.

پاسەوانەکە سوور هەڵگەڕا و سوپاسی کردم. پەیوەندییەکانمان هێندە پەرەی سەند تا ئەو ڕادەیەی وامزانی هاوڕێیەتییەکەمان لەبەربەستەکان

پەسندتر و قووڵترە و بەسەر ڕەگەز و ڕێنما خێڵەکییەکاندا زاڵ بووە. ئاخر، بە ڕواڵەت، برادەرەیەتییەکەمان هاوشێوەی نەبوو! ئیتر متمانەی پێکردم و خەریکبوو باسی تاڵان و پەلامارەکانی خۆی و هاوخێڵەکانی بۆ سەر گوندی هۆزەکانی دیکەی دەکرد. باسی ئەوینی خۆی بۆ گێڕامەوە. باسی لەوەڕاندنی ووشترەکانی بۆ کردم. جارێکیان باسی ڕێگرییەکانی خۆی بۆ گێڕامەوە و وتی – "ڕێگریمان کرد؛ کاروانەکانمان تاڵان کرد؛ پیاومان کوشتن و مێیینەکانیشمان هێنان و کردمانن کەنیزك و هەندێکیشمان فرۆشتنەوە." کابرای پاسەوان وتی و بەم چەشنە سەرەڕۆییەکانی خۆی و تیرەزەدەکەی دەگێڕاوەو باسی پاڵەوانێتی و نەترسی ئەوانی دەکرد! پتر خۆی هەڵدەکێشا، نەوەك ڕاست بڵێ؛ هەندێك لە قسەکانی لە دوورەوە دیار بوون کە درۆنە و دەیانکات و خۆی پێیانەوە گەورە دەکات. ئەو هەموو سەربردەی ئازایەتیی ئەو گێڕایەوە، هانی دام تا دەربارەی چیرۆکێکی تەماوی، لە پەنای پەردەی سەر دەرگاکەوە، لێی بپرسم:

"دییا!" بانگم کرد.

"ها!" وەڵامی دامەوە.

"باسی ئەم جووانووەم بۆ بگێڕەوە کە ئێوە لەناو جافان تاڵانتان کردو هێناتان؛ چۆن دەستتان بەم جووانووە ڕەسەنە گەیشت و تاڵانتان کرد؟" پرسیارم کرد.

"بۆچ دەتەوێ ئەم باسە بزانی؟" بە تووڕەییەوە وەڵامی داوە.

"بە راستو دروستی، من بۆ ئەوە هاتبووم لە شێخ عناد بخوازم تا ئەم ئەسپەم بداتەوە،" و ئیتر بۆ دییای پاسەوانم باس کرد کە ئەسپەکە مارەیی خۆشەویستەکەمە؛ سارای کچی میری جافان و – "میر خۆی پەیمانی پێدام، ئەگەر ئەم ئەسپەی بۆ ببەمەوە، ئەوە دەبێتە مارەیی کچەکەی."

دییا کە زانی من بە شێخم ووتووە بۆ هاتوومە ئێرە؛ ئیتر هێوەر بووەوە و هاتەوە سەر دۆخی ئاسایی خۆی و سەری لە نێوان هەردوو لاچکە دەرییەکەی خێوەتەکەوە هێنا ژوورەوە و کە منی دیت، پێکەنی و وتی — "ئێی؟ هەی ڕاوچی خراپ! هەر زیندانییەك خەونێکی تایبەتی خۆی هەیەو لە خەودا دەیبینێت؛ بەڵام بە زۆری ئەو خەونانە دەگەڵ خەونبینەکان دەشرێنەوە!" پاسەوانەکە ئەمەی ووت و لە قاقای پێکەنینی دا؛ ددانە زەردەکانی لە بن سمێلییەوە بە دەر کەوتن؛ پاشان کە پێکەنینەکەی نەما، ئیتر سمێڵەکەی وەك دەرگەی ڕەشماڵەکە دەمی داگرتەوە و سەری لە کەلێنی دەرگاکە بردە دەرەوە و بزر بوو.

تەماشای دەور و پشتی خۆمم کرد، ڕەشماڵێکی تۆزاوی چۆل، لەسەر چوار ئەستوونی خوار ڕاوەستابوو، زبڵ و پاشماوەی وڵاخ نیوەی ڕووبەرەکەی داپۆشیبوو، لە نیوەکەی دیکەدا، دۆشەکێك لە قەسەڵ دروست کرابوو، تا کەسێك لەسەری بنوێت. زۆر جاران لە قرچەقرچی شکانی ئەو قەسەڵانە بە ئاگا دەهاتم، دیار بوو ئەسپەکە دەیجوی. لە دوو مانگ پتر، لەناو ئەو ئاژاوەیەی بن ڕەشماڵەکە مامەوە؛ دەنگە ناسازەکانی ئەو ئاژەڵانەی لە دەرەوە بوون، هەرگیز نەدەبڕانەوە.

تا ڕۆژێکیان دەنگێکم وەبەر گوێ کەوت! ئەو دەنگە لەگەڵ هەموو ئەو دەنگانەدا نەدەگونجا کە هەمیشە دەهاتن و نەدەوەستان؛ دەنگەکە لەم ناوە نامۆ بوو؛ بەڵام لەلای منەوە ئاوازی خواوەندانەی ژیانەوە بوو! بە هەموو تەمەنم ئەم سۆزەم لەهیچ دەنگێك نەبیستووە؛ لەهەموو ئەو ئاوازانە شیرینتر بوو کە لەم چەند مانگی بن ئەم ڕەشماڵە تا ئەمرۆ گوێم لێیان بووە! زەوی دەنگی ئاوا خۆشی لەسەر نەبیستراوە! هەستی خۆمم ڕاگرت ؛ گوێم لێبوو دەنگەکە هاواری خودای دەکرد؛ ئەم دەنگە زۆر ئاشنایە؛ بەڵام ئەمە

ناگونجێت!! با بزانم! ئیتر لەبەرە خۆمەوە وتم – "ئەی خودا! ئەی خودایە هاوار! دەبێ ئەمە خەون نەبێت؟" دەنگەکە هی ئافرەتێك بوو؛ هاواری دەکرد تا کەسێك بە هاوارییەوە بێت. هەستی خۆمم ڕاگرت! ئەم دەنگە لە ئاسمانەوە دێت! بەڵام چۆن ئەو دەنگە بە گوێچکەکانی من دەگات؟؟؟ ئەی خودا هاوار! جاری دووەمیش گوێم لە هەمان دەنگ بوو؛ ئەمجارە دەنگەکە هەقیقەت بوو، ڕاست بوو، هزرکار نەبوو! ڕابردوو و ئێستا و ئایندە لێم تێکەڵ و پێکەڵ بوون! خودایە! خودایە! هاوار! سەبر و قەرارم نەماو پڕ بە دەم هاوارم کرد – "دایە! دایــــە!"

ئەویش دەنگەکەی ناسیمەوە و هاوارە وەڵامێکی دامەوە و زیڕاندی – "هۆ حەمە! دایکم بەڵاگێڕت بێت!" ئەمەی ووت و نەیزانی چ بکات و بۆ کامە لا ڕابکات، تا دیسان گوێی لە دەنگم بووەوە، ئیتر بۆ لای دەنگەوە هات. ئەم پیرە کەنەفتە زەماندیدە، لەم هەڵوێستەدا سەری لێ شێوا بوو! نەیدەزانی بەڕاستی بۆ کام لا بچێت! وەك فرفرۆکە بە دەورەی خۆیدا دەسووڕاوە!

تۆپە ئاسنەکەم هێندە بە توندی و بە خێرایی بە دووای خۆمدا ڕاکێشا، هێندەی نەمابوو قاچی چەپەم بپچڕێنێت؛ بەڵام لە کۆتاییدا توانیم بگەمە ئەو کەلێنەی دەرگەی ڕەشماڵەکە. دایکم گەیشتبووە نزیکی ئەوێ. مێشکم ڕاوەستا! خۆشی و ناخۆشی تێکەڵی یەکتری بوون؛ زمانم پەلبوو! مێشکم تەزی! بەڵام هێشتاکە هەستم بزۆز و زیندوو بوو! ڕەچاوی ئەو کاتەی دەکرد کە دایکم لە باوەش بگرم! چرکەیێکی نەبرد کە هەموو هۆش و هەستم پارسەنگ بوونەوە و بانگی دایکمم کردەوە و وتم – "دایە! دایــــە! ئەوەتا، لێرەمە! لەناو ئەو ڕەشماڵەی پشتی تۆمە!" ئارامم لێبڕا؛ ئاگرم تێبەربوو!

پیرەژنەکە وەك زەرنەقوتە بە دەوری خۆیدا خولی دەخواردەوە. کە هێندە لە نزیکەوە گوێی لە دەنگم بوو، حەپەسا و بۆ چرکەیێك دەنگی نەما. لە کۆتاییدا لەبەرانبەری دەری ڕەشماڵەکە وەستا کە سەرم لەناوەندی هەردوو لا پەردەکانی دەرگەی ڕەشماڵ چووە دەرەوە، منی بینی. ئینجا دەستی ڕاستەم لە پەنا پەردەکەوە دەرهێنا و چاوم بە دایکم کەوت! ئەویش منی بینی، ئیتر وەك بلێی باڵی گرت و بە ڕاکردن بۆ لای من هات. پاسەوانەکە نەیهێشت دەستمان بە یێکتری بگەن! شمشیرەکەی گەیاندە سینەی دایکم و ناچاری کرد بوەستێ. کە ئەوی ڕاگرت، من هاوارم کرد — "دییا! ئەمە دایکمە، دایکمە!" بەڵام هاوارەکانم نەگەیشتنە ئاسمان و بزر بوون. سۆزی دایکایەتی لە ترسی شمشیرەکە باڵاتر بوو و ترسەکەی ڕەواندەوە. سینەی دایکم و تیخە تیژەکەی ئەو چەکە ڕکابەرییان بوو؛ پیاوەتی لەم ناوە بێ بایەخ مابووەوە! ئیتر تێنەگەیشتم، چ باسە و چ هەرایە؛ ناچار هاوارم کرد — "دییا، پیاو بە شمشیرەکەی لەسەر سینەی ئەو پیرێژنە لادە، کورە دەیکوژی!" ئیتر من هاوارم پێنەماو دایکیشم توانای نەما چیتر بەرهەڵستی نێزەی ئەو چەکە بگری و لە شوێنی خۆی، دانیشت. هەردووك ناو لەپی لەسەر چاوەکانی دانا. هەموو جەستەکەی وەك قەمیشی ناو ئاو دەلەریەوە. قژە زیوەکەی لە ژێر پەشمەی دەرکەوت. دایکم ئاگای لەوە نەمابوو کە سەرپۆشەکەی داپۆشێتەوە. ناچار دیسان هاوارم کردەوە — "دایە! سەرت داپۆشەوە." ئەویش سەرپۆشەکەی ڕێکخستەوە و پرچی دیار نەماو وە بن سەرپۆشەکە کەوت. دەستی لەسەر چاوەکانی لادا. سەری هەڵبڕی، چاوی دەگێڕا، کاشکا من ببینێ. گوێی بەو دوو پاسەوانانە نەدا کە لەهەردووك لایەوە وەستابوون و تیخی شمشیرەکانیان لەسەر جەستەی دایکم دانابوو. ماوەیێکی باشی پێچوو تا شێخ عناد سەری دەرهێنا و بۆ لای دایکم هات.

لە نزیکی وەستا و پێی ووت – "پیرێ ژن! بلێ، چیت دەوێ؟" بەڵام چونکە دایکم ئەو زمانە جلفییەی نەدەزانی و لەو تەنگاوییەشدا بوو، لە شێخ نەگەیشت و وەڵامی نەداوە. ئەو وەڵام نەدانەوەشی شێخی تووڕە کردو هاواری بەسەر دایکمدا کردو وتی – "لج گومی – واتا ژنێ هەستەوە."

- "أقسم باللە، بأني لا أفهم منك حرفا مما تقول! - سوێند بە خوا دەخۆم، یێك حەرف لە قسەکانت تێناگەم!" دایکم وتی و لە شێخی پاڕاوە تا بە عارەبی قسە بکاتو خۆیشی بە زمانی عارەبییێکی پاراو وتی – "تكلم معی باللغه العربیه، یا رجل! - بە زمانی عارەبی قسەم لەگەڵدا بکە، جوامێر؛ من عارەبی دەزانم بەڵام ئەوەی تۆ قسەی پێدەکەی غەیری ئەومیە من قورئانم خوێندووە و لە قوروان فێری عارەبی بوویمە؛ ئەوەی تۆ قسەی پێدەکەی، نا عاربییە!" دایکم بەو زمانە پاراوەی عارەبی قسەی لەگەڵ شێخ کرد کە شێخی حەپەساند!

جا شێخ ناچار شێوەزارەکەی خۆی گۆڕی و بە عارەبییێکی نیمچە ڕەوان لەو ژنە سەر سپییەی پرسی – "ماذا تریدین؟ - ژنێ، چت دەوێ؟" ئەمجارە دایکم تێگەیشت.

"أرید أن أري ولدي، الشیخ محمد، و أرجو السماح لي بارجاعة معي الي العشیرة! لن ننسي رجولتكم. – دەمەوێ کوڕەکەم، مەلا محمد، ببێنم و ئومێد دەکەم ڕێگەمان بدەی بیگەڕێنمەوە ناو هۆزەکەی خۆمان! پیاوەتییەکەت لە بیر ناکەین." دایکم پاراو و شارەزایانە، فەسیح قسەی کرد؛ واتەدەزانی لەسەردەمانی عەنتەرەوە گەڕاوەتەوە و بە ڕیزێکی بێپایانەوە قسەکانی لەگەڵ شێخ عەشیرەتەکە کرد.

"إذهبی والتقي بە؛ لا مانع، ولكن أن ترجعیةِ مَعَكِ إلي دیارِكِ، هذا غَیرُ مُمكِن! – بچۆ بیبینە، لاریمان نییە؛ بەڵام لەگەڵ خۆتدا بیبەیتەوە،

ئەمە نابێ." شێخ ئەمەی ووت و هەڵوەستەیێکی کردو دەمێك بیری لێکردەوە، پاشان هەر بە زمانەکەی خۆی، وتی – "نابێ حەمە ببەیتەوە دەبێ بیکڕیەوە؛ ئەو پیاوە بە خۆی هات و خۆی هاوێشتە ناو ئەم داوە؛ ئێمە نەمانهێناوە، ئەگەر ئێمە بمانهێنابا، دەمانکوژت، بەڵام چونکە خۆی هاتووە ئێمە نایکوژین و بۆ ئازادکردنیشی، داوای فیدیە دەکەین؛ فیدیەکە بدەن و بیبەنەوە؛ ژیان هیچی بە خۆڕایی نەبووەو نابێت." شێخ ئەم قسانەی کردو چاوەڕێی وەڵامی دایکە شەدە خان بوو.

"ڕێگەم بدە با کوڕەکەم ببینم؛ دەمەوێ بیبینم؛ پاشان قسەی خۆمم دەبێت." سەرەژنەکە وتی:

"ڕێگەی بدەن با کوڕەکەی ببینێت!" شێخ فەرمانەکەی دەرکردو لەو ناوە دەرچوو و نەما.

پاسەوانەکە هات و چادرەکەی سەر دەروازەی ڕەشماڵەکەی لادا؛ ڕووناکی لە پێش شەدە خان بەناو ڕەشماڵەکە کەوتو ژنە سەر سپییەکەش خێرا هاتە بن ڕەشماڵەکە و منی لە باوەش گرت و ئیتر خۆی بۆ نەگیرا و بوورایەوە. ئەو ژنە خزمەکارەی ئاگای لە خواردنو خواردنەوەی من بوو، بە خێرایی دایکمی لە باوەش کرد. کۆتکە ئاوەکەی بۆ منی هێنابوو بەسەر لێوی دایکمی داکردو دەستی خۆی تەڕکردو بە ڕوخساری دایکمی داهێنا و دێمکە پڕ ئاوەکەی بە پشتێنی خۆی بەستابووەوە، لێی کردەوە و بە خوڕ بەسەری دایکمی داکرد؛ ئاوەکە سارد بوو؛ دایکم لە ساردی ئاوەکە ڕاجفڵی و ئیتر زەمانێك ڕەت بوو تا دایکم بە هۆش خۆی هاتەوە!

"دایە! دایە!" بە دەنگێکی پڕ لە سۆزی کوڕێکی ئاوارەی زیندانی کراوەوە بانگی دایکمم کرد. ئەویش چاوی خۆی هەڵێنا و زەردەخەنەیێکی دایکانەی جارانی بەسەر ڕوخساریدا هات و بە گرانی دانیشتەوە و

کارەکەرەکەش لە یارمەتیدانی دایکم دریغی نەکرد. پاسەوانەکە بە پەلە هاتو سیمی دەرگای چادرەکەی لادا و هەردوو لای بە تەواوەتی هەلبڕی. وا هاتە خەیالم وەك ئەوەی دووبارە وا خەریکە لە دایك دەبمەوە و دەمژیێنێتەوە. هەندە سوپاسگوزاری ئەم دایکە بووم، خەریك بوو دابێمەوە و بنی هەردوو پێیەکانی ماچ بکەم! ئەویش دەملەقوچ مابوو، هەر تەماشای دەکردمو زمانی نەدەگەڕا تا قسەیێکم بۆ بکات! پاشان باسکەکانی هەلبڕیو منی لە باوەش گرت؛ دەبێ بەهەشت هێندەی ئەم باوەشەی دایکم خۆش بێت! نەمزانی نە جەستەی من بوو دەلەرزی نە ئەو خۆی بوو وەك نەمامی ڕووە و با دەشەکاوە! ئای لەو باوەشە پڕ لە خۆشەویستییە بێ پێچ و پەنایە! ئای، خودا، هاوار! کات پەلەی بوو تا دایکم بحەسێنێتەوە؛ ڕانەوەستا تا دایکم هەناسەیێکی قووڵی خواردەوە و دوور کەوتەوە.

سەیری ئەملا و ئەولای منی کرد تا دڵنیا بوو لە ڕاستی بابەتەکە و زانی کە خەو نییە؛ لەهەموو شتێك ورد بووەوە؛ ئەسپەکەی بینی، بەڵام بایەخی پێنەدا! ئارامی نەهات تا سندمەکەی پێی دیتم! ئینجا دانیشتەوە. دەستی لەو تۆپە ئاسنە دا کە بە زنجیرێکی پۆڵاوە نووسا بوو زنجیرەکەش هاتبوو کۆتێکی لێ توند کرابوو و کۆتەکەش توندتر سپیلکەی قاچی چەپەی لە باوەش گرتبووم. ئازادی لەناو ئەم کۆت و زنجیرەدا بڕابووەوە؛ بەشی منی لێ نەمابوو! منی بەم کۆت و زنجیرەوە دیت و بە سۆزەوە بانگی کردمووتی —

"کورە حەمە گیان! ئەی بۆ پێتنەوتم ؟ نەتهێشت پێشتر ئەمە بزانم کە لە هەڵاشی دەرچووی! ئەوە گەورە بوویت و بوویتییە پیاو! پیاوێکی مەزن! ئاخر، ڕۆڵە، ئەم قەف و زنجیرانە، لە سایەی دەوڵەتی داگیرکار، تەنیا لەمل و لە قاچی گەورە پیاوانی خاوەن قسەو میری مەزن دەکرێن!" ئەم قسانەی دایکم ناخی هەژاندم و هەستم کرد بەرگەی ئەم سندمە دەگرم و

باوەڕ هەمووو جەستەی داپۆشیم و وەك ساتێکی پێش ئێستا نەمام! دایکم هەڵوەستەیێکی کرد، ئینجا ڕووی لە سندمەکە کرد؛ دەستی لەسەر تۆپە ئاسنەکە داناو قسەی بۆ کردو پێی ووت – "ئاسنی سارد! دەزانم گەڵەك ڕەقی؛ بەڵام ئومێدمە لەگەڵ ئەو مەرد و جوامێرانەی بە دوای مافەکانی خۆیاندا دەگەڕێن و عەوداڵن بۆ دەستکەوتە ڕەواکانیان هێندە بێ بەزەیی نەبیت؛ تکات لێدەکەم! ئێسقانی ئەم جۆرە کوڕە مەردانە گەلەك نەرمە و بەرگەی ڕەقایەتی تۆ ناگرن؛ تکات لێدەکەم تۆزێك لەگەڵیاندا نەرمی بنوێنە." دایکە شەدە خان هەناسەیێکی ساردی هەڵکێشا و ڕووی خۆی لەمن کردو وتی:

"ڕۆڵە! ئەم سندمە زۆر سەختە؛ بەڵام پەندی بەهادارت پێدەڵێت؛ بەرگەی بگرەو خۆت ڕاگرە؛ لە بیرت نەچێ، تۆ خۆت ئەو پیاوەی ئەم ڕێگایەت هەڵبژارد و بە ئەوپەڕی پیاوەتییەوە سەری خۆتت بۆی هەلگرت و نەکەی لێی پەشیمان ببیەوە؛ کاری گەورە لە پیاوی گەورە دەقەومێت؛ هەرگیز نەکەی پەشیمان ببیەوە و متمانە بە هەمووو کەسێك نەکەی؛ چارەنووسی خۆشت وە بن دەستی کەس مەگرە؛ لەبیر نەچێت، ڕۆڵە، 'چەم بێ چەقەڵ نابێت،' ئافرەت بۆیێ کۆرپە تازە بووەکەی خۆی خۆش گەرەکە؛ چونکە ژانی زۆری پێ چێشتووە، تا بووە. ڕۆڵە! نەکەی لە ئەرك و ڕێبازت پەشیمان بیەوە؛ ئارام بگرە تا ئەم هەورە ڕەشە دەڕەوێتەوە و ئاسمانێکی سامالی بێگەردت لێ دەر دەکەوێت. خۆر هێشتا هەر لە ئاسمانێدا ماوە، ڕۆڵە گیان، مەلا محمدی جاف!"

دەنگی دایکم کە قسەی بۆ دەکردم، وەك ئەوە بوو لە ئاسمانەوە دێت. ئەو قسانەی کردی ڕوونیان کردەوە کە ئەم کەڵە ئافرەتە چەندە بە هێز و ورە بەرزە؛ مـن لە چاو ئازایەتی و هێزداریی ئەودا وەك گەڵایێکی بەر

ڕەشەبا بووم. دایکم فرمێسکی خۆی سڕیەوە و زەردەخەنـەیێکی نیشام دا و فەرمووی:

"دیـارە مەعـدەنی ئـەم شـێخ عنـادە وەك ناوەکـەی نییـە!" جا بـیری کردەوە چۆن باسی شێخ بکاتو وتی:

"هەوڵی لەگەڵ بدە کاشکا ئازادت دەکات! واز لـە ئەسـپەکە بێنـە؛ مـیر محمد واخەریکە سارا خان بە شوو دەدات و پەلەیەتی زوو کارەکە بکات."

ئەم قسانەی دایکم وەك قوڕقوشم بوون لە ناخ دڵم گیر بوونو هاوارم کرد —

"ئەمـە نـابێ! مـیر محمـدی جـاف چۆن ئـەم کـارە دەکـات؟! ئـاخر ئـەم ئامۆزایەم پەیمانی پێداوم، ئەسپەکەی بۆ ببەمـەوە، سـارام دەداتـێ! شـایەدمان لە نێواندا هەیە؛ ئەگەر ئەو میرە پەیمانەکەی بشکێنێت، ئـیتر لەمـە و پـاش نابێت سەیری ناو چاوانی کەسێك بکات؟؟" تا ئەم هەموو قسانەی خۆمم نـە کرد، هەڵوەستەم لێی نەکرد.

"کـوڕم! ئـەو مـیرە! میریـش سیاسـینە." دایکـم ئەمـەی ووت لەسـەر قسـەکانی خـۆی ڕۆیشـت تـا باشـتر لـە بـار و دۆزەکـە تێبگـەم و وتـی — "هـیچ سیاسـییێك نییـە کـە مـرۆڤ تـا دوایـی متمانـەی پێبکـات؛ بـە هەڵـەدا نەچـی! قیبلەنامـەی سیاسـییان بـەرەو قیبلـە نابێتـەوە، بـەڵکوو ڕوو لەبەرژەوەنـدی خۆیـان دەکـات؛ زۆر جـاران پـەیمان و دەسـتوور لـە پێنـاوی بەرژەوەنـدی فەرمانداریك دەگۆدرێت تا لەگەڵ ویست و ئارەزووی ئەو سیاسییە بڕەخسێت کە دەسـەڵاتی بەدەسـتەوەیە. دەسـەڵات، مـەلا محمـد، دووا قۆنـاغی نییـە و لـە هـەوارێك ناسـلەمێتەوە!" دایکـم ئـەو هەنـدە قسـەی کـردو هەناسـەی ساردی خۆی قووت دا، دەمی ووشك بوو و خەریك بوو لە تێنوێتیدا دەخنکا.

داوام لێـی کـرد تـا چـیتر قسـە نـەکات و شـەو لـەلای مـنو لـە بـن ڕەشماڵەکـەم بمێنێتـەوە. بـەم دووا داخوازییـەم قایـل بـوو. بـەڵام بـەوە قایـل

نـەبوو کـە کـڕ بێـت. هـەموو شـەوەکە باسـی ڕووداوەکـانی نـاو زڕگـوێزی بـۆ دەگێڕامەوە. بەیانی پاشتر، هەستا لـە خـەو و بـۆ ڕەشمـاڵی شـێخ عنـاد چـوو؛ مەبەستی بوو دانوستان و خواستی پیاوەتی پترِی لـەو شـێخەی عـارەب بکات؛ چونکە باسی پیاوەتی و جوامێری سـەربڵندی شـێخەکانیانی بیستبوو. شـەدە خانی دایکم دوو سێ سعات لەناو ئەو عارەبانـەی بـن ڕەشمـاڵی شـێخی مـاوە و دانوستانی بوو، کاشکا ئازادم بکەن، پاشان گەڕاوە و تێیگەیانـدم کـە دانوسـتان لەگەڵ ئەو پیرەمێردە عارەبانەی بن ڕەشماڵەکە، کارێکی گران و ئەسـتەم بـوو و نەیتوانی هیچیان لێ وەرگرێت! وتی – "پیاوی سەر ڕەقن! هیچ پـەیمانێکم لێیان دەست نەکەوت. زۆربەیان هەموو جۆرە ڕێکەوتنێکی مامناوەنـدییان لـە لا پەسـند نـەبوو. قایـل نـەبوون ئـازادت بکـەن تـا شـێخ سـەرانەکەت وەرنەگرێت."

ئەم قسانەی بۆ کردمو تێیگەیاندم کە دەگەڕێتـەوە زڕگـوێز تـا لەگـەڵ میری هاموشۆیێك بکات. وتی – "داوای لێدەکەم ئەو هێندە پیاوەتییە بکاتو بەلای کەمییەوە فیدیەکەت بۆ بدات و ئازادت بکات. دڵم بـەم ژنـە خانەدانـە سـووتا؛ چـۆن ئـاوا بـە ئـاگری منـەوە خەریکـە دەسـوتی! دایکـم بـۆ زڕگـوێز گـەڕاوە؛ چاوەکانی پڕیـان فرمێشـك و دڵـی پـڕ خـەم و هـزری مانـدوو بـوو. ئومێدەکەی وەك دەنکە مرواری شکەست و پەرت و بڵاو بووەوە.

که دایکم ڕۆیشت، دڵم گریا، وەك نـەمامێکم لێهات لـە ڕەگـەوە دەری بێـنن. لـەهیچ شـوێنێکی نـاو ئـەو ڕەشماڵـە نەدەحەوامـەوە. دنیـام لـێ وێـك هـاتبووەوە. کـاتێکی پـڕ ئەسـتەم و سـتەمکاری بـوو، مـن بەسـەر دڵەکـەمم هێنابوو! دڵەکەشم بەسەر منیدا هێنابوو. تریسکە ئومێدی ئازادبوونم، ئـەو تروسکەیەی چەند چرکەیێك بەر لە ئیستا دەدرەوشـایەوە، کوژاوە و نـەما! ژیـان هەنـدە ناسـاز بـوو، کاتێـك کـە کارەکەرەکـە وە بـن ڕەشمـاڵی کـەوت و هەندێك خواردنی بۆ هێنابووم، خەریك بووم بە زگبدەم.

# فتنەی کارەکەی

ئـەو ژنـە عارەبـەی خـواردنو ئـاوی خواردنـەوەی بـۆ دەهێنـام، نـاوی فیتنە بوو؛ شێخ عناد دەستنیشانی کردبوو تا خزمەتم بکاتو نانو ئاوم بۆ بێنێتە بن ڕەشماڵە زیندانەکەم. هەر ڕۆژ دوو جاران خواردنی بۆ دەهێنـام. لەسـەرەتادا هـەموو بـەیانییێك، دوو کـولێرەی گـەرم و قاپێـك ماسـتی مـەڕی ڕۆژێی بۆ دەهێنام. هـەرگیز نـە ماسـتی کۆن و نـە نـانی ساردی بـۆ نـەهێنام. هەنـدێك جارانیش هەسـتم دەکـرد ماسـتەکە هـی مـەڕی نـەبوو، کـە پرسـیم ماستەکە هی چی بوو، پێی وتم کە هی ووشتر بوو. ئـیتر خـۆم لێـی ڕاهێنـا و خۆش هاتە دەمم. ناوە ناوەش، خانمی کارەکەر شلەی نیسك یـان نۆکـاوی بـۆ دەهێنام.

ڕۆژ هـاتو شـەو چـوو؛ پەیوەنـدی نێـوان مـنی زینـدانی و فیتنـەی کارەکەر پەرەی سەند؛ ئەو گـەنج و منـیش گـەنجتر بـووم. پەیوەندییەکـەمان ڕۆژ لـە ڕۆژ پـتر و پوختـەتر پـەرەی دەدا، تـا گەیشـتە ئـەو ئاسـتەی فیتنـەی کارەکـەر هەڵسوکەوتی لەبەرانبـەری منـدا گـۆڕا؛ لـە جاران باشـتر خزمـەتی دەکـردمو بـن ڕەشماڵەکـەی گسـك دەداو ژێـر ئەسپەشـی پـاك دەکـردەوە! تێڕوانینەکەی ویستێکی شێتانەی بۆ دەردەخستم؛ ئەوەتا بە چاوەکانی قوتی نـەدەدام! چـاوەکانی کتومـت دەرگـای دۆزەخ بـوون؛ فیتنـە ژنـە شـەرمنەکەی جاران نەما؛ خەرێکبوو لە ڕێگەیێك دەگەڕا هەستم بە خراپی بجوولێنێتەوە.

لە پێشتر، بە ڕێزێکی زۆرترەوە، پتر قسەی لەگەڵ دەکردم، تا ڕۆژێکیان داوای لێکردم بەرگی خۆمی پێبدەم تا بۆم بیانشوات. و منیش وتم :

"گەلەك سوپاس. بەڵام وەك خۆت دەبینی، من هیچ بەرگی دیکەم نییە تا ئەمانەت بۆ دابنێم تا بیانبەیت و بیانشۆیت. تا ئەم جلکانەم دەشۆی و وشکیان دەکەیەوە و دەیانهێنییەوە، ناتوانم بە ڕوتی لێرەدا بمێنمەوە! تکات لێدەکەم، ئەم بابەتە لە بیرکە." سوپاسیم کردو ئەویش زەردەخەنەیێکی کردو سەری خۆی دانواند و وای نیشان دا کە قسەکانی منی پەسند کردو وتی:

"ئەی خودا هاوار! یا شێخ، ئەمە یێکەم جارە بەدرێژایی ژیانم گوێم لە کەسێك ببێت کە سوپاسم بکات؛ خودا لێت ڕازی بێت! پێشتر وشەی سوپاسم نەبیستووە؛ پەیمان بێت، لەمەو دووا بە هەموو دڵ و گیان و ئەوپەڕی ماندوو نەناسی و دڵسۆزی تا لێرە بیت، من لە خزمەتت دابم."

ئەمەی ووت و کەمێك بیری کردەوە؛ من‌وامزانی بیر لە قسەکانی من دەکاتەوە کە هەرگیز پێشتر گوێی لێنەبووە کەسێك سوپاسی بکاتو من یێکەمین کەس بووم ئەوەم کرد، بەڵام لە هیکرا وتی:

"وا دەچم هەندێ جلوبەرگت بۆ دێنم، لەبەریان بکە تا ئەوانەی خۆتت بۆ دەشۆم و وشکیان دەکەمەوە و دەیانهێنمەوە." منیش دیسان سوپاسم کردەوە و ئەویش لە خۆشییان پێکەنی و لە دەری چادرەکەوە دەرچوو.

نیوەڕۆی ڕۆژی پاشتر فیتنە گەڕاوە و پڕێسکەیێکی بە بن هەنگڵیەوە بوو، هەندێك شتی تیدا شاردبوویەوە. قاپی خواردنەکەی لە پێشم داناو گرێی پڕێسکەکەی بۆم کردەوە و نیشانی دام کە چەند پارچە پۆشاکێکی خاوێنی بۆ هێنابووم. دشداشەیێکی عارەبی بۆ هێنابووم، بەرزی کردەوە تا بزانێ

درێژییەکەی بۆ من دەگونجێت یان دەبێ بیگۆڕێت. فتنە وەك هیچ ژنە عارەبێك نەبوو کە من دیتبم یان ناسیبێتم؛ ئەو ئافرەتە هەرگیز چاوی خۆی دانەنەواند کە قسەی دەگەڵ بەرانبەرەکانیدا دەکرد؛ بەڵکوو چاوی لە چاویان گیر دەکرد، زۆر جاران بینیم بەرانبەرەکەی چاوی بۆی دادەگرت. فیتنە ڕاستەوخۆ سەیری بیلبیلەی چاوەکانی دەکردو هەرگیز سەری خۆی دانەنواند. ئافەرین ژن!

"وابزانم درێژی ئەم دشداشەیە بۆ تۆ دەگونجێت." فیتنە وتی — "هەستە ئەمانەی لەبەرتدانە، فڕێیان بدە و ئەمانە بپۆشە تا زوو بچم بیانشۆم. تکایە زووبە!" فیتنە پەلەی لێدەکردم. "ڕەنگە ئەمەیان نەختێك کورت بێت بەڵام لە نەبوونی چاکترە." خەریکبوو بە نەرمە نازێکەوە قسەی لەگەڵدا دەکردمو پێی وتم:

"ئەم پۆشاکە خۆڵاوییانەت داکەنە؛ دەیانبەم دەیانشۆم و ووشکیان دەکەمەوە و بۆتیان دەهێنمەوە. ئەمە ئەرکی خۆمە و تۆش دوعای چاکم بۆ بکە!" قسەکانی کردو حریتەی پێکەنینی هات و لەبەرانبەرم ڕاوەستا. منیش داوام لێیکرد دا بچێتە دەرەوەو وتم:

"دەکرێ چەند خولەکێك بچیتە دەرەوە تا پۆشاکەکەم دەگۆڕم، ئینجا وەرەو بیانبە بیانشۆ." فیتنە بە چاوێکی پڕ لە پرشەنگ تەماشای کردمو پێکەنی و لە دەرگەی ڕەشماڵەکەوە دەرچوو و لێم بزر بوو و لە دیوی دەرەوەی ڕەشماڵەکە، بە دەنگێکی بەرزەوە وتی:

"زۆری پێناچێت کە دەزانین تاکەی دەتوانی خۆت لەمن بشاریتەوە." قسەکەی تەواو کردو لە تریقەی پێکەنینی دا. بەڵام دەنگەکە دوور نەکەوتەوە؛ دیار بوو هەر لە دەرەوەی چادرەکە چاوەڕێ بوو تا پۆشاکە دزوونەکانی بدەمێ. چەند خولەکێك تێپەڕی بوو کە پرسی کرد تا بێتەوە

ژووری و منیش لێی گەڕام و ئەویش هات و ئەم هەموو بەرگە شڕۆڵەی منی خستە بن هەنگڵی و بردی و ڕۆیشت.

حەفتەیێك پتر بوو كە بەرگەكانمی شووشتبوون‌و بە ئەوپەڕ پاك و خاوێنی هێنابووینەوە و چەند دانەیێك قەنەفلێشی لە نێوان دەقەكانی جلەكەمدا شاردبووەوە تا بۆنیان خۆش بێت. پاشتر، هەر جارێك كە دەهاتە ژووری و نان‌و ئاوی بۆ دەهێنام، هەوڵی ئەوەی دەدا سەرنجم بۆ جەستەی خۆی ڕابكێشێت و فریوم بدا. منیش لێی دابوومە لاملی و بۆم نەدەسەلماند. ئەویش نە لە هەوڵی فریودانم ماندوو دەبوو و نە لە نەچوونە بەر باری نازەكانی لێم بێزار دەبوو. هەر كەڕەتێكی بیویستبایە دەستم بگری، خۆم لێی لادەدا. لەگەڵ ئەمەشدا، ناچار بووم بێزاری نەكەم و نێلم لێم ئومێد بڕاو بێت؛ نەكا زمانێكی خراپم لێبدا و ئەو بەدەوییانە بمكوژن‌و ئابڕووم ببەن. گەلێك جاران فیتنە لێم نزیك دەكەوتەوە، هێندەی نەدەما باوەشم لێ بدات كە دەمگوت ئاگاداربە، دەستنوێژم نەشكێت! ئیتر، ئەویش لێم دوور دەكەوتەوە.

گومانم نەبوو ئەگەر ئەو ئافرەتە لێم بێئومێد ببا، دەچوو خیانەتی لێدەكردم‌و زمانی لێدەدام و درۆی بە دەویدا دەكردم‌و خودای لە بیر دەكردو دەیخستمە بەر نووكی نێزە و درێشەی ئەو بەدەوییانەی كە، وەكوو كوردان، نامووس لەلایان لەهەموو شتێك پارێزراوتر و گەورەترو بەهادار ترە. ناچار بە ڕێچكۆڵە باریكەكەی ئەودا چووم بێ ئەوەی سەری بۆ دانەوێنم؛ ئەویش لە هەوڵەكانی بە هیچ شێوەیێك نە پساوە و نە بێزاریش بوو؛ ئینجا چەشنی ئەو خواردنەی گۆڕی كە بۆی دەهێنام؛ ئەمجارە گوشتی بۆ هێنام؛ لای ئەو گرفتی من خواردن‌و خواردنەوەیە؛ هەر جارێكیش كە گۆشتی بۆ دەهێنام، وەبیری دەهێنامەوە كە ئێسقانەكان فڕێنەدەم، نەكا كەسێك بیانبینێت. بەم

داخوازییەی تێیگەیشتم کە بە نهێنی گوشت و خواردنی باشی بۆ دەهێنام؛ لە دڵی خۆمدا گوتم ڕەنگە حەرام بێت؛ نابێ گوشتەکە بخۆم. بەڵام فیتنە مکوڕ بوو کە گوشتەکە حەرام نییە و خانەوادەکەی شێخ و خودی شێخیش ئاگادار بوو کە گۆشتم بۆ دێنێ و دەبێ بخۆم. ئیتر من کەوتمە نێوان دوو ئاگرەوە؛ ئەگەر بەقسەی فیتنە نەکەم و خۆم لێی دوور بگرم ڕەنگە بە یێك قسەی، بمفەوتێنێت؛ دووەمیش ئەگەر بەقسەی بکەم دەبێ ئەم گۆشتە بخۆم کە من لە ناخرا بە حەرامم دەزانی؛ لەو دوو بابەتە فەتواییێکم بۆ خۆم دا، 'من ئێستا وا دیلم، دیلیش فەرمان و بزووتنەوەی بەدەستی خۆی نییە و ئەگەر بەقسەی دەسەڵات نەکەم ڕەنگە بکوژرێم و پاراستنی سەلامەتیش لە شەرعدا پێویستە،' جا ئەم ڕێگەیەم پەسند کردو گۆشتەکانم دەخوارد و پاشان ئێسقانەکانم لەناو ئامانەکان و لە بن پارچەکەی سەرەوەی دەمشاردەوە و ئەویش دەهات دەیبردنەوە و منیش ئومێدم دەکرد ڕۆژێك ئازاد بم و ئیتر تۆبەیێکی ڕاست لە کاری ناڕەوا بکەم.

ئێوارەیێك تازە تاریکی دەستی بە زەوی گەیشتبوو، بینیم فتنە هاتە بن ڕەشماڵەکە؛ ئەو هاتنەی ئەو جاری لە جارانی پێشووتر درەنگتر بوو. زۆر لێم هاتە پێش و داوای لێکردم لە باوەشی بکەمو گاڵتەبازی لەگەڵدا بکەم. من پێشتر تێیگەیشتبوومو بڕیارم دابوو با بکوژرێم، دەست بۆ شەرەفی ئەم تیرەیە نابەم و بەس. بەڵام لەم هەڵوێستە ناکامەی ئەمشەو پێویست بوو کارێك بکەم خۆم لە چنگی ئەو ئەهریمەنە دەرباز بکەم. جا پرسیارم لەخۆم کرد.

"ڕێگەیێکم نیشان بدە؛ بزانم چی بکەم؟" خودا شتێکی بە خەیاڵدا هێنام؛ بە یارمەتی فیتنە دەتوانم خۆم ئازاد بکەم. ئاگری ژێردەستی سووتاندمی! لەم شەوە و بەم دۆخەی ئێستام، دەبوو یان ملکەچی خواستی

ناڕەوای فیتنە ببم، یانیش ڕێبازی خێڵەکە پەیڕەو بکەم‌و شەرەفی هۆزەکە، لە پێش زەوقی ناپەسندی ئەو ژنە، بپارێزم و خودا هاریکارم بێت. شەرەف هەمیشە هێڵێکی سوور بووەو نابێت مرۆڤ بە دوای هەوەسێکی کاتی بکەوێت و ئەو هێڵە سوورە بپسێنێت. خۆ گومان لەوەدا نییە، پیاوەکانی ئەم هۆزە چەند مانگە، بە ناڕەوایی، منیان زیندانی کردووە؛ بەڵام ئەمە لە خواست و ویستی ژنێك گەورەترە! ناشێت بە هیچ شێوەیێك ویستی ژن‌و پیاوێك لە شەرەفی هۆزێك ژن‌و پیاو بە بایەختر وەربگیرێت. ناکرێت! شەرەف نیشانەیێکی گشتییە و دەبێت بپارێزرێت و نەشکێت؛ جا با فیتنە هەر ڕاوەستا بێت‌و چاوەڕێ بکات من دەستی بۆ ببەم! ناکرێت و نابێت! جا ئایەتی ٣٢م لە سورەتی الإسراء بۆی خوێندەوە کە دەڵێت – (وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَا؛ إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلًا). ئینجا وتم: "فیتنە خان، ئەمە نەبووەو ناکرێت!"

فیتنە بێ هەڵوەستە کردن گەفی لێکردم‌و وتی:

"دەتەوێ دەستدرێژی بکەیە سەر ناموسم؟! نەفرەتی!" بە دەنگێکی بڵند ئەو قسانەی کرد.

"ئەوە چ پێژی، فیتنە؟" کە ئەمەم ووت وەك کەسێکی وەك مار گەستووم لێهاتبوو.

"سوێند بە خودا دەخۆم، ئەگەر ئەوەی کە من دەمەوێت تۆ لەگەڵمدا نەیکەی، بە شێخی دەڵێم هەوڵی زۆرت دا تا دەستدرێژیم لێبکەی و بە خورتی منت لە باوەش گرت. شێخ باوەڕ بە من دەکات‌و قسەی تۆ بە درۆ دەزانێت؛" فیتنە زۆر بە متمانەوە قسەکانی کردو بۆی ڕاڤە کردم کە لەو جڤاکانەدا، هەمیشە پیاوان دەستدرێژی بۆ سەر ئافرەتان دەکەن‌و – "هەرگیز بەپێچەوانەوە نەبووەو نە بیستراوە. زۆر گوێمان لێدەبێت پیاوێك

پـەلاماری کچـێك دەدات و هەمیشـە قوربانییەکـە دەکـوژن‌و پیـاوان بێتـاوان دەردەچـن." لـە قسـەکانیدا فیتنـە تێکـەڵ و پێکـەڵی دەکـردو ئەوپـەڕ ئـاواتی ئەوەبوو ملکەچی ویستە نابەجێیەکەیم بکات.

"جا ئەگەر بەقسەی تۆ بێت، خۆت بە کوشـتن دەدەی، نـەك مـن!" بـە فیتنەم ووت:

"بابەتەکە لەگەڵ تۆدا، جودایە!" فیتنە بـە متمانـەوە ئەمـەی ووت – "تۆ بیانی و لێرە دیلی ئێمەی و هیچ پشتیوانییەکت نییـە و دەسـت درێـژیت کردووەتـە سـەر ئـافرەتێکی ئـەم عەشـیرەتە و ئـەویش هـاواری وەبـەر شـێخ بردووە؛ تێبگە، ئێستاکە من دەچمە دەرەوە و دەقیـژێنم و هاوار دەکـەم و بـە پاسەوانەکان دەڵێم کە تۆ ویستت من لە زەوی بدەی و ماچـم بکـەی!" فیتنـە لەگـەڵ قسـەکانیدا، چـاوەکانی وەك ژێرپیاڵـە دەترووسکانەوە و لـەم قسـانەی دیار بوو ئەو ژنە لێی بڕابوو. واقم لەو پلانـە بـاش داڕێـژراوەی ئـەو ئافرەتـە وڕما!

"دەبێ ئەم ژنە، بەر لـە ئێسـتا، کـارێکی وەك ئـەوەی خـۆی دەیخـوازێ، لەگـەڵ کەسـێکی تـری کردبێـت! بـەس خـودا دەزانـێ! هـەرگیز ئـەم چەشـنە پلاندانانە توکمەیە بە خەیاڵی کەسێکدا نـەهاتووە؛ ئـەم ژنـە یێکەمـە!" ئـەم قسانەم هاتنە خەیاڵ و وەك کەسـێکم لێهـاتبوو لـە شـەوێکی سـاردی زسـتاندا، بەفراوێکی تەزیوی پێدا بکەن. هەموو شتێکم لەم ژنە ڕەچاو دەکرد ئـەو بـێ ئابڕووییە نەبێت! بە ناچاری، کەوتمە نێو هاران و ماران!

"چۆن ئەم داوایەم لێدەکەی، لە کاتێکدا تۆ هێشتا هەر کچـی و شـووت نەکردووە؟" لە فیتنەم پرسیار کردو ئەویش گرژییـەوە و چاوەکانی ئاگریـان دەردەدا کە وایزانی لە پلانەکەی سەرکەوت‌و ئێستا دەیگلۆفێنم.

"ترست نەبێ!" وتی:

"چۆن؟ ئاخر تۆ لە پێش مندا دەکوژن!" لێیم پرسی.

"ترست نەبێ، من بێوەژنم." جەختی لە بێمێردی خۆی کردەوە و تێیگەیاندم کە پیاوەکەی لە میانی پەلامارێکی شەڕکەرانی هۆزەکەی بۆ سەر هۆزێکی دیکەی عارەبی، شەش مانگ پترە کوژراوە و "منیش ئازادم و من و تۆش لەم هەلەمان باشتر و سەلامەتتر بۆ نارەخسێت؛ جا بۆ سوودی لێوەرنەگرین؟ من تەنیا مانگێك بوو کە شووم کردبوو کاتێك کە پیاوەکەم کوژرا. ئەمە چەند مانگە چاوەڕێی هەلێکی وەك ئەمەم."

"خودایە، هاوار و ڕێگەچارەیێك!" لە دڵی خۆمەوە هاواری خودام کردو لێی بێئومێد نەبووم.

"ئەوە چ منگە منگتە؟" ژنەکە پرسی – "دەڵێی ترس قوڕگی گرتووی؟ ناوێری لە باوەشم بکەیت و سینەم بگوشیت؟" زۆر بە ڕوونی و بێ ترس خۆی بۆم هەڵدەخست و هانی دەدام ئەو خراپەکارییە بکەم.

"نا، ناترسم!" وتم ، بەڵام لە ناخڕا زەندەقم ڕژا بوو و دەبوو پاکانەیێك بۆ خۆم بکەم و هەندی کاتی لێ بدزم، بۆیێ وتم – "فیتنە! دەتوانی هەندێك ماوەم بدەیتێ؟ دەبێ خۆم ساز و ئامادە بکەم؛ ئاخر ئەوەی تۆ ووتت دەبێ بە جوانییەوە کاری بۆ بکرێ، نەك هەر ئاوا بە ڕەمەکی بۆی بچین و پەشیمان ببینەوە." لە فیتنەم خواست.

"ئەم سازدانەی بۆ چییە؟ چەند کاتت دەوێت؟" پرسی و چووە دەرەوە و نە هیچی دیکەی ووت و نە وەڵامی منیشی داوە.

دانیشتم، هزرم وەستا؛ مێشکم بۆش بوو و داما؛ دڵم وەك دەهۆڵ دەیکوتا! ئەگەر لەم دەمە دایکم لێرە دەبوو! ئەو شارەزاییەکی تەواوی لە چارەسەری هەموو گرفت و کێشەیێکدا هەبوو؛ ئەم جۆرەکێشەیەم نە هاتووەتە پێش و نە لەو کتێبانەشدا خوێندوومەتەوە کە خوێندوومن. دەمبینی، چاوم

دەیدیت، بەڵام هیچ دەسەڵاتم نەبوو! دانیشتم؛ هەستامەوە؛ لەسەر لای ڕاستم ڕاکشام؛ لەسەر لای چەپم درێژ بووم؛ کەوتمە سەر پشت و هاتمەوە سەر زگم؛ دنیام لێ بووە کونی دەرزی! دەسووڕام و دەسووڕامەوە و نەدەحەسامەوە؛ بە حەسرەت بووم سەرخەوێك بشکێنم؛ لایلایەی دایکم وەبیر هاتەوەو ئومێدم خواست بمحەسێنێتەوە؛ جا دەستم کرد لایلایە بۆ خۆم بڵێم:

"لایلایە، ڕۆڵە، بۆ خەوت نایە!
بێشکەت فێنکە، ڕووی بەرەو بایە

پەردەی لۆ دەکەم لە بۆ سەرمایە
کۆرپەی شیرینم، بۆچ خەوت نایە؟

نیوەی پەردەکەت لەسەر لادەدەم،
نەکا ئەستێرەت لێ بزر ببن، کۆرپەڵەی دایە

ڕۆڵەی شیرینم، شەو مانگەشەوە،
ئەستێرە خەوتن، هەر تۆ مایتەوە!

چاوانت داخە، بنوو، ڕۆڵە، بخەوە،
بەیانی هەر دێ؛ جووجەڵەش دێنەوە!

خەوم لێکەوت‌و تا بەیانی وە ئاگا نەهاتمەوە. بەڵام زۆر زوو گزنگی دا، ڕاستە خەوتبووم، بەڵام هێشتا هەر ماندوو بووم‌و نەمدەتوانی لەهیچ شوێنێك بحەسێمەوە، تا لە کۆتاییدا خودام وە بیر هاتەوە! ئەو خودایەی کە هەرگیز منی لە بیر نەکردووە! ئینجا بە جۆرێك حەسامەوە؛ توانیم ئەم ڕەوشەی ئێستام شی بکەمەوە کە تێیکەوتوومە! بیرم کردەوە چۆن لەم تەنگژەیە دەرباز دەبم! لەهەر شەش لامەوە گەمارۆ دراوم!

گریمان دەستلەملانێی ئەم ئافرەتە بووم‌و ئیتر ئەویش هاوس بوو! کە ژنێکی بێ مێرد لەناو ئەم عارەبە شەرەفدارانە ئاوس دەبێت‌و مێردی نەبێت، گومانی تێدا نییە، دەکوژرێت! گومانی زۆریش ئەوە کە منیش، چونکە لێرە بیانیمە، دەکوژرێم؛ ئیتر وەك دەڵێن 'ڕوو ڕەشی دنیا و قیامەت دەبم!' ئەگەر ئەم بابەتەی نێوانمان ئاشکرا ببێت، ئەویش هێشتا خراپتر! هەردووکمان بەردباران دەکرێین! ئەگەر سەرە داوێکی گومانیان لەپەیوەندی هەردووکمان پەیدا کرد، دەمانکوژن. لەهەر ڕێگەیێکەوە بۆی دەچی، سزای ئێمە کوشتن دەبێت. مێشکم بە و بیرە ئایەخ بوو و هاوار خودا م کرد —

"هاوار، ڕێگەچارەیێك!

## خواردنێکی تایبەت

بەیانی زوو بوو، فیتنە هاتەوە. چاوەکانی هێندە پڕ هەوەس و نەخەتبوون، سوور هەڵگەڕابوون! هاتە بن ڕەشماڵەکە و بە زەردەخەنەیێکی شەیتانی پڕ لە هەوەس بەیانی باشی لێکردمو وتی –

- "بەیانیت پڕ لە خۆشەویستی بێت!" ئەمەی ووت و ڕۆخی کراسی خۆی بەرز کردەوە.

- "ئای!" نرکەیێکم لێوەهات و وتم – "ماڵ کاول! ئەوە بە تەمای چی بکەی؟ ئەوەی لێم دەخوازی بۆت نابێت تا خۆم دەشۆم و ڕیشم دەتاشم." بە قسە بۆ فتنەم ڕوون کردەوە لە ڕاستیشدا ویستم ڕایبگرم و نەهێڵم پێی خوار بهاوێت.

- "هەی گێلە!" فتنە بە زەردەخەنە و نازەوە وتی – "گەرماوێکی وات بۆ دەکەم کە خودی شێخەکەشمان ئەو گەرماوەی نەبینیبیو ئیتر لچکی کراسەکەی هەڵداوەو وتی – "پێویستتە ڕیشت بتاشی و شوێنەکانی تری جەستەشت پاك بکەیتەوە. تیبگە؛ من نامەوێ کەسێك لە باوەشم بگرم کە بۆنی ناخۆش‌و جەستەشی، وەکوو تۆ، پیس بێت." ئەم پەلارانەی لێدام و تێیگەیاندم کە گوێزانێکی تیژ و تازەی بۆم هێناوە. ئینجا دەور و پشتی خاوێن کردمەوە و گسکێکی باشی لە شوێنەکە دا و دانیشت و دەستمان بە قسان کرد؛ من بەو نیازە بووم پەشیمانی بکەمەوە، ئەویش بەو تەمایەوە بوو گەرمترم بکات. لە کۆتاییدا، بۆ ئەوەی بە کاری خۆم ڕابگەم، قایل بووم

قسەکانی ئەو و خواستەکەی پەسند بکەم. هاتە سەر ئەو باوەڕە کە منیش بەڕاستی ئەو کەسە خراپەم کە ئەو بە دووایدا عەوداڵ بوو.

فیتنە بە چاوە بازەکەیەوە تەماشاییێکی کردمو دەرچووە دەرەوە، ئەو ڕۆژی چیتر نەهاتەوە. ئەو نەهاتەوە بەڵام، بۆ من، خۆرەکە فرە لەسەرخۆ ئاوا دەبوو. من لە ناخمەوە دەسووتام، داخی زیندان و ترسی ئەو ژنە، لەسەر تا ژێر، ئارامیان لێ بڕیبووم‌و ترسیش خەریکبوو دەستی لێ دەستاندم. ئێوارەی ئەو ڕۆژە، مردن لەبەر دەرگا سێرەی لێگرتبووم! بەڵام ترسم لەو مردنە نەبوو؛ چونکە بەم چەشنەی کە خۆم پاراستووە بمرم، لەبەر دەستی خودای دانەری هەموو دنیا، سەرم شۆڕ نابێت. مردنیش دووایین قۆناخی ژیانی هەموو کەسێکە و هەرگیز لە لەناوبردنی مرۆڤ، نە پاشگەز بووەتەوە و نە پاشگەزیش دەبێتەوە. بۆ منیش مردن وەك هەموو ڕووداوەکانی تری ئەم ژیانەیە؛ هەناسەیەکە لە بن ئەم ڕەشماڵەدا دەیدەم و هەڵیدەکێشم. هەرچەندە مرۆڤ بە چەندین شێوەی جودا لەناو دەچێت و ڕێبازێکی دروستی نەمان نیشان دەدا، وەك ئەوەی لە فیکری ئایینی جوولەکەدا هەیە؛ یا ڕێگەییێکی نوێی بێ ئازار و بێ چەوساندنەوەیە، وەك ئەوەی لە ئایینی کریستییانەکاندا باسکراوە؛ یانیش وەك ئەوەی لە ئایینی ئیسلامدا باس کراوە، پڕی پەری و غیلمانە و نابڕێتەوە؛ بەڵام بەهەر چۆنێك بێت، من نامەوێت لە خوارووی هەموو ئەوانەدا بم؛ دەمەوێ لەگەڵ هەموان یێکسان بم و لە خوارووی کەس نەبم و ئازاد بم!

خەم بۆ ئەو ژیانەی ئێستام ناخۆم؛ چونکە تا ئێستا هیچ سوودم لەم ژیانەم وەرنەگرتووە، بەڵام من بۆ ئایندەیێك دەگریم کە هەرگیز مسۆگەرم نەکردووە. واز بێنە، با هەر بۆ خۆم بگریم، کڕ نەبمەوە تا ئەوپەڕ ئاواتم وەدی دێنم و لەم زیندانە ئازاد دەبم، جا با ئەسپەکەش ئازاد نەکەم. ئەو

شەو نەمتوانی بخەوم؛ خەو لێم یاخی ببوو؛ شەو وەك هەموو شەوێکی پێشتر بوو؛ تاریك بوو؛ چاوەڕێ نەبووم ئەستێرەکان ببێنم؛ ئەم خێوەتە لە شەوان بۆم وەك گۆڕێکی تاریك بوو؛ جا چی؟ بە من چی؟ شەو هەر وەك ڕۆژەکە وابوو؛ بن ڕەشماڵێکی تەسك بوو؛ لێنەگەڕام ئەسپە بەستەزمانەکەشم چاوەکانی تێك بنێ! لە بێزاری خۆمدا هاوارم لێ هەستا! ئەسپەکەش حیلاندی؛ وەك ئەوە بوو گوێم لێی بێت بڵێ:

"من پشتیوانتم، لەگەڵ هەموو هەنگاوەکانت ڕەودەکەم. تۆ سەرکە و من هەڵدەکەم! ئەم سندمە بشکێنە کە ها لە قاچتە؛ بیپسێنە؛ تا نەیپسێنی من نابمە هی تۆ؛ تۆش ئازاد نابی."

خۆ باڵم نەدەویست تا بتوانم بفڕم و ئازاد بم و لەم زیندان و لەو بندەستییە دەربچم. ئەو شەوە لە شەوانی پێشتر تاریکتر بوو؛ ئەنگوست لە چاو بوو. لەسەردەمانی منداڵیمدا، زۆر جاران بە شەو چاوشلکانێمان دەکرد؛ لە چاوشارکێدا، منداڵان بە دوام دەکەوتن و مکوڕ بوون کە بمگرن. لەلایێکی تریشەوە، من خۆم ڕادەستی نەیارەکانم دەکرد، ئەگەر بمزانیبا ئەوان لەمن تیژتر ڕایاندەکرد، ئەگەریش نا، من بە هەموو توانای خۆم ڕامدەکرد تا دەگەیشتمە شارەکە و کە دەیشتمە ئەوێش، ئیتر دەمبردەوە و یارییەکە دەبووە هی من! لێرەدا، ئەم هەردوو هەڵوێستە هاوشێوە بوون، ئەگەر ئەم سندمە بێ مێشکە ڕێی نەدەگرتم؛ دەمتوانی خۆم بشارمەوە و بۆی دەربچم و نەگیرێمەوە. بەڵام ئەوەتا دیارە ئەم سندمە هەموو بارودۆخەکەی لێ گۆڕیووم! ئازادی گلداومەتەوە؛ منی بەستاوەتەوە.

پاش ماوەیێکی زۆر کە فیتنە هاتەوە، دڵنیا نەبووم ڕۆژ بوو یان شەو! ئەمجارە، هێندە لە گەڵمدا، ئاشنا و ئاشت بوو، کە وا تێگەیشتم هاتووە تا ئازادم بکاتو دەستم بگرێت و لە خێوەتگەی ئالعوبەید دەرمبکاتە دەرەوە و

سەربەست بم. بە دەنگێکی نەرمی بێهاوتای پێشتری ڕووی تێکردم و بە شێوەزارێکی پاراو وتی:

"شێخ محمد! ئەم خواردنەم بە تایبەت بۆ تۆ سازداوە." لە قسەکردنیدا دیار بوو مەرامێکی شاردراوەی هەبوو و بە قسەکانیدا چوو و وتی:

"بمبوورە سەبارەت بەوەی دوێنێ شەو ڕوویدا و هەڕەشەم لێت کرد. شێخ محمد، هەرگیز ئەوەت لە بیر نەبێت و من ڕەنگ نییە بە هیچ شێوەیێك جوامێرێکی وەك تۆ تەنگاو بکەم! بەڕاستی پەشیمانم لەهەموو ئەو هەڕەشە و گوڕەشە بێ عەقڵییەی دوێنێ لە تۆم کرد؛ تۆ گەلەك لەوە مەزنتری من بتوانم زوێرت بکەم؛ ئاخر تۆ، محمدی خۆشەویست، لە دڵی مندا دەژی و من شەیدای قسەو ژیری تۆمە و تۆ خۆشەویستی منی؛ تێدەگەی؟ دەزانی هەستی من چییە؟" ئەم ئەرزشەی کردو دووپاتی کردەوە کە ئەو شەیدای منە و دوژمنی من نییە و نایەوێ نیگەرانم بکات.

"سوپاس، فتنە!" ئەمەم ووت و زەیم دا و زانیم کە هێشتا لە هەڵسوکەوتەکانی دوودڵ و ڕاڕایە و ناوێرێ لەمە پتر بخوازێت. نەیدەزانی هانگاوی ئایندەی چی دەبێت!

فیتنە چاوی خۆی تێبڕیم، تەماشاکردنەکەی ئاسایی نەبوو! لێوەکانی مۆرێکی تاریك بوون و تەتەڵەیان دەکرد؛ ڕوومەتەکانی سوور داگەڕا بوون؛ چەند دڵۆپێکی ئارەقە لەسەر ڕوخساری گیر ببوون؛ بە نیازەوە، نیوەی زوڵفی بەردابووەوە تا لای چەپی ڕوومەتی بپۆشێت؛ بای هەناسەی ئەم لا زولفەی بڵند و نەوی دەکرد؛ جلکەکەی هەرچەندە لۆچی کردبوو و ئوتو نەبوو، بەڵام خاوێن بوون؛ ئەمەیان یێکەمجار بوو ببێنم، گەردنی خۆی بە ملوانکەیێکی سۆتکە و پەلکە نارج ڕازاندبووەوە؛ بۆنەکەی خۆش بوو! هەر

دووك لا ئێقەی كراسەكەی لە ئاسایی پتر لێك ترازا بوونو لە جاران پتری لێ دیار بوو؛ نیوەی هەردووك مەمكە تورتەكانی، لە دەری یێخە كراوەكەیدا دیار بوون؛ ئەم خۆ هەڵخستنەی فیتنە، تووشی سەرسووڕان و داهێزرانی كردم؛ ویستی گەنجییەتی و بەربەستی ئایینی و ترسی خودا و ڕێزلێنانی بەهای خێڵەكایەتی و جڤاكی و لە دواییشدا، ویستی ئازادی خۆم، هەموویان بەربەست بوونو نەیانهێشت پێی خۆم خراپ بهاوێم.

"مەلا!" فیتنە لە ناكاوڕا وتی – "من دەتوانم ئازادت بكەم." ئەو ژنە زۆر لە قسەكانی ڕژد بوو.

"تۆ؟! چۆن؟" پرسیارێكم كردو هەوڵم دا درێژە بە قسەكردن نەدەم. ئیتر ئەویش لێم هاتە پێش تا ئەو ڕادەیەی سینگە مەیلەو ڕووتەكەی خەریكبوو لە سینگم بخشێت و ئەگەر وشیارم نەكردبایەوە، لە باوەشی دەگرتم. وتم:

"تكات لێدەكەم، لێم دوور بە!" ئەم قسەیە كردو پاشەكشەم لێی كردو دوور كەوتمەوە و ڕاوەستام.

فیتنە لە جێی خۆی مەیی و نەهاتە پێشتر؛ بەڵام تێیگەیاندم كە دێتەوە و وتی:

"هیچ گرفتی نییە، هەر چی دەكەی بیكە و چۆن خۆت دەتەوێ ئاوا لەگەڵم بجوولێوە، بەڵام وا بەجێت دێلم تا پێشنیازەكەم پەسند بكەی؛ كۆتاییت لە دەست مندایە و بڕاوە." ئەمانەی ووت و سینی خواردنەكەی لەسەر زەوی داناو وتی:

"نەكەی ئێسقانەكان بەملاو بەولادا پەرت و بڵاو بكەیەوە." دیسان ترسی وەبەر دام و ئیتر پشتی تێكردمو بە هۆی نزمی دەرگەی ڕەشماڵەكە

داهاتــەوەو بــۆ دەرەوە چــوو و کتــوپڕ ســەری خــۆی لــە کــەلێنی دەرگــەی ڕەشماڵەکە دەرهێناوە و زەردەخەنەیێکی کردو وتی:

"پەیمان بێ من خۆم ئازادت بکەم." ئیتر بزر بوو.

ئەو چێشتەی ئەمجارە هێنـابووی، لـە جاران جیـاواز بـوو. دەفرەکـە دوو جـام ماسـتی سـەر بەسـەرتوویان لەسـەر بـوو. پیاڵـە چـایەیێکی گـەرم، دوور لـە دەفرەکان لەسەر سینییەکە داندرابوو. دوو پارووی نانی گەرم لەلایێکی دیکـە لە بن دەسماڵێك شاردرابوونەوە، پڕیان پشکە گۆشت بوو. زۆری نەبرد، فیتنە هاتەوە، کۆتکێك شیری گەرم و کولێرەیێکی ناسکی هێنابوو.

"ئەو پاروواونـەی پێشـتر هێنابوویـانم، مـەیانخۆ؛ سـارد بووینـەوە." بـە خێرایی قسەکانی کردو دەفرەکەی لە پێشم داناو وتی:

"ئەمــە تازەیــە؛ مــن ئــەوانی پێشــترم بــۆیێ هێنــا تــا گۆشــت و قەیماخەکــەیان پێبشــارمەوە." بــۆی ڕاڤــە کــردمو تێیگەیانــدم لــە چــاوان دەترسێ. کە ئـەم هەڵسوکەوتەم لـەم ژنـە بینی، زانـیم ئـەو ئافرەتـە چـەندە سادەیە و چەند هزرێکی ساکاری هەیە! ژیانی خۆی و ئایندەی خێزانەکـەی و ناوی هۆزەکەشی دەخاتە سەر لوتی بەرازی، بێ ئەوەی لەوە دڵنیا بێت کە من خۆشم دەوێت! ئاخر خۆ من تا ئەم چرکەیەش هەر خۆم لێـی دوورگرتـووە و تەنانــەت یێــك ووشــەی دڵداریشــم پێــی نــەگوتووە و هــەر وەك کارەکــەرێك سەیرم کردووەو عەشیرەتیی ئەو ژنە، منیان سندم کردووە، ئەوان ئـەو ژنـەی خۆیانیان بۆ تەرخان کردوومە تا نەهێڵێت بمرم و چیتر نا! هزری خـۆمم بـە لێکدانـەوەی ئـەم مەیلە خـەریك کردبـوو! ژیـانی ڕاستـەقینەی خـۆمم لـەیاد چـووبووەوە! وا هاتــە خــەیاڵم ئــەو خواردنــەی ئــەو ژنــە بــۆی هێنــابووم، بانگهێشــتەی شــێخی ئــەو عەشــیرەتەیە کــە ســندمیان کردوومــە! شــێخ گەرەکییــەتی ڕێــزم بگرێــت! پــڕ بــەدڵی خــۆم ئــەو خواردنــەم خــوارد تــا

بەشـێوەیێك تێـر بـووم، کـە دوو مـانگ پـترە بـەو شـێوەیە خـواردنێکم نەخواردووە. ئەسپەکەشم وەك خۆم ئالیکداو قسەم بۆی کردو وتم:

"پێویسـتە ئـەم خواردنــە لەگـەڵ تـۆ پشـك بکـەم؛ چـونکە لـەم هەلۆێستەی ئێستامان و لەم شوێنەماندا، تۆ نزیکترین و دڵسۆزترین دۆستو پشتیوانی منی؛ تۆ نەبی من ئومێدم نـابی!" ئەسپەکە گوێی بـۆ ڕاگرتبـوومو خواردنەکەی قووت دەداو سەری دەلەقاندەوە، منیش هەوڵم دا بابەتەکەی بۆ ڕوون بکەمەوە و وتم:

"ئەسپە شێ! تا منو تۆ لە ژێـر ئـەم ڕەشماڵـەدا ئاخنـدرابین و لێـرەدا بژین و کۆت و زنجیر و سندممان لە قاچی گرێ درابێـت، دەبێ خواردنیشمان لە نێوان یێکتری بەش بکەینو بە تـەنیا نـەیخۆین." تـا ئـەم قسـەو پەیمانـەم بە ئەسـپەکە نـەدا، لـە خەیاڵـمدا نـەبوو کـە خۆراکی ئەسـپەکەم کـا و جۆیـە! ئیتر هەڵوەستەم لە قسـەکان کـردو نـەوێرام پـتر پێـدا بچـم نـەکا ئەسـپەکەش ڕۆژێك پێم بڵێت – (فەرموو!)

"ئـای لـەم هـزرە قەشـەنگە! ئەگـەر مـیری خـۆمـان لێـرە سـەردانییەکم بکاتو منیش فەرمووی لێبکەم تا سەری خۆی دابێنێتەوە و قەپێك لـەم کـا و جۆیەی ناوی ئەم ئاخوڕە گـیر بکـات!" ئـەم خەیاڵـە پڵاوە مێشکی گرتبـوومو نەدەڕەویەوە و هاتەوە تا لە ئەسپەکە بپرسم.

"دەبێ چ بقەومێ ئەگەر لە جەنابی مـیری بخـوازم دبێـت بتـوانێ ئـەم ئالیکە بخوات؟" هەر بڵێ، بڵێ:

ئەگـەر خـواردی دەتوانێـت وەك ئەسـپەکەم هەرسـی بکـات؟ بێگومـان هــەوڵ دەدەم ئەمــەی پێبڵــێم و پاشــان چــاودێری دەکــەم تــا بــزانم چ کاردانـەوەیێکی دەبێـت! دەبـێ مـیر وەك مـرۆڤ ڕەفتـار بکـات؟ زۆر بـە گومـانم لێیان!"

پاش ئەم ئەندێشە کرش و کاڵانەم تەماشام کرد، ئەسپەکە دوو هێندەی من خواردنەکەی قووتداوە و بەهەردووکمان هەموو خواردنە چەورەکەمان خوارد. جا لەبەرە خۆمەوە وتم:

"باشە؛ خۆ چێشتەکەم بە تەنیا نەخوارد؛ ئەرێ دەبێ چ ڕوو بدات ئەگەر ئێمە بە هەمیشە لەگەڵ ئەم ئاژەڵە کەوییانە ئالیك بخۆین؟ بۆچی میر و سوارەکانی و خەڵکی هەبوو، هەر بۆ خۆشی یان بۆ چوونە ڕاو یان بۆ سەفەر یان بۆ شەڕ و کوشتار، سواری پشتی ئەم دەوارانە دەبن بەڵام هەرگیز بۆ جارێکیش بێت، دەسکیك کا و ئامانێك جۆیان لەناو ئاخوڕ لەگەڵدا ناخۆن؟ ئەمە پرسیارێکە لەهەموو ماوەکانی ژیانی هەموو مرۆڤیکدا دەبێ بکرێت!" پاش ئەم هورێنانە، ئیتر وە هۆش خۆم هاتمەوە و پرسیم:

"ئەمە چ هزرێکی چۆن بوو، ئاوا بەناو مێشکمدا ڕەتی دەدا؟" وەڵامەکەیم نەزانی و خۆیم لێی لادا.

مێشکم مەیی! نەمهێشت ئەو مێشکە لەمە دوورتر ببەزێت و وەبیرم هاتەوە کە خانمی کارەکەر خواردنێکی پڕ بە تامی بۆم هێنابوو و منیش بە تەنیا نەمخوارد؛ قسەکانی فیتنەشم وەبیر هاتنەوە، ئەوەشم لە بیر نەچوو کە ویستی تەشکم بگرێت پێش ئەوەی بڕوات؛ هیچ لەو بزووتنەوانەی بێ ئامانج نەبوون و هێمابەخش بوون. گۆڕینی چەش و ڕەفتار، بە ئاشکرا ئەوەی دەگوت کە دەیویست فریوم بدات و هەڵم بخەڵەتێنێت، نەك بچێت هەڕەشەکانی پێشتری لە دژی من کارا بکات و پیاوانی ئەم خێڵەم لێ گرڕدا.

## قسەو ئەوپەڕ ئاوات

ئەو کاتانەی لە فەقێیاتی بووم، لە زۆر مەدرسە و حوجرە و مزگەوت و گوندو باژێردا گیربوومو تێپەڕیم و گەلێك بابەتی جیاوازی زمان و فیقھ و عەقیدە و تەفسیرو بەلاغەو حەدیس و نەحو و سەرف و هیتریشم دەخوێند؛ زۆر لە هاودەرس و هاوحوجرەکانم مکوڕ بوون لەسەر ئەوەی کە مرۆڤ دەبێ بایەخ بە پەیمان و قسەکانی بدات و لەو لایەنەوە بۆی دەچوون کە ئەو کەسەی پابەندی پەیمانەکانی نابێت، نابێ ڕێزی لێبگیرێت! بەڵام پاشتر، تێگەیشتم کە خودی ڕاستی، گریبەند نییە و دوورە لێی. بۆیی تێگەیشتنی ڕاستی، ناچاری کردم کە دوا ئامانجی خۆم بگۆڕم؛ لێرەدا گەڕاندنەوەی ئەسپەکە بۆ میر محمدی جاف، سەرۆکی تیرەی تیلەکۆ، چیتر ئەوپەڕ ئامانجی من نەما.

لەگەڵ ئەمەشدا، نابێت لە بیرم بچێت پەیمانم داوە کە دەبێ ئەم ئەسپە بۆ میر ببەم؛ بەڵام ئەم زیندانە سەختە هەناسەی لێبڕیم و پشووی لێ سوارکردم؛ ناچار بووم قسەو پەیامانەکەی خۆم بگۆڕم؛ جا چی دەبێت با ببێت! بڕیارم دا شێوەی ژیانم بگۆڕم؛ لێرە و بە دوواوە لەبەرژەوەندی خۆم بترازێ، هیچ بایەخ بە خواستی ئەملا و ئەولا نادەم! بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، هەرگیز خۆپەرست نابم؛ لەهەموو کات و شوێنێکدا، قسەی چاك دەکەم، باش بیر دەکەمەوە، بە جوانیش ڕەفتار دەکەم و ئەو بنەما ئەخلاقییە باشانەی کوردەواری کە باوك باپیرانمان لە زەردەشتەوە هێناویانە و بە سۆزی

ئیسلامەتی ئاویان داوە و لە نەوەیێکەوە بۆ نەوەی پاشی خۆیانیان گواستووەتەوە، دەپارێزم. ئیتر بەس!

ڕەفتاری باش تا ئەم دەمە، بووەتە باشترین کەرستەی ئازادیم، بێی ئەوەی کەسێك ئازار بدەم. فیتنە سوود لە باڵشکاوی و لە بێدەسەڵاتی منوەردەگرێت و ئەم دوو خاڵە لاوازانەی منی بۆ بووەتە ئەسپێکی باڵدار و دەیەوێت ئامانجەکانی خۆی لە پەنای ئەوانەوە بپێکێت! دەبێ نێلم و نکوولی بکەم نەکا ببمە پردێك و ئەویش بێت پێ لە پشتم بنێت و بپەڕێتەوە و بە ئامانجە شێواوەکانی خۆی بگات! ئەمە نابێت!

کورد لە کۆنەوە دەڵێت — شەو قەڵای مەردانە؛ ئێستاش شەوە؛ منیش دەبێت مەردایەتی خۆم و پیاوەتیم لەم شەوەدا بسەلێنم؛ ئەگینا ئیتر بۆم نابێتو یان دەبێت لە گوناحدا نقوم ببم، یانیش دەبێت سەرم بەسەر دارێکەوە بکەن تا باڵندە بیخۆن! ئەم شەو لەهەموو دیرۆکی ژیانم جودایە! ئەوەتا ئامێری چاکم وا بەدەستەوەیە و دەزانم — ئە پلانانەی کە جێبەجێ ناکرێن، پلان نینە! جا با بیرۆکەکانی خۆم کۆ بکەمەوە و ڕێکیان بخەم؛ دەبێ نەهێڵم پلانەکەم دڵۆپە بکات! ئیتر بەم قسە زلانە دڵی خۆمم داوە و خۆمم قایل کرد تا دەست بە ڕەهاکردنی بکەم! ستراتیژەکەم لە پێنج هەنگاوی یێك لەپاش یێك پێکهاتبوو:

یێك — پلانەکەم بەنهێنی دەپارێزم؛ بۆ فیتنەش هەڵینادێرم؛ ئەمە ئامۆژگاری دایکم بوو.

دوو — هەستی خۆم دەمرێنم و ترس لە بیر دەکەم.

سێ — خێرا و بە وردی و بە وریایی کاردەکەم.

چوار — ئەسپەکە ئازاد دەکەم و ڕێشمەی لەملی دەکەم، دەروازی ڕەشماڵەکەی بۆ دەکەمەوە.

پێنج – لە کۆتاییدا خۆم ئازاد دەکەم!

نابێت خۆم ئازاد بکەم‌و پاشان نەتوانم زنجیرەکە لە پێی ئەسپەکە بترازێنم؛ بۆیێ دەبێ پێشان ئەسپەکە بکەمەوە. ئەگەر وا نەکەم، ئەو کات وەك جەنگاوەرێکم لێ دێت کە بە بێ شمشێر ڕوو لە مەیدانێ بکات! ئەمە هەڵەی تێدا ناکرێت کە جەنگاوەری بێ چەك شەڕ دەدۆڕێنێت!

شەو ڕاشکاو دووبەشی ڕەتبوو؛ بە شێوەیێکی گشتی، لەو دەمانە و لەو بنەگەیانەدا، کەس بە ئاگا نامێنێت و دەخەون. ئەمەش کارەکەم بە نهێنی دەپارێزێت. لە هەنگاوی یێکەمدا، گوێزانەکەم دەرهێنا؛ تیغەکە لەو تاریکییەی بن ڕاشماڵەکەش هەر تریسکەی داوە! پێدەچوو پێبکەنێت! وەی لەم ئومێدبەخشە؛ خودایە! ئومێدی ئازادبوونم هەندە گەشەی سەند، ڕێگەی نەدا ئومێدەکەم لەگەڵ ئەو ترسەدا بەراورد بکەم، کە وا پێشی لێگرتوومە! لەبەرەخۆمەوە منگاندم.

"ئەگەر ئازاد بیت، ئەوا مرۆڤی!" تەماشاییێکی ئەسپەکەم کردو زنجیرەکەیم بەسەر کردەوە. توند گرتبووی‌و بەستابوویەوە. نە لە شێوەو نە لە جۆری ئەو زنجیرەدا بوو کە منی پێ زیندانی کرابووم. کۆششم کرد ترووسکە ڕووناهیییێك بدۆزمەوە تا یارمەتیم بدات باشتر زنجیرەکە ببینم. کە نەمدۆزیەوە، ئیتر هەردووك چاوەکانی خۆمم نوقاند دەستم لە زنجیری دەستی ئەسپەکە گێڕا. تا ئەو شوێنە هاتە دەستم کە نیمچە درزێکی تێدا هەبوو؛ لەم درزەوە، زانیم کە دەتوانم ئەم ئەسپە ئازاد بکەم؛ کەسانی کوێرە، لە دیدەکان باشتر ڕێی خۆیان دەدۆزنەوە.

ئەسپەکە باوەڕی نەدەکرد کە ئەمە منم ئەم کارە دەکەم؛ بۆیێ سەری خۆی بۆ لەقاندم. پڕماندی و پاشان حیلاندی! منیش بە هەڵەداوان

چوومەوە ئەو گۆشەیەی لێی دەخەوتم. و دەستم لە ئەسپە بڵند کردو قیڕاندم.

"هێی! کڕ بە! ئەوە منم دەمەوێ میزێك بکەم!" ئەمەم ووت و ئیتر چەند خولەکێك هەستی خۆمم ڕاگرت تا بزانم لە دەرەوە چ باسە و چ هەرایە! نە کەس هات و نەکەسیش چوو؛ ئەمەش بۆ من ئۆخەی بوو؛ ئەم چادرانەی دەور و پشتم دەتووت گۆڕستانە. خێوەتگەکە هێندە کپ و بێدەنگ بوو کە دڵنیای کردمەوە دەتوانم بە ئاسانی بۆی دەربچم ئەگەر سندم و زنجیری پێی خۆمم بۆ بشکێت. ئەو زنجیرانەی دەورەی پێم، تاکە ڕێگری ئازاد بوونم بوون.

"مەرجە دەبێ خۆت لێتان ڕزگار بکەم!" بە کۆت و زنجیرەکەی پێی خۆمم ووت و دووپاتم کردەوە.

"ئەگەر ئەم شەویش بۆم نە لوێت، بێگومان سبەی هەر کاتی ئازاد بوونم دێت! هەڵوەستە لە ئازادبوونم ناکەم!" لەپاش ئەم خەیاڵانە خێرا بزوتم و چوومەوە ئەو شوێنەی پێشتر ئیشم لێی دەکرد؛ دەمویست لەبەراییێدا ئەسپەکە ئازاد بێت. ئەو هۆشمەندە بە چاکی هاریکارم بوو؛ هیچ دەنگێکی نەکردو جارێکی دیکە نەیحلاندەوە. زۆری نەبرد تا هاوڕێکەم ئازاد بوو؛ زنجیری پێیم کردەوە و جەڵەوم لەسەری کرد؛ نە زین، نە کورتان لەوێدا نەبوون!

"هاوڕێ! من هەرگیز تۆ لێرە بە تەنیا بەجێ ناهێڵم!" بە ئەسپەکەم ووت؛ پاشان زەینم لێیدا، سەیری خوارەوەی دەکردو چاوی لەمن بوو؛ دەیویست بزانێ چ دەکەم! دووبارە زنجیرەکەم لە پێی خستەوە، بەڵام توندم نەکردەوە. سەری لەقاند؛ چونکە نەیزانی چ باسە و چ هەرایە! ئەگەر زمانی هەبایە، ڕەنگبوو لێم بپرسێت و بڵێ:

"ئەرێ! ئەوە چ دەکەی؟ یێکەمجار ئازادت کردمو ئێستاکەش زنجیرم دەکەیەوە! سەیرە!" منیش پێی دەڵێم:

"گەلۆ! گوێ مەدەیێ! خۆت باش دەزانی پلانەکەی من هەرگیز بەرگەی هیچ هەڵە و چەوتییێك ناگرێت و ناکرێ خوار بڕوا، هەرچەندە ئاستەمیش بێت، نابێتو پەسند نییە." جەختم کردەوە کە ئیشەکەی خۆم باش دەزانم و هەڵەی تێدا ناکەم. پاشان هەستم کرد تەسلیم دەبم؛ ئاخر چۆن دەکرێت ئەم کۆت و زنجیرە لە قاچی خۆم بکەمەوە؟؟! ناچار بێ ئومێد مامەوە و لەسەر گازەڵەی پشتم لێی ڕاکشام و هیوا وەك ئاردی بەر با پەرت و بڵاو بووەوە و هیچم بۆ نەما!

بەڵام خۆ نابێ هەر ئاوا بم! هزرم پەکی کەوت، وەستا! کاتی ئیش بوو نەك بیرکردنەوە و قسەکردن بێت! ماوەیێکی فرە کورتم لە پێشدا هەبوو تا زنجیرەکەی پێم بپسێنم و خۆم ئازاد بکەم؛ بەڵام چۆن؟! هەستم کرد کۆتەکان هەموو لە پۆڵا، یان لە مسی بتەو بوونو تۆپێکی پێوە بوو کە کونی کلیلەکەی شەش چوکڵە بوو و کونێکیشی لە خوارەوە هەبوو. کلیلەکە لەوێوە دەنێردرایە ناو تۆپەکە تا بیکاتەوە. بێی ئەو کلیلە ئەستەم بوو بکرێتەوە؛ بەڵکو مەحاڵ بوو! جا لەبەرە خۆمەوە قسەم کردو وتم:

"ئایا دەکرێت تا بەیانی چاوەڕێ بم ئەو کات کە فیتنە هات داوای لێبکەم ئەو کلیلەم بۆ بێنێت؟" بەڵام وەڵامەکەم بە دەنگێکی بەرزەوە بۆم هاتەوەو پێی وتم:

"نا! خۆت گێل مەکە؛ ئەمە بە نهێنی ڕاگرە." ئیتر بڕیارم دا پەیوەستی ئەو ستراتیژییە بم کە لەسەرەتای پلانەکەمەوە دامڕشتبوو. ئەم کۆتەی لە پێی من بەسترا بوو، یان پێی منی بەستابووەوە، وەك ئەو زنجیرە نەبوو کە ئاسپەکەی گیر کردبوو. ئەمەی قاچی من هیچ کون و کەلێنێکی

نـەبوو شـتی تێـوە بچـێت و بیکاتـەوە. گوێزانەکـەم بـە هـەموو شـێوەیێك لەگەڵیدا بەکار هێنا؛ بەڵام لەلای ئەو نە با بوو نە باران.

"هەی نا پەسند!" قسەم بە کۆت و زنجیرەکە ووت:

"ئەمـە تـۆ بـۆ ئـەو هێنـدە ملکەچـی گەورەکـەتی؟ خـۆ ئـەو کـارێکی ناڕەوای کردووە کە منی لێرە زیندانی کردووە. مـن هیـچ کـارێکی نـەنگم لـەم دەڤـەرەدا نـەکردووە؛ مووم نەپساندووە! مـن بـە ئاشـکرا و راستو ڕەوان لـە شێخم خواست ئەم ئەسپە دزراوەم بداتەوە و ئیتر نـە ئـەو هیـچ و نـە منـیش هیـچ و کێشەکە دەبڕێتەوە و منیش بە مرازی خۆم دەگەم. ئەوە چۆن ڕاسـتە هەر کەسێك داوای مافە ڕەواکانی خـۆی بکات بـەم شـێوەیە بەنـد بکرێـت و ئازادی لێ بسەندرێتەوە؟ من ئەو مافە ڕەوایەی خۆمم نیشان کـردووە کـە دز و جەردەکانی ئەم تیرەیە لێیان دزیـووم و لـەم پەنایـەدا بەسـتوویانەتییەوە و تا ئێستاش بێ قایلمەندی خۆم ڕایانگرتووە و نامدەنەوە؛ ئایا هیـچ ڕێبـازێکی یاسایی هەیە ئەم کارە بە ڕەوا بزانێـت؟ بـە بۆچوونی خـۆم، شـتی وا نابێـتو ناکرێت؛ ناشبێت لە بیرمان بچێتەوە کە مـن زۆر لەگـەڵ ئـەم شـێخە راسـتو ڕەوانو بێ پێچ و پەنا بووم؛ باش تێمگەیاند کە من بۆ ئـەو ئەسـپە هـاتبووم تـا بیبەمـەوە؛ ئـەوان پێشـتر لـە گوندەکـەی ئێمـە، ئـەم ئەسـپەیان بـە تاڵـان هێنابوو. بەڵام کە شێخەکە ئەمـەی زانـی، مـنی هێنـا، لەبەرانبـەر ئەسـپەکەم بـەم چەشـنە بەسـتایمەوە. تـا ئێسـتاش هـەر زینـدانی دەسـتی ئـەو پیـاوە بـێ دینەم.

شێخ عناد، تـۆ نموونـەی بەنـدەیێکی بێڕیـز و بـێ سـۆزی و دەسـەڵاتی ئەومت لەناو هەناوی خۆتدا نەماوە کـە بڕیـاری بـاش دەربکـەیتو ناوبـاگێکی خراپـت بـۆ خـۆت پەیـدا کـردووە؛ دەبـێ لێـی پەشـیمان ببیـەوە. ئـەم کـۆت و زنجـیرەش بـە کـوێرەیی ملکەچـی ئـەو شـێخە شـێواوەن و هـەرگیز بـە لای

چاکەوە ناچێت. ئەم خەیاڵانەم لەناو مێشکمدا نەپسانەوە تا بەیانی دا و پەیتا پەیتا پەردەی لەسەر تاریکی هەڵماڵی و بیابان، لە دەرەوەی ڕەشماڵەکە، دەرکەوتەوە.

ئێستا کاتی هاتووە و دەبێت هەرچی زووە بڕیارێک بدەم؛ ئازاد بم یان هەر ئەسیر بمێنمەوە؟ ئەوەتا من چەکەکانی خۆمم هەڵگرتووە و پلانەکەشم ڕێکخستووە و بە تەواوی ئامادەم تا ئازاد بم! بەڵام مێشکم بۆم نەدەهاتە سەر ڕێگەکە و ملی نەدەدا. هەوڵم دا هزرم ڕێک بکەمەوە؛ سەیرێکی لای خوارەوەم کردو زەینی پێی خۆمم دا. قاچێکی گەنج بوو! نەرمو شلك بوو! پڕی چالاکی و پڕ لە هیوا و ئومێد بوو؛ بەڵام ئەو ئازایەتییەی نەبوو هەنگاوێك لەم زیندانە دوور بکەوێتەوە!

باش دیار بوو کە دەیەوێ من بەو ڕەشماڵە ڕەشە و بەو تەنگژەیە ببەستێتەوە کە دەوریان لێداووم. ئەرێ دەبێت سوودی شتێك چی بێت کە توند بە شوێنێکت دەبەستێتەوە کە تۆ خۆت هەرگیز نەتویستووە یێك خولەك لە ژیانت لەوێدا بمێنییەوە؟ لێرە بیرم کردەوە و دڵنیا بووم کە تەنیا دوو بژاردەم لەبەر دەستدا هەیە!

دارێکە بەدەستمەوەیە هەردووك سەرەکەی پیسن! جا بیرم لەهەردووکیان کردەوە و لەرزم پێداهات. هیچ ڕێگەچارەیێکم نەبوو، ناچار بووم قوربانی بدەم! جا یان ئەوەتا دەبێ قاچم بە قوربانی ئازادییەکەم بکەم؛ ئەگەر نا، دەبێ خۆم ببمە قوربانی ئەم دۆخە. قاچم یان ڕوحم؟ ئەی خودایە، بە هاوارمەوە وەرە، یانیش ئازایەتییێکم پێببەخشە!

لە بیرمە، تەمەنم شەش ساڵێك دەبوو کە لەگەڵ هاوزێیەکانی خۆم ڕامان دەکرد. نەیانگەیشتمێ؛ ئەوان لەمن هەراشتر و بەزۆکتریش بوون. من تەنیا منداڵ بووم کە پێتاوم لە پێبوو؛ جا منیش ویستم وەکوو

هاوتەمەنەکانم ببەزم، پێڵاوەکانم فڕێدا و بۆی دەرچووم؛ هەندەی پێنەچوو، پەنجەی گەورەم بە بەردێك کەوت و هەڵقۆچا و خوێن لەبرینەکەم هات، ئازارەکە هێندە تیژ بوو، خۆم لەبەری نەگرت، گریام و بوورامەوە. کە هوشیار بوومەوە، بینیم نوێنەکەم هەمووی بووەتە خوێن و هەستم کرد تپلی گەورەم گڕی گرتووە و خەریکە دەسوتی. ماوەیێکی دوور و درێژی برد تا تیمار بوو. بەڵام هەرگیز لە بیرم نەچووەتەوە کە چەندە پڕ ئازار بوو! ویستم قەناعەت بە خۆم بێنم کە کارێکی نەزانییە ئەگەر قاچی خۆم ببڕمەوە؛ ئاخر ئازاری هەڵقۆچانی پەنجەم ئەوەندە گران بووبێ، دەبێ بڕینەوەی قاچێك چۆن بێت؟ بەڵام ڕەنگە ڕەنگە ئەویان تاکە ڕێگەی ئازادبوونم بێت! پاژنەکەم هاتە قسەو پێی وتم

"کورە هەی مردووت نەمرێت، ئەرێ وەڵڵا! تۆ بۆ هێندە کۆستکەوتەو بێ ئومیدی! ئەگەر هەر ئاوا بیت، دەبێ هەر ئاواش بژی و ژیانیش بە دیلی بەسەر ناچێت و ڕانابوورێت؛ بمری لەم ژیانە باشترە!" گوێم لێبوو پاژنەی چەپەم لەناو کۆت و زنجیرەکەوە دەینرکاند و هانی دەدام تا ئازادی بکەم!

"باشە دەی؛ دەبزانە چۆن و چ ڕاوێژێکم بۆ دەکەی؟" لە پاژنەی چەپی خۆمم خواست؛ چونکە ئەو بوو هۆی ئەوەی کە لەم زیندانە خەرابات و پیسەدا ببەسترێمەوە.

گوێت لێم بێت! من لە ئازارەکانت تێدەگەم. لە هەستیشت شارەزامە. تۆ شەیدای ئازادیو پێویستە بەدەستی خۆتەوە پەیدای بکەی. دەبێت ئەوەش بزانی کە ئازادی بۆ خۆی نایێت تا دەستو قاچەکانت ماچ بکاتو خۆی دەخیلت بکات تا پێی قایل بیت و وەری بگری؛ ئازادی بە ویست و ئارەزووی خۆی و بە خۆڕایی، هەرگیز نایێتە بەر دەستت. دەبێ خەبات لە پێناو ئازدی خۆت بکەی؛ چونکە تۆ خۆت هەر چوار لایەکانت بە دوژمن

گیراوە و ئەمەیش بۆ تۆ ئەستەمتر کردووە. خێرا بڕیار بدە؛ پەلە بکە و کاری بۆ بکە؛ خۆت لە داوی دوودڵی دەربکە؛ بەسیکە چیتر بیری لێ مەکەوە؛ بڕیار بدە و بڕیارەکەت ڕاپەڕێنە!" پاژنەکەم بە توند و توورەیی وشیاری کردمەوە.

بیرم لە قاچی خۆم کردەوە و ڕێگەچارەییکم بۆ هات و بە لنگی خۆمم ووت:

"پاژنە خۆشەویستەکەم! من هەرگیز دڵم نایێت و چاوم بەرایی نادات تۆ قوت بکەم. بەڵام، ناچارم، دەبێ لەم زیندانە دەربچم." ئینجا بیرم لەوە کردەوە تۆپە پۆڵایەکە هەلگرم و هاودەم لەگەڵ ئەم هەموو زنجیرەی پێی بەستراومەتەوە، سواری ئەسپەکە ببەمو بۆی دەربچم. پێشتریش ئەو کۆششەم کردبوو، بەڵام ئێستا ئەستەمتر بووە؛ چونکە زنجیرێکی دیکەیان لێی توند کردووەو ڕەوانی دەرەوەی چادرەکەی ئێمەیان کردووەو هەوڵم داوە، پێم نەکرا کە ڕایکێشمەوە.

"ئەرێ دەبێ من پیاوێکی ئەو هێندە گرانبەها بم؟" بیرم لەخۆم کردەوە و لە ناخمڕا دەنگێك وتی:

"ما بە خۆت نازانی چەندە کەسێکی گرینگی؟ تۆ لەبەر ئەمە گرینگی چونکە کڕنۆشت بۆ ئەمانە نەبردووە و شەیدای ئازادی خۆتی، ئەمەش ئەو جۆرە شێخ و مێخانە دەترسێنێت." هەستێکم لەخۆم ڕاگرت؛ سەیری پاژنە بەستەزمانەکەی خۆمم کردو وتم:

"ئای لەم پاژنە بەستەزمانەم!" ئیتر ڕاستو دروست سەیری ئەم پارچە بێچارەیەی خۆمم کردو ویستم هانی خۆ بەختکردنی بدەم، جا وتم:

"تۆ لەهەموو پارچەکانی تری جەستەی من بەهادارتر و پڕ بایەختر و بەهێزتری!" ئینجا وتم:

"دەشێی لەم بڕیارەم ببووری؟ تۆ خۆت، وەك هەموو پارچەکانی دیکەی جەستەم، دەزانی من چەندە ئێوەم خۆش گەرەکە! هەر پارچەیێکتان هەندی هەموو جەستەکەم خۆشەویستی منە.

بەڵام لێرەوە، ئەو پارچەیەی لە پێناوی ئازادی هەموو بەشەکانی دیکەی جەستەیێك خۆی بەخت دەکات، ئەویان لەهەموویان بەختەوەرتر و گەورەترو پەسندتر و بێهاوتاتر دەبێتو تا هەموو مابن، ناو و فیداکاری ئەو پارچەیە مەحاڵە، لە بیر بکەن. پاژنە گرانبەهایەکەم، تۆ بەختەوەری و ئەم گەوراتییە وەبەر تۆ کەوتووە؛ نەکەی لێی پەشیمان ببیەوە!" بەم چەشنە هانی خۆمم دا تا بوێرم ماڵی خۆم کاول بکەم، پاژنەکەم بەم گوێزانە قوت بکەمو لە جەستەی خۆمی بکەمەوە!

خۆم گەیاندە بنمیچی ڕەشماڵەکە، ئەم شوێنە تا ئەم دەمە کەسی بەسەردا ڕەت نەبووە؛ ڕەشماڵەکە لێرەڕا بڵند دەبێت.

وا بە بیرمدا هات کە ئەم پنجە خاکە پاکە و کەس پێی لەسەردا نەناوە. پارچە بەستەڵەکەکەی سەرەوەیم هەڵداوە و تا بۆم کرا خۆڵی وردم لەوێدا کۆکردەوە؛ کەستەکە زلەکان و زیخەکەی ئەو بەشەیم لادا؛ تەنیا خۆڵەکەیم هێشتەوە؛ مەندیلەکەم لەسەرم کردەوە! پارچەیێکی درێژی بەدرێژایی مەندیلەکەم لێی پچڕاند و جودام کردەوە. جێی دانیشتنی خۆمم لەسەر زەوییەکە راستو خۆش کرد. لێی دانیشتم.

تیخەکەم بەدەستمەوە گرت و خۆم گەیاندە لا دەری ڕەشماڵەکە و هێدی هێدی دەستم بە بڕینی ئەو پەتە کرد کە دەرگای ڕەشماڵەکەی پێداخرابوو. عەقالێکی عارەبی لەلای دەرەوەی دەرگەی ڕەشماڵەکە کەوتبوو؛ لەوەتی من گەیشتبوومە ناو ئەم ڕەشماڵە ئەو عەقالە لەوێ کەوتبوو؛ کەس نەبوو بایەخی پێ بدات و هەڵیبگرێتەوە؛ جا هەر لەوێدا مابوو. یێکەمجار

کە چاوم بەو عەقالە کەوت، ئەو جاری بوو کە بەدەستی کەسێکییانەوە بوو و بۆ لێدانی من بەکاری دەهێنا! دەستم بۆی برد و هێنامە ژووریّ و پێیم ووت:

"تۆ لە مێژە بۆ ئەو عارەبانە کەلك و سوودت نەماوە؛ بۆیێ فڕەدراوی و لەناو ئەو زیخ و تۆزەی بیابانیان بەجێ هێشتووی؛ من پێویستیم پێتە! هەر ئێستاکە بە کارت دێنم و سوودت دەبێت." ئەم قسانەم بۆ عەقالەکە کردو لەسەر زەوی هەڵمگرتەوە خاشاك و تۆزەکەم لەسەری داوەشاند و خۆم خزاندەوە ناو ڕەشماڵەکە و هەردووك لای دەرپیەکەیم بە یێکتر گەیاندەوە، وەك ئەوەی دەستی لێنەدرابێت.

نەمویست سەیری پاژنەکەم بکەم؛ چونکە هەر جارەکی تەماشایم دەکرد، لەرزم لێدەهات. بەڵام ناچار بووم، دەبوو لە کۆتاییدا جێیەکە ببینم و بزانم چی دەکەم؛ بۆیێ سەیریم کرد. جەستەم لە دەستی خۆم نەما، دەرچووا وەك باڵندەی سەربڕاو هەڵدەپەڕیم!

"هێی!" قومپانییەکەم هاواری لێکردەو وتی – "ئەگەر دەترسی، نەکەی من ببڕی و فرێم بدەی؛ لە جەستەی خۆتم مەکەوە و بە فیڕۆم مەدە! هەر لە زیندان بمێنەوە تا منیش لەگەڵ خۆتدا دەمرێنیت! بڕوات بە خۆت هەبێت، ئەوانی دیکە هەموویان لەبەرانبەرتدا سەر دادەنوێنن." پاژنەکە دیار بوو لەخۆم بە جەرگتر بوو؛ ئازاتر و نەترستر بوو!

"وەی گیان، گەنجە!" بە قومپانی خۆمم ووت – "بەڕاستی فرە دلگرانم؛ چونکە ناهێڵم ئەم سەفەرە لەگەڵمدا بیت و بە یێکەوە، هەردووکمان، ئازاد ببین و بچین چاومان بە سارا خان بکەوێتەوە!" دەستم گەیاندە پاژنەکەم. پاژنەی چەپەم. هەوڵم دا سندمەکە نەختێك لە پێیەکەم

بترازێنم. ئەو پاژنەیەم تاکە تەگەرە بوو کە نەیدهێشت سندمەکە لە قاچم بترازێنم و ئازاد ببم. ڕێی ئازادی لێگرتبووم.

تا توانیم هەرچی پارچە جەمانەکەم هەبوو هەموویم لەناو دەمی خۆم پەستا؛ تا نەهێڵم هاوار بکەمو نەشهێلم زمانم وەبەر ددانەکانم بکەوێت و ئەویش قوت بکەن؛ منی مەلا هەر زمانم هەیە، ئەگەر ئەویش ببڕێت، کەس نابێت تیکە نانێکم بە خێریش پێبدا. تا بۆم هات، سندمەکەم بۆ لای سپیلکی سەرەوە برد.

ئینجا لە تەنیشت سندمەکە هێلێکی بە خەیاڵی خۆمم کێشا تا لەوێڕا پاژنەکەم ببڕمەوە. لە هەوراز گۆزینگمڕا، پێیەکەم زۆر توند بەستاوە و شەتەکم دا. سندمەکەی پێی ئەسپەکەم کردەوە و ڕێشمە و قەڕاسەکەم لەملی کردو ئامادە بوو؛ ئەمجارە چاوم بە زینێك کەوت لە بن تۆپەڵە کا و قەسەڵێکی ناو ڕەشماڵەکە شاردرابووەوە. پێشتر نەمبینیی بوو! زینەکەم بڵند کردو لە پشتی ئەسپەکەم گیر کردو بەستامەوە.

هەموو کەرستەکان ساز و ئامادە بوون. ئەوجا دەمی گوێزانەکەم لەسەر ئەو هێلە دانا کە پێشتر بۆ بڕینەوەی ڕەچاوم کردبوو. چاوەڕێم کرد تا دەنگی هاوەنی شێخەکە هات، قاوەی دەکوتا، هەر دەنگەکە هات و نەهات، ئیتر من تۆپە ئاسنەکەم بەدەستمەوە گرت و سەرم بڵند کردو وتم:

"خودایە، هاوار!"

ئەو تۆپە ئاسنە گرانەم هەڵبڕیو هەتا هێز و تاقەتم تێدا بوو، بە هەموو ویستی ئازادیمەوە و بە خێراییەکی وەك بروسك هێنامە خوارەوە و بە پشتی تیخەکەم دادا و کرتەیێکی لێوەهات، وامزانی ئاسمان بەسەر سەرمدا ڕما! ژانەکە ئەوە نەبوو بەرگەی بگرم! وا هەستم دەکرد هەموو جەستەم پارچە بوو! هۆش لەسەرمدا نەما!

هەر ئەو کوتکە بوو پاژنەکەی پەڕاندم و خوێن گوڕەی کردو هات! منیش غیرەتم وەبەر خۆم دا و ئەو خۆڵە پاکە وردەی پێشتر کۆم کردبووەوە، لەسەر برینەکەم پرژاند. ئیتر ڕانەوەستام تا خوێنەکە قەتماخە بکات، بەڵکوو ئەو کووتاڵەی کە لەناو دەمی خۆمم دانابوو، دەرمهێنا و لەبرینەکەمم پێچاوە.

پارچەی جەمەدانییەکەم باش بوو خوێنەکەی لێ وەدەر نەکەوت، ئیتر منیش هەموو عەقالەکەم لەبرینەکە ئاڵاند تا ئەو پارچە کوتاڵانە لەیێکتری ببەستێتەوە کە پێشتر لەبرینەکەم ئاڵاندبوو. عەقالەکە بۆ من بە سوود بوو برینەکەی بە توندی بۆ پێچامەوە و چووم سواری ئەسپەکە ببم. ئەسپەکە هەندە پەلەی بوو کە بۆم زەوت نەدەبوو؛ بەڵام لە کۆتاییدا بە ناچاری ڕاوەستا تا کەوتمە سەر پشتی؛ ئیتر سەری خۆمم نزم کردەوە و لە دەری ڕەشماڵەکە دەرچوومە دەرەوە و یێکسەر چووم لە پێش ڕەشماڵەکەی شێخ عنادی و لەبەر دەمی شێخی عەشیرەت هەڵوەستەیێکم کردو بانگم کرد.

شێخ عناد!"

ئەویش سەری هەڵبڕی، منی لەسەر پشتی ئەسپە بینی، چاوی لە مۆڵەق ما و زانی کار لە کار ترازا، جا وتی:

"تەنیا ئەو هەندەم پێبڵێ، کێ خیانەتی لێ کردم؟"

"کەس خیانەتی لە تۆ نەکردووە؛ من ئەوەتا پاژنەی خۆمم قوت کردووەو سندمەکەی تۆم لە قاچم داکەلاند و سواری ئەسپەکەی خۆمم و

بۆیێش ئاگادارت دەکەمەوە، نەکا بڵێی کوردەکە ترسنۆك بوو، بە نهێنی ڕایکردا!"

"شێخ محمد! چونکە تۆ ئەو هەندە شەیدای ئازادی‌و ئەو هێندەش مەرد و پیاوی، تۆ شایستەی ئازادی‌و ئەسپەکەتی، نە خۆت ماندوو بکە و نە ئەسپەکەشت تاودە، ترست نەبی‌و خودات لەگەڵ!"

ئیتر بە نەرمی ئەسپەکەم لە ڕەشماڵی شێخی دوور خستەوە و لەناو عارەبەکان چووینە دەرەوە و ئەسپەکە سەری هەڵبڕی‌و تا هێزی هەبوو، حیلاندی و بەرەو زرگوێز هاتینەوە و ئازاد بووین!

**طاهر طيب جاف**

**مەلاکوا، بریتش کۆڵۆمبیا، کانەدا**

٢٠٢٢/٦/١٩



## ناسنامەی نووسەر

* طاهر طيب جاف، لە ( ١٩٥٢/١/٢٥ ) لەگوندی گردەسۆر، دەشتی هەولێر هاتووەتە دونیا.

* لەلای باوکی قورئان و گەلێك کتێبی دیکەی عەرەبی و ئەدەبی خوێندووە.

* لەساڵی ( ١٩٥٨ ) لە پۆلی دووی سەرەتایی، لەقوتابخانەی ( ابن المستوفی )، هەولێر وەرگیراوە.

* لەساڵی ( ١٩٦٩ )، لەخانەی مامۆستایانی سەرەتایی دەرچووە.

* لەساڵی ( ١٩٧٩ ) لەبەشی وێژەیی دەرچووە.

* لەساڵی ( ١٩٨٣ ) بڕوانامەی بەکەلۆریۆسی لەوەرگێڕان، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی موسڵ تەواو کردووە.

* لەساڵی ( ١٩٩١ ) بەهۆی زمان و نووسینەکانی لە تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان، هەولێر بۆماوەی دوو ساڵ سەرۆکی بەشی هەواڵ سیاسەت بووە.

* لەساڵی ( ١٩٩٤ ) وەك سەرۆکی بەشی وەرگێڕان لە رۆژنامەی ( خەبات ) لە هەولێر، کاری کردووە.

* لەساڵی ( ١٩٩٦ ) کوردستانی جێهێشتووەو هەر لەهەمان ساڵدا لەلایەن دەزگای ( UNHCR ) ، عمان، ئودرن، بە پەناهەندە ناسراوە.

* لەساڵی ( ١٩٩٦ - ١٩٩٨ ) لە عەممانی پایتەختی ئوردن سەرنووسەری بەرنامەی کوردی ڕادیۆی ( المستقبل )ی موعارەزەی عێراقی بووە.

* لەساڵی ( ١٩٩٧/١٩٩٨ ) چوار خولی کۆمپیوتەری لە { Word , Excel , PowerPoint and Email } لە عەممان – ئوردن، بەسەرکەوتوویی تەواوکردووە.

* لەساڵی ( ١٩٩٨ ) لەکەنەدا وەرگیراوەو لە ( ١٩٩٨/٨/١٣ ) گەیشتە شاری وینیپیگ، مانیتۆبا، کەنەدا.

* لەساڵی ( ٢٠٠٠ تا ٢٠٠٢ ) لەزانکۆی ( MacMaster ) لە هاملتن، ئۆنتێریۆ، کەنەدا دوو بڕوانامەی لە {Postcolonial Literature و Race Studies} وەرگرتووە.

* لەساڵی ( ٢٠٠٦ ) بڕوانامەی ماستەری لە وەرگێڕان، لەزانکۆی یۆرك، کەنەدا وەرگرتووە.

ئەم کتێبانەی لە ئینگلیسی کردۆتە کوردیو دەزگای ئاراس چاپو بڵاوی کردوونەتەوە:-

- ئوسامە، چۆن خۆی پێگەیاند، نووسینی جۆناتان ڕاندڵ، چاپی/١ و چاپی/٢.
- دە هەزارەکەی ئێکسێنەفۆن، نووسینی – مایکل کێرتس فۆرد.
- بەهەشتی باوکم، کوردستان، نووسینی – ئێرییێل سابار.
- فەرهەنگی مێژووی کورد؛ نووسینی – مایکل گەنتەر.
- کۆتایی عیراق؛ نووسینی – پیتەر گاڵبریت.

- ئەو دوو کەسەی کوردیان ئاخنییە ناو ئێراق؛ نووسنی – دێیڤد کۆرن
- گیتا نجالی، نووسینی – تاگوور.
- کوردو سیاسەتی دەرەوەی وڵاتە یەکگرتووەکان، نووسینی – ماریانا خارۆداکی.

ئەو کتێبانەی کردوویەتیە ئینگلیسی:-

- الزلزال (عارەبی)، نووسینی – نجیب الصالحي.
- من و شەقڵاوە (کوردی)، نووسینی – قادر گۆزێ.

کتێبەکانی بە ئینگلیسی نووسیون:-

- The Man Who Made it, ٢٠٢٢.
- Kurdish Language and Associated Translation Issue, ٢٠١٦.

ئەم سەربردەیە بۆ ئەوە ناگێڕمەوە تا سینگی خۆمی پێ دەربێنم و فیزی پێ لێبدەم، بەڵکو نیازم ئەوەیە، بابەتێکی مێژوویی کوردەواری بنووسمەوە و نەهێڵم لە نەوەکانی ئایندەی کوردستان بزر بێت و بفەوتێت. بەڵکو بۆ ئەوەمە کە بیخوێننەوە و وەك پەندێك لێی فێربن و ژیانیان لەپێناوی چاوچنۆکی کەسێک نەشێوێنن.
ئومێدیشمە هەم بۆ خانەوادەی حەمەی پاژنە بڕاو و هەم بۆ نەوەکانی محمد پاشای جاف ببێتە شانازی و سەرچاوەیەکی بەهاداری مێژوویی ئەم خێڵە پڕ جوامێرە و بە سەربڵندی و ژیرانە نیشانی هەموو گەلی کوردی بدات.